گابریل گارسیا مارکیز

# ژەنەراڵی سەرلێشێواو

وەرگێڕانی

گوشاد حەمە سەعید

**خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە**

● **ڕۆمان**

● **ژەنەراڵی سەرلێشێواو**

● گابریل گارسیا مارکیز

● لە فارسییەوە: گوشاد حەمە سەعید

● نەخشەسازی ناوەوە: ڕێدار جەعفەر

● بەرگ: هۆگر سدیق

● نرخ: (٤٠٠٠) دینار

● چاپی یەکەم: ٢٠١٣

● تیراژ: ١٠٠٠ دانە

● چاپخانە: موکریانی (هەولێر)

● **لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٢٧١٢) ساڵی (٢٠١٣)ی پێ دراوە.**

**زنجیرەی کتێب (٧٩٦ )**



**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com

**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

ئەلبارو مونتیس سالآنێك بە منی دەگوت کە بە نیازە باس و خواسەکانی دواگەشتی سیمۆن بۆلیوار بەناو رووباری ماگدالنادا بنووسێتەوە، وەختێك کە کتێبی (دواچەهرە) کە بەشێکی کتێبە سەرەکییەکە بوو، چاپکرا، بە بۆچوونی من شێوازی بەرز و بێگەرد و چیرۆکی سەرنجڕاکێشی لە خۆگرتبوو ، من لە ماوەیەکی زۆر کورتدا خوێندمەوە، لەگەڵ ئەو هەموو حەز و ئارەزووەش، هەر هەموو ئەم رووداوانەم لەبیرکردبوو، رووداني ئەمەش لە هەر نووسەرێك شتێکی سەیر نیە چونکە لەبیرکردن و گۆرانکاریی لە گەورەترین و گرینگترین ئارەزووشی روودەدا. دوای دوو سالآن ئەم بیرۆئارەزووە دووبارە لە من چەکەرەیان کردەوە، ئەمەش لەو کاتەدا بوو کە من مۆڵەتم لیَ وەرگرت تا لەمبارەوە کتێبێك بنووسم، هەر لەبەرئەمەش دەبیَ سوپاسێکی ئەو بکەم.

لەو سەردەمەدا رووباری ماگدالنا بۆ من لە گەورەیی و شکۆی خودی چیرۆکەکە گرینگتر بوو، ئەم رووبارەم لە منداڵیەوە دەناسی و دیتبوم. لە کەنارەکانی کاریبی ، ئەو شوێنەی کە خۆشبەختانە تێیدا لە دایکببووم، تا باژێڕی بۆگوتام، ئەو جێگەیەی کە زۆر خۆمم تێدا بە بێگانە دەزانی ، لە ڕێگەی هەمان رووبارەوە کوتاوەتەوە کاتێك کە قوتابی زانکۆ بووم، یازدە کایان بە پانایی و درێژایی ئەم رووبارەدا هاتم و چووم. بە کەشتی هەڵمی بەو ناوەدا سەفەرمکرد، میسیپیش دەکەوتە سەر رێگاوە، ئەم رووبارە هێندە ئەفسووناوی و پڕ لە نهێنی بوو کە هیچ نووسەرێك نەیدەتوانی پێیدا تێپەڕیَ و بەهەندی هەڵنەگریَ. لەلایەکی دیکە، مەسەلە مێژووییەکان هێندە بایەخیان نەبوو، چونکە هێندە بەڵگەنامە لەمەڕ گەشتەکەی بۆ لیَوارەوە لەبەردەستدا نەبوو، پیاوێك کە لە تەمەنی خۆیدا پتر لە دە هەزار نامەی نووسی. لەم رۆژانەو ئەو گەشتەی دواییدا تەنیا سیَ چوارنامەی ماوەتەوە و هیچ کەسێك لەوانەی کە لەگەڵیدا بوون هیچ نووسینێکیان لەبارەی ئەو چواردە رۆژە پڕ لە رووداوەی سەفەرەکەی دواییەوە بەجێنەهێشتووە. لەگەڵ ئەم ڕاستییەشدا لە یەکەم بەشی کتێبەکەدا ناچاربووم کە لەبارەی کەسایەتی و ژیانی بۆ لیَوارەوە دەست بە تۆژینەوە بکەم. ئەم تۆیژینەواش لیَکۆڵینەوەی دیکەی لیَ بە ئەنجام دەکەوتەوەوئەم لیَکۆڵینەوانەش منیان بۆ بەدواداگەڕانی دیکەدا راکێشا. دوو ساڵ لیَم تۆژیەوە.

ئەو بەڵگەنامانەی کەڵکیان لێوەردەگیرا زۆر و جۆراو جۆر بوون، بۆ نموونە دەتوانرێ سی و چوار بەرگی یاداشتەکانی دانیال فلۆرنیسوئالرییان بە پارچە رۆژنامەی بڕاو ناویان ببرێ، چونکە هەندێکیان زۆر ناکۆك و دژبوون.

بێئەزموونیم لەمجۆرە لێکۆڵینەوە مێژوویانەش کارەکەمیان زۆر دژوار دەکرد. تەواوکردنی ئەم کتێبەبەبێ یارمەتی کەسانێکی کە لە ماوەی ئەو سەدە و نیوەدا کە لەم مەسەلەیان کۆڵیبۆوە، لە توانابەدەر بوو، هەمان کەسان بە بەجێهێشتنی بەڵگەی زۆر کارەکەیان لەبەرمن ئاسانکردبوو، ئەگەرچی من لایەن و شێوەی، رۆمانم لەم کتێبەدا لەبیرنەکرد، بەڵام سوپاسێکی تایبەتی لە منەوە بۆ دەستەیەك لە دۆستانی کۆن و نوێ کە بۆ پرسیارەکانم گرینگ بوون وەك پرسیار لەمەڕ ئەندێشەی واقیعی بۆلیڤار لە نێو ئەو هەموو قسە ناکۆکانەو جاریواش دەبوو پرسیارەکانم بێبایەخ بوون بۆ نموونە: وەك پرسینی ژمارەی کەوشەکانی بۆلیڤار.

مێژوونووسی کۆلۆمبیایی ئی ئۆخینۆکو تیرزسیلیس، لە وەڵامی کۆمەڵێك پرسیاری مندا، کۆمەڵێك کارتی بۆ ئامادەکردم کە لەسەر رووی هەندێکیان زانیاری بە نرخ نووسرابۆوە، بۆیە کارتەکان و ئەم شێوازە یارمیدەیان دام تا هزرەکانی خۆم رێکبخەم و لێکۆڵینەوەیان لەسەر بکەم. سەرەڕای ئەمەش ئەو بە کتێبەکەی خۆی بەناوی ژیانی بۆلیڤار، کە بە یارمەتی مێژوونووس، فابیۆپۆچۆ، نووسیبوی، یارمەتیدام تا بتوانم بە ئازادی لەسەرانسەری رۆژگاری پۆلیوار ئاگەداربم. هەروەها فابیۆ پۆجۆ ئەو بەڵگەنامانەی کە لە پاریسەوە بە تەلەفۆن بۆی دەخوێندمەوە، یان بە فاکس بۆیدە ناردم گرفتەکانی منیان وەلادەنا.

هەمیشە بە تەلەفۆن دەستم بە مێژوونووسی کۆلۆمبیایی کوستاو وارگاس، مامۆستای زانکۆی مەکیسك رادەگەیشت تا مەسەلە گەورە و بچووکەکانم شیتەڵ بکات ، بەتایبەتیش لەمەڕ بیرکردنەوە سیاسییەکانی رۆژگاری بۆلیڤار. مێژوونووس بینیسیۆ مرۆ ماریتنز لە کاراکاس لە هەندێ بارەوە یارمەتی دام کە من وامدەزانی شیکردنەوەیان لە توانادا نییە. چەند مەسەلەیەکی وەك خووخدی کەسی بۆ لیڤار و زمانی زبر و ناشیرینی و چارەنووسی ئەو کەسانەی کە لەگەڵیدابوون.

هەر بە یارمەتی ئەو بوو کە دووبارە لە هەموو شتە مێژووییەکانم کۆڵییەوە خۆرخە ئەدواردریتر، باڵیۆزی پانەما لە کۆلۆمبیا، چەند جاران بە فڕۆکە سەفەری بۆ لای من کرد و سەردانیکردم تا ئەو کتێبە نایابانەی هەیبوو بۆ من بهێنێ. دۆن فرانسیسکۆ دێ ئەبریستکتا، کە خەڵکی بۆگۆتابوو، رێنووێنییەکی باشبوو لە نووسینەوەی ژیاننامەی بۆلیڤار.

سەرۆك كۆماری پێشووی بلیساریۆ بتاکۆر لە ماوەی ساڵێکدا گرفتە جۆراو جۆرەکانی منی نەهێشت و جارێکیان کە چەند بەیتە شیعرێکی بۆلیوارم بۆ خوێندەوە، بە رێنوێننی ئەو زانیم کە ئەو شیعرانە هی شاعیری ئەکوادۆری (خوزە خوئاکین ئۆلمدۆ)ن. لە یەکەم وتووێژم لەگەڵ (فرانسیکۆ پیبیدل) دا بەرچاو روونییەکی تەواوی دامیٚ کە دەبیٚ کتێبی داهاتووم چۆنچۆنی بیٚ. زمانزانی بەنێوبانگ روبۆتۆکادابید لە سیلەی لوتفەوە. مانا وردو تەواوەکانی واژەیەکی گەلیٚ زۆری کە لەو سەردەمەدا بەکارهاتبوون، بۆ پەیداکردم. جوگرافیاناسی گلادستۆن ئۆلیبا، ئەستێرەناس خۆرخە پرز دوبال لە ئەکادیمیای زانستەکانی کوبا، کات و ساتی شەوە مانگەشەوەکانی سی ساڵی سەدەی پێشوویان (دەبیٚ مەبەستی سەدەی نۆزدەهەم بیٚ) بۆ هێنامەوە دەر.

دۆستی دێرینم ئانیبال نوگرا مندوزا، لە باڵیۆزخانەی کۆڵۆمبیا لە پرتۆ پرێنس بەڵگەنامەی شەخسی بۆ لیٚواری لەگەڵ رێگەدان (بە کەڵك وەرگرتنی تەواولیٚیان)ی بۆناردم و ئەمەش لە کاتێکدا بوو کە خۆیشی لەمبارەوە خەریکی نووسین بوو، سەرەڕای ئەوە دوای نووسینی یەکەم دانە چیرۆك و ناردنی بۆ ئەو پتر لە دە هەڵەی بۆمن راستکردەوە کە بەبیٚ ئەمە، چۆنێتی و راستی ئەم رۆمانە دەکەوتە ژێر پرسیارەوە.

سەرەنجام دەبیٚ لە ئەنتۆنیۆ بۆ لیٚوار گوجانس و خەڵکانێکی دیکەی لە نێزیکی یان خزمی پاڵەوانی چیرۆکەکە سوپاسێکی گەرم بکەم، لەگەڵیاندا بچووکترین خاڵی کتێبەکەمان تاوتویٚ دەکرد و لە بچووکترین هەڵەکانیشدا پاکمان دەکردەوە بەجۆرە حەوت دانە لە کتێبەکە نووسرا: بۆ نموونە ئەو کاتە پێمانزانی کە لە دانەیەکیاندا (نیزامیەك بەر لەوەی لە دایك بیٚ، بەشداری لە جەنگدا کردووە بێوەژنێك لەگەڵ هاوسەرەکەی چووە ئەوروپا و یان بۆلێوار و سوکرە لە بۆگۆتا بە رادایی نانیان پێکەوە خوارد، لە حاڵێکدا یەکێکیان لە کاراکاس بوو و ئەویدیکەیان لە کیتۆ. ئەو لە راستکردنەوەی هەڵەکانی نووسینەوەشدا یارمەتیدام.

**گابریل گارسیا مارکیز**

**مەکسیکوسیتی تەمووزی ١٩٨٩**

# (١)

خۆزە پالاسیۆس، خزمەتکارە هەرە کۆنەکەی، ئەوی بە رووت و قووتی و بەچاوی کراوەوە بەسەر دەرماناوەکەی ناوحەوزی حەمامەکە دۆزیەوە، بۆ چرکەیەك وایهاتە بەرچاوان کە خنکاوە. خۆزە باش دەیزانی کە ئەمە یەکێك لە شێوازەکانی بیرکردنەوەی ئەوە ، بەڵام بەو حاڵەتی نەشئەوە کە بەسەر ڕووی ئاوەکەوە بوو، وەك بڵێی لەو دنیایەدا نەبوو. نەیوێرا لێی نزیك بێتەوە، تەنیا بە پێی ئەو فرمانەی کە پێی کرابوو بۆ بێدارکردنەوەی بەرلە سعات پێنج، لەسەرخۆ بانگی کرد تا بتوانن لەگەڵ خۆرکەوتن دەست بە سەفەرەکەیان بکەن، ژەنەڕاڵ لەو نەشئە ئەفسووناویە بە ئاگاهاتەوەو لە تاریك و ڕوونێك بە چاوە شینە روون و قژە پەرش و بڵاو و رەنگ سمۆرەییەکانی و بێباکییەکی پاشایانەوە پێشخزمەتەکەی بە خۆو فنجانێکی لە ئاوی گوڵ و لالەی کێویلکەو کەتیرەوە بە دەستەوە ، دیت. ژەنەڕاڵ بە بێتواناییەوە چنگەکانی لە دەسکەکانی حەمامەکەگیرکرد و بە هێزو توانایەکی ئەوتۆی کە لە لەشێکی نەخۆش و دەردەداری وا چاوەڕێ نەدەکرا، لەنێو ئاوە دەرماناوەکە هاتەدەرێ. ژەنەراڵ بە خۆزە پالاسیۆسی وت: "وەرە با بە زووترین کات بڕۆین، لێرە هیچ کەسێك ئێمەی ناوێ."

خۆزە پالاسیۆس زۆرجاران لە کاتوشوێنی جیاجیادا ئەم رستەی لەو بیستبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کە هەموو ولاغەکان لە ئاخوڕو ئەستەبلەکانو پیاوەکان بۆ سەفەر ئامادەبوون، بەڵام دووبارە نەیتوانی بەم رستەی کە ژەنەراڵ وتی باوەڕبکا، یارمەتی ژەنەراڵی دا تا بەهەرشێوەو بارێکی کە بووە خۆی وشك بکاتەوە. فنجانەگەرمەکە لەسەرما لە دەستی ژەنەراڵدا دەلەرزی. خۆزە رۆبێکی بەسەر لەشە رووتەکەی ژەنەراڵ دادا تا نەلەرزێ. ژەنەراڵ پانتۆلێکی چەرمی هەبوو کە لەو شەوانەوەی لە لیما بوو[١] بۆ کەشخەو خۆبادان لەبەریدەکرد، ئیدی

---

[١] لیما: پایتەختی پیرۆ

لەبەرینەکردبۆوە، بەڵام چەند مانگێك پێشتر، هەرکە دووبارە لەبەریکردەوە هەستی بەوەکرد کە هەر بەرەو لاوازیدەچێ، ناوقەدیشی باریکتر دەبێتەوە، لەشێکی رەنگ پەڕیوی هەبوو. سەرودەستەکانی لەبەرئەوەی لە دەرەوەبوون و لەبەرهەوادابوون رەنگی ئاسایی خۆیان لە دەستدا بوو و وەك ئەوە بوو لەناو تاوەدا سووریان کردبێتنەوە. مانگی گەلاوێژی رابردوو و چل ساڵەی تەواوکردبوو، بەڵام قژە لوولەکەی ماش و برنج ببوو ئێسقانەکانی لەبەر زوو پیربوونی لە حاڵی سروشتی خۆیان بەدەربوون، سەراپای ئەوەندە لەڕولاواز دەهاتەبەرچاوان کە بە رواڵەت واپێدەچوو نەگاتە گەلاوێژی داهاتوو.

لەگەڵ ئەم حاڵو بارەشدا، وەك بڵێی جووڵەی سەرو دەستەکانی هی لەش و لارێکی ساغ و تەندروستترن، بەبێ وەستان و بەردەوام پیاسەی دەکرد، لەناوژوورەکەدا دەهات و دەچوو، لە هەوڵی ئەوەدابوو پێی لەو شوێنانە نەنێ کە بە ئاوی چۆڕاوەی لەشی تەڕ ببوون. لە هەمان حاڵو شێوەدا نۆشاوە داغو کولێوەکەی دەستی بە پێنج جار فڕکرد. جۆشاوەکە ئەوها داغبوو کە زمانی واسووتاند وەختبوو پفکە بکا. بەڵام تا ئەو کاتەی کە زەنگی بورجی کڵێسەکەی تەنیشتیان زەنگی سعات پێنجی لێنەدا. یەك وشەیشی بەزماندا نەهات، خزمەتکارەکە وتی: "شەممە مانگی جۆزەردانی ساڵی سی، ئەو رۆژەی کەوا ئینگلیزەکان خۆئانادی ئارکۆ[1]یان کوشت، سعاتی سێی بەربەیانی باران دەباری، لەبەر تاڵی پیاڵە جۆشاوەکە ژەنەراڵ بە دەنگێکی کزەوە گوتی: "لە سعات سێی بەربەیانی سەدەی هەفتەمەوە و بە جدیەتێکەوە درێژەی بە قسەکەیداو گوتی: "گوێم لە دەنگی کەڵەشێران نەبوو."خۆزە پالاسێوس وتی: "ئێرە کەڵەشێری لێنیە."

ژەنەراڵ گوتی: "ئێرە هیچی لێنیە. ئێرە وڵاتی ناپاکانە."

لە سانتافەدبوگوتا[2] بوون کە دوو هەزار و شەش سەد مەتر لەسەرووی ئاستی دەریاوە بوو، ژووره گەورەکەی بەدیوارە بێسواخەکانیەوە لەبەر تەوژمی ساردی بادابوو کە لە درزی پەنجەرە باش دانەخراوەکانیەوە، بۆناو ژوورەکە دزەی دەکرد. ئەم بارە بۆ سەلامەتی هیچ کەسێك باش نەبوو. خۆزە پالاسێوس پیاڵە تایبەتیەکەی ئاوی ریش تاشینو جانتا مەخمەڵەسوورەکەی کە پێداویتسیو کەلوپەلی سەروڕیشی ژەنەڕالی تێدابوو، کە هەموو کەلوپەلەکانی پێوە

---

١ Juana dearco

٢ Santafede Bogota پایتەختی کولومبیا کە ئیمرۆ بە بوگوتا دەخوێندرێتەوە و ناودەبرێ.

ئاوزێرکرابوون، لەسەر بەردە مەڕمەڕیکەی مێزی کەناو ژوورەکە دانا. مۆمدانەکەی بەو مۆمەوە کە تێیدابوو لەسەر دەلاقۆکەیەکی کە لەنزیك ئاوێنەکەوە بوو، دانا، تا ژەنەراڵ بەرچاوی تەواو رووناك بێ. مەقەڵەکەی رەپێش کرد تاپێیەکانی ژەنەرال گەرم بێتەوە. دوای ئەوە چاوێیلکەچوارچێوە کانزایی و شووشە چوارگۆشەییەکەی کە هەمیشە لە باخەڵی سوخمەکەیدابوو، بە ژەنەرال دا، ژەنەرال چاوێلکەکەی لە چاوکردو بە گوێزانەکە دەستی بە ریش تاشین کرد. ئەم کارەی بە لێهاتووێیکەوە بە هەردوو دەستان . دەستی راست و چەپی دەکرد. لەبەرئەوەی بە منداڵی بەهەردوو دەستی کاریدەکرد. ئەو لەم کارەدا لێهاتوویەکی سەرسوڕهێنی دەنواند، چونکە هەر دەقەیەك پێش ئێستابوو کە نەیدەتوانی فنجانە جۆشاوەکە لەناو دەستەکانیدا بگرێ. بەڵام وا ئێستا بە پیاسە بە ناو ژوورەکەدا دەهاتو دەچوو ریشی خۆی دەتاشی. چونکە نەیدەویست خۆی لە ئاوێنەکەدا ببینێ و چاو لە چاوەکانی خۆی ببڕێ. دوای ریش تاشین مووی لووت و گوێیەکانی کورتکردەوە. ددانەکانی بە سیواکێکی ئاوریشمی دەسك کانزاییو بە وردە خەڵوز شووشت. نینۆکی دەستو پێیەکانی کرد و بە مەورەت سافی کردنو دواجار رۆبەکەی داکەندو یەك شووشە کۆڵۆنیای بەسەرخۆیدا کرد. دەستی بە شێلانی لەشی خۆیکردو ئەوەندە خۆی شێلا تا بە تەواوی ماندوو و شەکەت بوو. ئەو رۆژە سەر لە بەیانیەکەی خوە رۆژانەییەکەی بایەخدانی بە تەندروستی خۆی بە گەرم و گوڕییەکی تایبەتیەوە ئەنجامدا. لە هەوڵی ئەوەدابوو گیانی خۆی ، هەروەها لەزەت و خۆشیەکانی و گەرمی و جۆش و خرۆشەکانی بیست ساڵەی جەنگە بێ سوودو یاریەکانی هێزو دەسەڵات لە خۆی دەربکاو خۆی لێ پاك بکاتەوە.

دواکەسی کە شەوی پێشوو لەکن ئەو بوو، منوئلاسئنز بوو، ژنێکی ئازاو دلێر بوو، خەڵکی کێتۆ[1]ی ئەکوادۆر بوو، عاشقی ژەنەراڵ بوو، بەڵام ئامادە نەبوو تا لێواری قەبر بەدوای کەوێ. وەك هەمیشە کاری ئاگادارکردنەوەی ژەنەراڵی گرتبووە ئەستۆ و لە هەموو ئەو رووداوانەی کە لە دواوەی ئەودا روویاندەدا ئاگاداری دەکردەوە. ژەنەراڵ دەمێکی درێژبوو کە جگە لە منوئلاپشتی بە کەسی دیکە نەدەبەست. کۆنەشتانێکی کە هیچ نرخێکیان نەبوو جگە لەوەی پەیوەندیان بە ژەنەراڵەوە هەبوو، چەند بەرگێکی کتێبی کە حەزیلێدەکردن و دوو سندووقی پڕاوپڕ لە بەڵگەنامە و کاغەزی تایبەت بە خۆی بە مانوێلا سپاردبوو. رۆژی پێشوو لەو دەمی

١ کێتۆ: پایتەحتی ئەکوادۆر

ماڵئاوایی ڕەسمی و کورتی کە لەگەڵ منوئلادا هەیبوو پێی گوت: "زۆرم خۆشدەوێی، بەڵام ئەگەر نەهۆ قەزاوەت و ئیدراکت لە هەمیشە زێتربێ، تۆم پتر خۆشدەوێ."بەڕای مانوێلا ئەمەش پێداهەڵگوتنێ بوو وەك ئەوانیدیکەی کە لە ماوەی هەشت ساڵی ئەڤینداری و سووتانیاندا پێدا هەڵکوتبوو. لەنێو هەموو ئاشناو نزیکەکانی ژەنەرال مانوێلا تەنیا کەسێك بوو کە ژەنەراڵ بە قسەکانی باوەڕبکا. ئەمجارەیان بە ڕاستی بوو کە لێرە دەڕوا سەرەڕای ئەمەش، ئەو تەنیا کەسێك بوو کە بۆ گەڕانەوەی ژەنەراڵ بەڵگەی هەبوو.

دوای خواحافیزی دوێنێ نیازیان نەبوو کە دووبارە پێشی سەفەرەکە یەکدی ببیننەوە ، بەڵام خانەخوێ خانمی ئامالیا کە دەیویست دوا خواحافیزیەکی پەنهانی بۆ ئەوان سازبکا، ئەم دەرفەتەی ڕێکخست تاکو مانوێلا بەجلی سوار چاکیەوە لە دەرگای کادین و ئاخوڕەوە بێتە ناوەوە و بەو شێوەیش سەرسەختی ئەم کۆمەڵگا ریاکارەش ریسوا بکا، هەڵبەتە ئەم کارەی بۆ شاردنەوەی عیشقی ئەو دووانە نەبوو، لەبەرئەوەی ئەوان بە ئاشکرا ئەڤینداری یەکدی بوون ، بەڵکە تەنیا لەبەر پاراستنی ناو و شۆرەتی باشی ئەو ماڵە بوو، ژەنەراڵ زیاتر لە پێویست ترسنۆکی نیشانداوەو فەرمانی بە خۆزە پالاسیۆس دابوو کە دەرگای ساڵۆنەکانی نزیکیان لەسەر گازەرای پشت بە جێبهێڵی ئەو ساڵۆنەیش کە سەرەڕێی هاتوچۆی خزمەتکارانی ماڵەکە بوو ، هەروەها و پاسەوانەکانیش لەو ساڵۆنەدا بەیاری کاغەزەوە سەرقاڵ دەبوونو ئەم کارەیان تا قەدەرێك دوای ئەوەی کە دیدارەکە تەواو بوو، هەر درێژەپێدا. مانوێلا دووسعاتان شتێکی بۆ ژەنەرال خوێندەوە. کەمێك بەر لە ئێستای جوانتر دەهاتەبەرچاوان. دواییدا قیافەتی تەمەنی ئەوی زێتر نیشاندا. وێنەی دەریاوانان. خووی بە پایپ کێشانەوە گرتبوو و بۆنی گوڵی شاپەسندیشی لە خۆی دەدا کە زیاتر تایبەت بە عەسکەریان بوو. وەك پیاوان جلو بەرگی لەبەردەکرد و لەگەڵ سەربازان دەهات و دەچوو. بەڵام دەنگەخۆشو ناسکەکەی بۆ ئەم ئەڤینداریە زۆر لەباربوو. لەسەر کورسیەك کە هێشتاش نیشانەی چەکەکانی نایبی سەڵتەنەتی پێوەدەدیترا، دانیشتبوو لەبەرکزە ڕووناکاییەکی مۆمێك کتێبی دەخوێندەوە.

ژەنەراڵ هەر بەو شێوەی کە لەسەر گازەرای پشت لێڕاکشابوو، گوێی بۆ ڕاگرتبوو، ئەو جلو بەرگێکی کە لە ماڵەوە لەبەریدەکرد لەبەردابوو ، ڕۆبێکیشی بەخۆیدادابوو. تەنیا بە دەنگی هەناسەی دەکرا بزانرێ کە بە ئاگایە. ناوی کتێبەکە."دەنگۆو باسێکی کە لە ساڵی ١٨٢٦ لە لیمادا بڵاوبۆوە."نو ئەو کالسادیجای نووسەری پیرۆیی نووسیبووی. منوئلا وەك نمایشنامەیەك دەیخوێندەوە کە لەگەڵ شێوازی نووسەرەکە زۆر ڕێکدەهات. تا سعاتێك دواتر لەو ماڵە

خەواڵووەدا هیچ دەنگ و چرپەیەك نەدەبیسترا. جگە لە دەنگی منوئێلا کە کتێبی دەخوێندەوە. بەڵام لە پڕێکدا قاقای پێکەنینی چەند کەسێك بیسترا کە سەگەکانی ماڵەوەیشی راپەراندو ترساند ، ژەنەراڵ بەبێ ئەوەی چاوبگێڕی بە توندی چاویکردەوەو منوئێلا کتێبەی لەو لاپەرەی کە گەیشتبوویێ و بە ئەنگوستی گەورەی نیشانکرد.

منو ئێلا گوتی: "دۆست و برادەرانی ئێوەن."

ژەنەراڵ وەڵامی داوە."برادەرم نییە ئەگەر تاکو تەرایەکیش ماوبن. بەمزوانە وازم لێدەهێنن."

دیسان منوئێلا گوتی: "بەهەرحاڵ لەوێندەرێن. لەدیوی دەرێ. گیانی ئێوە دەپارێزن تاکو کەسێك دەستدرێژیتان نەکاتەسەر."

بەم پێیە ژەنەراڵ لە مەسەلەیەك ئاگادار بۆوە کە هەموو خەڵکو خوای شارەکە دەیانزانی نەك هەر یەکێك بەڵکە چەندین پلانی دەستدرێژی بەمەبەستی کوشتنی ئەو لەئارادابوو ئەمە لە کاتێکدا کە دوا دۆستان و دڵسۆزو وەفادارەکانی لە ماڵەوە پارێزگاریان لێدەکرد و هەوڵی ئەوەیاندەدا بەر لەو دەستدرێژیانە بگرن. رێگای هاتنە ناو سالۆنەکانی دەوروبەری باغی ناوەوە لەلایەن سەربازە سوارەکان و هەنگی پیادەوە پارێزگاری دەکران. ئەوان هەموویان خەڵکی ڤەنزویلابوون. هەمان ئەو سەربازانە بوون کە دەبوو لە دواییدا تاکو بەندەری کارتاخناد ئیندیاس لەگەڵیدابن، کەوا بڕیاربوو لەو بەندەرەوە بە کەشتیەك بچێتە ئەوروپا. دووکەس لەم سەربازانە حەسیرەکانیان لەناو چەقی دەرگای سەرەکی ژووری خەوتن راخستبوو تا بنوون هەر کە مانوێلا دەستی لە خوێندنەوە هەڵگرت. پاسەوانەکانی دیکە هاودەمانی سەفەرەکەی لە سالۆنەکەی تەکیەوە لەسەریاری خۆیاندا بەردەوامبوون. بەڵام بارێکی ئەوها بوو کە نەدەکرا لە هیچ شتێك دڵنیابن و بەتایبەتیش لەنێوان ئەو هەموو سەربازو عەسکەریانەی کە لە ئەسڵ و نەسەبەی جیاجیاو نادیاربوون. ژەنەراڵ بەبێ هیچ کاردانەوەیەك لەبەرانبەری ئەو دەنگ و باسە خۆشانەدا بە دەستی ئاماژەی بۆ منو ئێلا کرد کە درێژە بە خوێندنەوەی کتێبەکەبدا.

ئەوهەمیشە مەرگی وەك ترسێك لەسەر رێگای پیشەو کارەکەی خۆی قبوولکردبوو لەبیری ئەوەدانەبوو لە دەستی رابکا، لە هەر هەموو جەنگەکاندا لە پێشی پێشەوە دابوو، بەڵام تەنیا جارێکیش بریندارنەبوو. ئەو بە هۆشیارەیەکی وا دڕندانەو لە هەمان کاتدا ئەحمەقانە لەنێو ئاگری دوژمندا دەجووڵاوە کە هەتا ئەفسەرەکانیشی خۆیان بە لێکدانەوەیەکی سادەی واوە کە ژەنەراڵ خۆی بە لەش پۆڵایین و لەشکان نەهاتوو و دەزانی، قەناعەت پێهێنابوو. لە هەموو

هەوڵەکانی کە بۆ کوشتنی ئەو درابوون و کە لە هەندێ جاران تاکە هۆی رزگاربوونی ئەوە بووە کە لەناو نوێن و بالینگانی خۆیدا نەنوستبوو. بەبێ هیچ پارێزگاریەك سەری بە هەموو کون و کەلەبەرێکدا دەکرد. لە هەرجێگایەکدا هەر خواردنێکی لەبەریان دادەنا. رەتی نەدەکردەوەو دەیخوارد. بەتەنێ منوئلا دەیزانی کە ئەم بێئارەزووییەی نیشانەی نەزانی یا باوەڕنەبوون بە چارەنووسی نییە. بەڵکە دڵنیابوونی شێتانەی ژەنەراڵە لەمەی کە لەناو بالینگانی خۆیدا بێچارەو رووت و قوتو بێبەش لە دڵنەوایی و دڵدانەوەی خەڵکی دەمرێ.

ئەو شەوە بەبێ حەمامکردنێکی گەرم چوبووە ناو جێگاو ئەمە تەنیا گۆڕانکاریەکی بەرنامەی بێخەویەکەی بوو. خۆزە پالاسیۆس زۆر زوتز حەوزی حەمامەکەی پڕ لە گیا پزیشکیەکان کردبوو.

ئەم حەمام کردنە دەبووە هۆی سارێژکردنی لەش و دەرئاوێتنی بەڵغەمی سینگیو بۆکاتی پێویستی ئاوی لەشی دەپاراست. بەڵام ئەوێ شەوێ ژەنەراڵ حەمام ناکا. دوو دەنکە حەب بۆ عادەت و مودمینیە هەمیشەییەکەی قووت دەداو بەدەم لایەلایە پڕشکۆکەی لیماوە خۆی بۆ نووستن ئامادە دەکرد. لە پڕێك بەبێ هیچ هۆیەکی ئاشکرا لرخەلرخ و سیخەسیخێکی ترسناك دەیگرێ.

لرخەلرخێکی واتوند کە وەك بڵێی ئەستوندەو پایەکانی خانووەکە دەلەرزێتەوە. ئەو ئەفسەرانەی کە لە سالۆنەکەی تەکیانەوە سەرقاڵی یاری بوون لەپڕ هەست و خوستیان لێبڕا. یەکێك لەوان بەلفۆرد هینتۆن ویلسونی خەڵکی ئێرلەندا، سەرێکی لە ژووری نووستن دا تا بزانێ ئایا کارێکیان بەو هەیە یان نا و دەبینێ کە ژەنەراڵ دەمەو روو لەسەر تەخت و نوێنی خۆی درێژبووەو هێڵنجاندەدا. منو ئلا سەری ژەنەراڵی بۆناو تەشتێك شۆڕکردبۆوە. خۆزە پالاسیۆس تەنیا کەسێکی کە بەبێ لە دەرگادان بۆی هەبوو بچێتە ژووری نووستنەوە لە تەنیشت جێگای نووستنەکەوە بە ئامادەیی و پەشۆکاویەوە ئەوەندە وەستا تاکو ئەو مشەوەشیە تەواو بوو ئەو ساکە ژەنەراڵ لە حاڵێکدا کە چاوەکانی پڕ لە فرمێسك بوون. هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشاو ئاماژەی بۆ مێزی تەوالیەتەکە کرد. بەهەماڵ حاڵەوە گوتی: "ئەمە هی ئەو گوڵە ژەهرەمارانەیە."

وەك هەمیشە هۆیەکی چاوەڕواننەکراوی بۆ بەدبەختیەکانی خۆی دیتەوە. مانوێلا کە لە هەموو کەسێك باشتر ئەوی دەناسی ئاماژەی بۆ خۆزە پالاسیۆس کرد تا گوڵدانە سومبولە هیندیەکەی کە لە بەیانیەوە لەوێ ببوو و گوڵەکانی سیسو ژاکابوون، بباتەدەرەوە. دووبارە ژەنەراڵ لەسەر جێگاکەی راکشاوە و چاوەکانی داخستەوە و منو ئلاش بە ئاوازی پێشوو دەستی

به خوێندنەوەی کتێبەکەکردەوە. هەر کە دڵنیابوو ژەنەراڵ خەوی لێکەوتووە. کتێبەکەی لەسەر کۆمەدیەکە داناو ماچێکی لە تەوێڵی گەرم و تاداری ژەنەراڵ کرد و بە هێمنی بە خۆزە پالاسیۆسی وت کە سعات شەشی بەیانی بۆ دوا خواحافیزی لە کئاترو ئەسکیناس دەبێ بچێتە لای کە ئەوێ سەرەتای جادەی سەرەکی بوو بەرەو ئۆندا.

لەدواییدا رۆبەکەی لە خۆی وەرپێچاو بەسەری پەنجەی پێیەکانی لە ژوورەکە چووە دەرێ. لەو دەمەدا ژەنەراڵ چاوەکانی کردەوەو بە دەنگێکی کزەوە بە خۆزەپالاسیۆسی گوت: "بەویلسۆن بڵێ تا ماڵەوە لەگەڵی بچن."بە پێچەوانەی ویستو حەزی مانوێلا ئەم فرمانە جێبەجێکرا. ئەو وایدەزانی کە بە تەنیا زۆر باشتر دەتوانێ پارێزگاری خۆی بکا نەوەکا سەربازێکی نێزە بەدەستی لەگەڵ دابێ، خۆزە پالاسیۆس بە مۆمێکەوە تا ئاخوڕ لەگەڵ منو ئلا چوو. ئاخوڕەکە لە دەوری یەك باغچەی کە حەوزێکی بەردی تێدابوو، هەڵکەوتبوو، لەو دەمەدا یەکەمین گوڵە سونبولەکانی بەرەبەیان دەکرانەوە. باران وەستابوو با لەنێو درەختەکان گڤەگڤی نەدەهات. بەڵام یەك ئەستێرەش لە ئاسمانی ساردو تەزیودا نەدەدیترا. لە ڕێرەوەکانی ماڵەوە چەند پاسەوانێك لەسەر حەسیران راکشابوونو سەرهەنگ بەلفۆردویلسون بۆ ئارامکردنەوەیان ئاگاداریدەکردنەوەو ئاماژەی بۆ دەکردن.

خۆزەپالاسیۆس لە کاتی تێپەڕین بەبەرپەنجەرەی سالۆنی سەرەکی خانەخۆیی دیت کە قاوەی دەدا خەڵکەکە بەسەربازی و ناسەربازیانەوە. ئەم کەسانە بە خواستی خۆیان هاتبوون تا دواچرکەساتی دەرچوونی ژەنەراڵ بە بێداری لەوێ بمێننەوە و پاسەوانی بکەن.

کاتێك کە خۆزەپالاسیۆس گەڕاوە ژووری نووستن. دیتی ژەنەراڵ وڕێنەدەکا. هەندێ قسەی بێ سەروپای دەگوت کە هەمووی هەر مەبەستی ئەوە بوو بڵێ: "کەس شتێکی لێ تێنەگەیشت."دەتگوت پشکۆی ئاگرە دەسووتێ و باوبژێکی توندو بۆن ناخۆشی لێهەڵدەستاو لێبەردەبوو. رۆژی دوایی ژەنەراڵ خۆیشی نەیدەتوانی بڵێ کە ئایا لە خەودا قسەی لەگەڵ خۆی کردووە یان لە بێداریدا وڕێنەکردووە. تا بەوە دەگا نەیدەتوانی ئەو ڕووداوانە بێنێتەوە بیرەخۆی. شتێك بوو کە ژەنەراڵ ناوی لێنابوو "قەیرانەکانی سەرشێتیم"ئەم قەیرانانە وایلێهاتبوو کەسی نیگەران نەدەکرد. چونکە سەری چوار ساڵان بوو تووشی دەبوو هیچ پزیشکێك نەیوێرا بوو روونکردنەوەیەکی زانستی لە بارەی هۆیەکانی پەیدابوونی ئەم پەرێشانیانەیدا، چونکە هەمیشە رۆژی دوایی ژەنەراڵ بەلەش و هۆشێکی تازەوە لە ژێر خۆڵەمێشی ئەم قەیرانەدا سەری قیتدەکردەوە. خۆزەپالاسیۆس پەتۆیێکی تێوەرپێچا. مۆمێکی داگیرساوی لەسەر بەردە

مەڕمەڕەکەی مێزی تەوالێت و ریشتاشین داناو لە ژوورەکە وەدەرکەوت. بەڵام دەرگاکەی دانەخست تا بتوانێ لە سالۆنەکەی تەنیشتەوە ئاگای لە حاڵی ژەنەراڵ بێ. بەباشی دەیزانی کە لە کاتە زووەکانی بەربەیانیدا دووبارە دێتەوە سەر حاڵی جارانی. رەپێدەبێو خۆی لەناو ئاوی ساردی حەوزەکەی حەمام دەهاوێ تا هەر هێزوبرشتێکی کە شەوی پێشوو لە ژێر کاریگەری گەشکەوترسو مۆتەکەدا لە دەستیدابوو بۆ خۆی بگێڕێتەوە. کۆتایی رۆژێکی بەهات و بات بوو. هەفت سەدو هەشتاو نۆ سەربازی هەنگی پیادە و سوارە بە بیانگەی وەرگرتنی مانگانەی سێ مانگی دواخراو و وەرنەگیراویان ئاژاوەیان نابۆوە. بەڵام هۆبەسەرەکییەی شتێکی دیکە بوو. ئەوان زۆرترینیان ڤەنزویلایی و زۆربەیشیان لە جەنگەکانی ئازادی چوار میللەتدا بەشداریانکردبوو، بەڵام لەم هەفتانەی دواییدا خەڵکی جوێنی وایان پێدەدان نارِحەتیان دەکردن کە لە دوای ئەوەی ژەنەراڵ لە وڵات بچێتەدەر لە چارەنووسی خۆیان دەترسان. ئەم نائارامییە بە پێدانی تێشوی سەفەرو هەزار پەزوی زێر[1]لە جیاتی هەفتاهەزار پەزو کەسەربازان داوایانکردبوو، کۆتایی پێهات، دوای نیوەڕۆ هەموویان بەرەو وڵاتەکانیان جمان و منداڵ و ژنەکانیشیان بە خۆو کەلوپەلو ماڵات و وڵاخەکانیانەوە و بەدوایاندا بەرێکەوتن. هات و هاواری مرۆڤ ئەوەندە زۆر بوو کە دەنگی دەهۆل و سەنجی سەربازان بەسەریدا زاڵ نەدبوو مرۆڤ بۆ تێکدانی ریزەکانیان کاری وایان دەکرد کە بە لەشکری دوژمنیشیان نەکردبوو، وەك سەگ وەڕە وەڕیان بەدوایاندا دەناوەو سەگیان تێپەڕدەدان. تەرەقەیان بەسەردا دەتەقاندنەوە بەر لە یازدە ساڵان دوای ئەوەی سێ سەدە بەسەر سەرکەوتنی ئیسپانیادا تێدەپەڕی. نایبی سەڵتەنە دۆن خوان سامانوش هەر لەم جادەو شەقامانەوە رایکردبوو، هەڵبەتە لەبەرگی میوان لەگەڵ چەند سندووقێکی پڕاوپڕ لە پەیکەری لە زێر دارِێژراو زومورودی نەتراشراو. پەیکەری باڵندە پیرۆزەکان[2] و پەپوولەی شووشەیی بەنرخ. هەموو خەڵکی لە هەیوانو بەرهەیوانەکانیانەوە گوڵبارانیان دەکرد و لە کرۆکی دڵیانەوە بۆی دەگریان و هیوایان دەخواست دەریا ئارام بێ و سەفەرێکی بێترس بکەن.

بەبێ ئەوەی ژەنەراڵ لە ماڵەکەی خۆیدا بێتەدەرێ ماڵێکیان دابوویە ئەوەی کە وەزیری جەنگو هێزی دەریایی تێدا بوو. بە نهێنی لە گوتوبێژو دان و ستانی ئەم سەربازە ئاژاوەچیانە

---

١ ناوی ئەو باڵندە (tucan)ە

٢ پەزو : ناوی پارەیە وەك دینار، دۆلار

بەشداری دەکرد و لە کۆتاییدا بۆ ئەوەی ئاژاوەی دیکە روونەدا، فرمانی بەخۆزەلارنسیوسیلبا، باشترین راوێژکاری سیاسی و باوەڕپێکراوی خۆی دا کە تا سنووری ڤەنزویلا بەرێیان بکات. ئەو پێشوازی کەرانی کە لە ژێر هەیوانیێدا بوون نەدەدیت، بەڵام دەنگی شەیپورو تەپڵو هات و هاواری خەڵکی کە لەسەر جادەکۆببوونەوە دەبیست، بەبێ ئەوەی کە تێبگا دەڵێن چی بچووکترین بایەخی بە ئاپۆراو قەڵەباڵغیەکە نەدەداو لە هەمان کاتدا لەگەڵ فەرمانبەرەکان سەرقاڵی وەڵامدانەوەی ئەو نامانە بوو کە دواکەوتبوون.

نامەیەکیشی بۆ مەزنە دەریا سالار دون ئەندرس دسانتاکروزی سەرۆك کۆماری پۆلیڤیا نووسی و تێدا لە دەست کێشانەوەی خۆی لە دەسەڵات ئاگاداری کردبۆوە. بەڵام هیچی لەمەڕ سەفەرەکەی خۆی بۆ دەرەوە باس نەکرد. هەر کە نامەکە کۆتایی پێهات وتی: "ئیدی لە هەموو ژیانمدا یەك نامەی دیکە نانووسم."دوای ئەوە لە کاتی سەرخەوشکاندنی پاشنیوەڕۆیانی و لە حاڵێکدا کە لە تاو گەرمی تای لەشی ئارەقەی لێدەچۆڕاوە هات و هاوارێکی زۆری کە لە دوورەوە دەبیسترا، بۆ خۆی لاربۆوە و لێی کەوتە خەو. لە هیکرِا بە هۆی قلێشانەوەی دەنگی یەك تەقەوە بە حەپەساویی لە خەوراپەڕی ، رێی تێدەچوو ئەم دەنگە تەقەی خۆشی ئاژاوە چیانبێ کە پرسی... وەڵامیان داوە گوتیان جەژنە. ئەوەندە و بەس: "قوربان تەنیا جەژن و شادیە"بەڵام هیچ کەسێك، تاخۆزەپاسێوسێش زاتی نەکرد پێی بڵێ کە چ جۆرە جەژنێکە.

تەنیا کاتێك کە منوئلا لە میوانداری و دیداری شەوانەی خۆیدا رووداوەکەی بۆ ژەنەراڵ گێڕاوە، حاڵی بوو کە لایەنگرانی دوژمنانی سیاسی ئەو لە پارتە عەوام خەڵەتێنەرەکان، وەك ئەو خۆی بەمجۆرە ناوی ئەوانیدەبرد، ئەو ئاژاوەیان ناوەتەوە و ئەوانبوون کە شەقامەکاندا وەربوونو بەبێ دەستێوەردان و رێگری لەلایەن فەرمانبەران ئەوانەی دەبێ یاسا بپارێزن کەوتبوونە تەحریکی چینی پیشەوەران سەنعەتکاران، رۆژی هەینی بوو، ئەمەش خۆی پتر هۆی بێنەزمی بوو لە مەیدانی گەورەی شاردا، سەرەنجام بەرەبەری رۆژئاوابوون بارانێکی بەتاوتر لە رۆژان بە دەم برووسکەو هەورە تریشقەوە خەڵکەکەی پەرشو بڵاوکردەوە. بەڵام کار لە کارترازابوو، قوتابیانی [1]کالج سال بارتولومە بە هەڵمەتێك دادگای شاریان داگیرکردبوو و داوایاندەکرد کە ژەنەراڵ لەبەرچاوی خەڵکی بۆ دادگا رابکێشرێ. قوتابیان تابلۆیە وێنەی ئەویان بە ئەندازەی ژەنەراڵ خۆی کە کۆنە سەربازێکی لەشکری ئازادی بە رەنگی چەور

---

١ مەبەست قوتابیانی زانکۆیە

کێشابووی، شکاندو لە هەیوانی دادگادا فڕێیاندا خوارێ، پیاوانێکی سەرخۆش کۆکاگانی شەقامی ریئال و قاوەخانەکانی ئاقارو دەوروبەری شاریان، کە بە وەخت دانەخستبوو، تالآنکردو لە گۆڕەپانی گەورەیی شاردا شەمولەیەکیان بە وێنەی ژەنەراڵ پڕ لە ئاردە دارکرابوو، گوللە باران کرد، شەمولەیەك کە بۆ ناسینەوەی پێویستی بەکلاّو و قۆپچەی زێرینی هەمیشەیی نەبوو، تۆمەتی ئەو و هاندانی عەسکەریەکان بۆ یاخیبوون و هەوڵدان بوو بۆ سەندنەوەی هێزو دەسەلآت کە لە دوای دوانزە سالآن ئەنجومەنێك بە دەنگی زۆرینە لێی داگیرکردبوو. تۆمەتێکی دیکەیشی ئەمەبوو کە سەرۆکایەتی کۆماری بۆ درێژایی ژیانی داوادەکردو شازادەیەکی ئەوروپایی بە جێنیشینی خۆی هەڵبژاردبوو.

تۆمەتێکی دیکەیش وای بە دەردەخست سەفەر بۆ دەرەوە دەکا لە کاتێکدا کە راستی مەبەستی بوو سەفەر بۆ سنووری ڤەنزویلا بکا تا لەوێ بگەڕێتەوە و بە یارمەتی پیاوانی سوپا کۆدەتایەك بەرپابکا. دیوارەکان پڕبوون لە دروشمی دژی ئەو. تا بەوە دەگا کە دڵسۆزترین لایەنگرانی ژەنەراڵیش لە ماڵ و شوێنی نەناسراو خۆیان حەشاردابوو تا ئەو وەختەی کە دەنگ و هاواری ئاپۆرای خەڵکەکە کپ بۆوە رۆژنامەیەکی لایەنگری ژەنەراڵ فرانسیسکۆ دپائولا سانتاتدر، کە دوژمنی سەرەکی ژەنەراڵ بوو، بلآویکردبۆوە کە دەردە بێدەرمان و نەخۆشییە نەناسراوەکەی ئەو کە هەموو خەڵکی پێیان دەزانی و ئەو هەموو بانگ و هاوارەی ولآت بە جێهێشتن تەنیا مانۆری سیاسییە بۆ ئەوەی نەهێڵن بڕوا. سەر لە شەوێ لەگەڵ ئەوەی کەمنوئلاسئز رووداوەکانی ئەو رۆژەی بۆ ژەنەراڵ باس دەکرد، سەربازەکانی نووسراوی سەر دیواری ماڵەوەیان دەسڕیەوە، کە دروشمێکی گەورەبوو بە خەڵووز نووسرابوو و ناوەرۆکەکەی ئەوەابوو، نە ملی دەشکێنێ و نەدەمرێ، ژەنەراڵ ئاهێکی هەڵکێشاو گوتی: "دەبێ وەزعەکە زۆر خراپبێو منیش لە وەزعەکە خراپترم لەبەرئەمەی ئەم هەموو بەزمە لە دووری هەنگاوێك لە من روویداوە.

لە حاڵێکدا کە بە منیان گوتووە تەنیا جەژن و شادیەکە و منیش باوەڕم کردووە. راستییەکەی ئەمەبوو کە هەتا خۆشەویسترین و نزیك ترین دۆستانی باوەڕیان نەدەکرد کە ئەو بڕیارە دەسەلآت و ولآتیش بە جێبهێڵێ. شار زۆر بچووك بوو خەڵکی لەوە زیاتر لەشتانیان دەکۆڵیەوە بە ئاگابوون کە ئاگایان لە دوو گرفتی گەورەی ژەنەراڵ نەبێ بۆ سەفەرەکەی یەکەم گرفتی ئەمەبوو کە بە خۆ و ئەو هەموو دەست و پێوەندو پاسەوانەیەوە پارەی تەواوی لە دەستدانەبوو و دووەمیش لەبەرئەوەی کە سەرۆك کۆمار بوو نەیدەتوانی تا سالێك بەبێ مۆڵەتی تایبەتی لە ولآت بچێتەدەرێ و تا ئەو خۆیشی داواکاری بۆ ئەم مۆڵەتە پێشکەێش نەکردبوو بە

ئاشکرا فرمانی کۆکردنەوەی ناومالّو کەلوپەلی دەرکردبوو کە هەموو لایەك بەمە بزانن. بەلاّم شتاقەکەسی تا خۆزەپالاسیۆسیش، ئەم فرمانەی بە دوا ئەزموون لیّکنەدەداوە. چونکە لە وەختی دیکەدا بۆ نیشاندانی رۆیشتنەکەی کەلوپەلی تەواوی مالّیّکی کۆکردبۆوە. ئەم کارانەی هەمیشە مانۆری سیاسی بوون. راویّژکارە سەربازیەکانی هەستیان دەکرد کە ئیمسالّ نیشانەی نەخۆشییەکەی زۆر بەدەر کەوتووە. بەلاّم هەروەك بەرلەمەش زۆرجاران وا روویدابوو، رۆژیّك بەشیّوەیەکی چاوەریّنەکراو بە ورەیەکی نویّ بیّدار دەبۆوە و بە ئارەزوویّکی پتر لە پیّشوو دەستی بە ژیاندەکردەو و خۆزە پالاسیۆس کە هەمیشە لەو نزیکەوە ئەم گۆرانکاریە لە ناکاوانەی لەبەرچاودابوو، بە شیّوازی خۆی بە ژەنەرالّی دەگوت: "هەروەك گەورەی من بەبیری دادیّ، تەنیا سەروەری من خۆی دەیزانیّ."دەست لە کارکیّشانەوەی ئەو گەیشتبووە ناو گۆرانیەکانیش وەك کۆنترین رستەی کە لەو وتەیەدا کە لە کاتی قبوولّکردنی سەرۆکاتی کۆمار خویّندبوویەوە و گوتبووی "یەکەم رۆژی ئارامبوونەوەی من دوارۆژی دەسەلاّتی من دەبیّ."لە سالاّنی دواییدا چەندین جار لە کاتی جیاجیادا داوای دەست لە کارکیّشانەوەی دەکرد کە ئیدی نەدەکرا بزانریّ کە ئایا راستییە یان نا، جەنجالّ ترین شت لەوانە دوو سالّ پیّشتر روویدابوو لە شەوی بیست و پیّنجەمی ئەیلوول ئەو حەلەی کە لە هەولّیّکی کوشتنی لە ژوورەکەی خۆیدا، قورتاری بوو، ئەو شەوە شەش سعات بەبیّ جلوبەرگ لە ژیّر پردیّك کاتی بردەسەر، بۆ رۆژی دوایی کە چەند کەسیّك لە ئەندامانی ئەنجومەن چونە دیداری دیتیان کە پەتۆیّکی خووری لە خۆی وەرپیّچاوە و پیّیەکانیشی لەناو لەگەنیّك ئاوی زۆر گەرم هاویشتووە. ژەنەرالّ بیّئەندازە لاوازوتیّك قوپابۆوە، بەلاّم لەبەر (تا) نا بەلّکە لە نائومیّدی و لە هەمان کاتدا ئاگاداریکردنەوە، کە ئەم هەولّی کوشتنە لیّی ناکۆلّریّتەوە، لەگەلّ هیچ کەسیّك لیّکۆلّینەوە ناکریّ و ئەنجومەنیّکی کە بۆ سالّی نویّ دیارکراوە، دەبیّ بە خیّرایی بۆ هەلّبژاردنی سەرۆك کۆماریّکی نویّ کۆبوونەوە سازبکا.

ژەنەرالّ بەجۆرە کۆتایی پیّهیّنا: "دوای ئەم رووداوە بۆ هەتاهەتایە من کۆلّومبیا جیّدەهیّلّم."لەگەلّ ئەم قسانەشدا، لیّکۆلّینەوە ئەنجامدرا: گوناهکاران دەستگیرکران و چواردە کەسیش لەوان لە گۆرەپانی گەورەی شاردا گوللە باران کران. ئەنجومەنیّکی کە لە دووەمی مانگی گەلاویّژ دامەزرابوو، تا شانزەی مانگی دوازدە سازنەبوو، ئیدی کەس باسی دەست لەکارکیّشانەوەی نەکرد، ژەنەرالّ لەو کات و سەردەمانەدا هەرکەسیّکی دەدیت، لە بیانییەکی

گیراوەوە تا دۆستێکی یان هەتا ئەو کەسانەش کە زۆری نەدەناسین دەیووت: "بۆ هەر جێگایەکی بمنێرن دەچم."

تەنانەت دەنگۆی نەخۆشیە ترسناکەکەیشیان وەك نیشانەیەکی رۆیشتنیان قبوولْ نەدەکرا. لە هەمان کاتدا هیچ کەسێك لە نەخۆشیەکەی دوو دلْ نەبوو. لە رۆژگاری گەڕانەوەی لە جەنگەکانی باشوور هەر کەسێکی دەیدیت، سەری دەسوڕماو دەیگوت تەنیا بۆ مردن گەڕاوەتەوە. لەباتی ئەوەی سواری ئەسپەڕەسەن و ئەفسانەییەکەی بالوموبلانکۆبێ، سواری بارگیرێکی بێ تیسکی[1] کورتان گونیەدەبوو، بەسەرو قژی ئالۆزو ناوچەوانی گرژو لۆچاوی خودەیەکی پیسی بەسەرەوە و قۆڵێکی چاکەتەکەی دڕابوو، بەفەخرو شانازیەوە لەبەریکردبوو، لەو شەوەدا کە لە کۆشکێکی دەوڵەتیدا میوانداریەك سازکرابوو، بەدرێژایی شەوەکە چووبۆوە ناوخۆی و دالغە بردبوویەوە و هەرگیز کەسی تێنەگەیشت کە ئایا ئەمە تەڵەکەیەکی سیاسییە یان گوێپێنەدان و خەمساردییەکی سادەییە، بۆ نموونە کە سڵاوی لە هەر وەزیرێك دەکرد بەناوی وەزیرێکی دیکەوە بانگی دەکرد نەك بەناوی خۆیەوە.

تێکڕای هەرهەموو ئەم وەسفانەش بەس نەبوو بۆ ئەوەی بیرلەوە بکەنەوە کەئەو لەسەر رۆیشتنە لەبەرئەوەی بەر لەشەش ساڵان دەنگۆی مردنی لە گۆڕێ بوو لەگەڵ ئەمەشدا فەرماندەیی خۆی بەبێ کەم و زیادو پاراستبوو. یەکەم دەنگ و باسی کە ئەفسەرێکی هێزی دەریایی هێنای کە بە رێکەوت ژەنەراڵی لە جەنگەکانی ئازادی باشوور لە بیابانی پاتیبیلکا لە باکووری لیما دیتبوو. ژەنەراڵی لە کولبەیەکی وێرانەی کە وەك بارەگای فەرماندەیی هەڵبژێردرابوو دیتەوە. ژەنەراڵ رۆبە سەربازیەکەی لە خۆی وەرپێچابوو و دەسماڵێکیشی لەسەری بەستبوو چونکە لەو دۆزەخەی ناوەڕاستی رۆژێکی سارد ئێسقانەکان خۆیان رانەدەگرت، ئەوها لاوازببوو کە تا نەیدەتوانی ئەو مریشك و کەڵەشێرانەی کە لە دەوروبەریدا بوون، لە خۆیان دووربکاتەوە، دوای وتووێژێکی دژواری بەدەم ورێنەیەکی زۆرەوە، بەڕستەیەکی زۆر خەماوی و رەنجاویەوە ماڵ ئاوایی لە میوانەکانی خواستبوو:

"برۆن بە هەموان بڵێن کە منتان لەسەرەمەرگداوادیت: کە لەم بیابانە چۆل و هۆڵەدا لەناو جیقنەی مامرو کەلەشێراندا نقوم بووم."

---

١ تیسك:موو

دەگوترا کە نەخۆشییەکەی ئەو تا ولەرزە بەهۆی هەتاوی داغی بیابانانەوە لێی توشیبووە . لەدوای ئەوە لەتاو تایە گەرمەکەی کە نیشانەکەشی جیاوازی نەکردن لەنێوان شتان و ئارامی گیان بوو. جارێکیان لە گوئاجاکیل[١] و جارێکی دیکەیان لە کیتوم هاتەسەر مردن. کەس نەیدەزانی کە ئەم دەنگ و باسانە چ بناغەیەکی زانستیان هەیە؛ لەبەرئەوەی ئەو هەمیشە دژی زانستی پزیشکی بوو و هەرخۆی چارەسەری خۆی دەکرد. ئەم چارەسەریانەی بەپێی کتێبێکی فەرەنسی بوو لەبارەی پزیشکی خانەودەیی و لە نووسینی دونوستیر و ناوی "پزیشکی بە شێوازی ئێوە بوو.

خۆزەپالاسیۆس ئەم کتێبەی وەك بەختنامە لە هەموو جێگایەکدا لەگەڵ خۆی دەگێڕا و ژەنەراڵ بۆ هەموو نەخۆشیەکی لەش و دەروونی خۆی کەڵکی لێدەبینی.

بەهەرحاڵێك بێ هیچ مەرگێك وەك مردنی ئەو بەکەڵك نەبوو، کاتێك هەموو بیریان لێدەکردەوە کە لە بیابانی پاتیبیلکادا دەمرێ، بەڵام جارێکی دیکە زنجیرە چیای ئاندی بڕیەوە[٢]. لە خونین[٣] سەرکەوتنێکی گەورەو بەرچاوی بەدەستهێنا ئەنجامەکەی بە دوا سەرکەوتنی لە ئاجاکوچو[٤] کۆتایی هات کە ئازادی تەواوی ئەمریکای ئیسپانیەکانی تەواوکرد. ئەو کاتە کۆماری پۆلیڤیای دامەزراند لە گەڕانەوەیدا بۆلیما لەوهەموو فەتحانەی کە کردبووی لە هەموو کاتێکی دیکە ژیانی زێتر شادمان بوو. دوای ئەوە هەرگیز لە هەموو ژیانیدا نەگەیشتەوە ئەو شادمانییە. تێکڕایی ئەو دەنگۆیانەی دووبارە دەبوونەوە کە دەیانگوت لەبەر نەخۆشی دەست لە دەسەڵاتدارێتی دەکێشێتەوە و لە وڵات وەدەردەکەوێ و تێکڕای خۆنیشاندانەکانی کە راستی ئەم دەنگۆیانەیان پاساو هەرهەمووی دووبارە کردنەوەی شانۆیەك بوو کە خەڵکی ئەوەندە دیتبوویان چیدی باوەڕیان نەدەکرد.

چەند رۆژ دواتر. دوای تەواوکردنی کۆبوونەوەیەکی دەوڵەت، بازوی دەریاسالار ئەنتۆنێو خوزەدسوکرەی گرت و پێیوت: "لەگەڵمدا بمێنەوە."ئەویبردە نووسینگەی تایبەتی خۆی، کە تەنیا داوای چەند دۆستێکی کەم و تایبەتی دەکرد بێنە ئەوی. لەوێ دەریاسالاری ناچارکرد کە لەسەر کورسییەکەی دانیشێ. ئەم کورسییە لەمەودوا زێتر هی تۆیە نەك هی من."

---

١ شارێکی ئەکوادۆریە

٢ مەبەستی losandes ە زنجیرەیەکە پڕ لە لووتکەی زۆر بەرزو کەوتۆتە پیرۆ .

٣ خونین: ناوچەیەکە لە پیرۆ

٤ شاریکە لە پیرۆ

گەورە دەریا سالاری شاری ئاجاکوچو، دۆستی گیانی بە گیانی ژەنەراڵ باری وڵاتی بەباشی دەزانی و تێی دەگەیشت لەگەڵ ئەم حاڵەشدا ژەنەراڵ بەر لە روونکردنەوەی مەبەستی بنەڕەتی خۆی، روونکردنەوەیەکی دووورودرێژی لەمەر باری وڵاتەوەدا. لە چەند رۆژێکی داهاتوودا دەوڵەت بۆ هەڵبژاردنی سەرۆك کۆمارو پەسندکردنی یاسای بنەڕەتی داهاتووی دەوڵەت بۆ هەڵبژاردنی سەرۆك کۆمارو پەسەندکردنی یاسای بنەڕەتی کۆبوونەوەی هەبوو و ئەمە تەنیا هەوڵێك بوو بۆ رزگارکردنی ئەم وڵاتە گەورەی پیرۆ، لەژێر چەپۆکی دەوڵەتێکی کۆنەپەرستدا وا دەهاتە بەرچاو ئەو هەوڵەبێ سوودبێ.

ژەنەراڵ ئەندرس دسانتاکروز بە پاڵەسوان پۆلیڤیای خستبووە سەر رێگایەکی کە خۆی دەیویست. ڤەنزویلا تازە سەربەخۆیی خۆی لە ژێرچەپۆکی ژەنەراڵ خۆزە ئەنتۆنیو پائز راگەیاندبوو، ژەنەراڵی بەهێزو توانای باشوور، خوان خۆزەفۆرەس یەکێتی گوئاجاکیل و کیتۆی دامەزراندبوو تاکو کۆماری سەربەخۆیی ئەکوادۆر دامەزرێنێ. کۆماری کۆلۆمبیا، کە ناوەندی وڵاتێکی گەورەو یەکگرتووبوو، هەنوکە بە ئەندازەی جارانی نوئباگرانادا لە کەمی دابوو. شانزە ملیۆن ئەمریکایی کە تازە بە تازە رێگای ئازادی ژیانیان دیتبۆوە، ئێستا کەوتبوونە بەرتاوی هەوەسی سەردارەکانی خۆیان.

لە کۆتاییدا ژەنەراڵ بەم شێوە کۆتایی پێهێنا: "بە کورت و کرمانجی، ئەوەی ئێمە بە دەستەکانمان هێنامانەدی ئەوا خەریکە خەڵکی دیکە بە پێلەقە دەیانڕمێنن."سوکرەی دەریاسالار گوتی: "ئەمە یاری چارەنووسی. گوایە ئێمە نیهاڵی سەربەخۆییمان هەر ئەوەندە قووڵ چاندبوو کە ئەم میللەتانە ئێستا دەیانەوێ لەیەکدی جیابنەوە."

ژەنەراڵ بە ئاگایی و خێرا کاردانەوەی نیشاندا: "قسە پڕ لە باق و بریقەکانی دوژمن مەلێوە، هەر چەندە راستی لەم شێوەیەش هەبێ."دەریاسالار سوکرە داوای بووردنی کرد. ئەو عاقڵ... رێکوپێك، شەرمن بوو باوەڕی بە خەرافات هەبوو، روویێکی شادو خۆشی هەبوو کە تا دەموچاوە ئاوڵاویەکەیشی تامی ئەو شیرینییەیان کەم نەدەکردەوە، ژەنەراڵ ئەوی زۆر خۆشدەویست و لەبارەی ئەوەوە گوتبووی بەبێ ئەوەی سادەو ساکاربێ، وانیشاندەدا کە خاکیە لە پێچینجا[1]و توموسلا[2]و تارکی[1]قارەمانی جەنگبوو لە کاتێکدا تازە بیست و نۆ ساڵەی

١ ناوی هەندی ناوچەن لە ئەکوادۆر

٢ ناوی هەندێ ناوچەن لە ئەکوادۆر

تەمەنی تەواوکردبوو کە لە جەنگی پڕشکۆی ئاجاکوچو ببوو بە فەرماندە و لەم جەنگەدابوو کە دواپاشماوەکانی لەشکری ئیسپانیا لە ئەمریکای باشوور نابووتبوون، بەڵام لە هەمووی پتر لەبەر رەفتارجوانی خۆی لەسەرکەوتن و هۆشیاریە سیاسیەکەی ناسراوبوو، ئەو وەختە دەستی لە هەموو بەرپرسیارێتیەك کێشاوە و وەلای نان و بەبێ هیچ نیشانەیەکی سەربازی و بەپاڵتۆیەکەوە کە بەسەر خۆیدا دەکێشا تا لەبەرانبەر باموساویەکانی چیاکانی چواردەور، باشتر خۆی بپارێزی. تاکە فرمان و کاری بەرانبەر میللەت و دواکاری بەشداریکردن بوو لە ئەنجومەن، وەك نوێنەری شاری کیتۆ، شتێکبوو بۆ ئەو وەك ئارەزووێك بوو، تەمەنی سی و پێنج ساڵ بوو تەندروستی زۆر باش بوو بەوپەڕی شێت و شەیدایی و دڵێکی پڕ لە ئەڤینەوە لەگەڵ ماریاناکارسلن، کەژنێکی گەنج بوو و لە هەرەتی دابوو شادودڵخۆش بوو خەڵکی کیتۆ بوو. ئەوا دووساڵ پێشی ئێستا زەماوەندیان کردبوو و نهاکیژۆڵەیەکی شەش مانگەیان هەبوو، ژەنەراڵ لەو بەو لاوە هیچ کەسێکی دیکەی بەباشتر نەدەبینی لە جێگای خۆی وەك سەرۆك کۆمار دایبنێ، بەڵام باشدەیزانی کە ئەو لە تەمەنی یاسایی بۆ ئەم کارە پێنج ساڵ بچووکترەو ئەم تەمەنەش لە یاسایی بنەڕەتیدا بۆ رێگا داخستن لەسەر ژەنەراڵ سوکرە لەلایەن رافائل ئوردانتاوە دانرابوو، بەڵام ژەنەراڵ بۆ لەبەینبردنی ئەم حوکمە هەرچیەکی لە دەست دەهات دەیکرد، ژەنەراڵ گوتی: "ئەگەر قبووڵ بکەن زۆر خۆشحاڵ دەبمو وەك گایەکی بە دەوری گاڕانێك مانگا دادێت و دەچێ و دەیانپارێزێ، منیش دەمێنم و پشتیوانیتان لێدەکەم[٢].

شکستخواردوو دەهاتەبەرچاوان، بەڵام نەخشەو پلان و بڕیاری بەڕاستی و دەنگیشی تۆکمەوخۆڕاگرانە بوو، لەگەڵ ئەمەشدا دەریاسالار لە مێژبوو دەیزانی کە ئەو کورسیەی لەسەری دانیشتووە قەت نابێتە جێگای ئەو. قەدەرێك پێشتر کاتێك کە بۆ یەکەمجار سەرۆکایەتی کۆماریان بۆ پێشنیار کرد، گوتبووی هەرگیز ئامادەنییە کە فەرمانڕەوایی میللەتێك بکا کە رێگای چارەنووسی رۆژ لە رۆژێ نادیارترە بە بڕوای ئەو یەکەم هەنگاو بۆ چارەسەرکردنی ئەم رژێمە وەرگرتنەوەی دەسەڵات بوو لە نیزامیەکان. ئەو داینابوو بۆ ئەنجومەن پێشنیاربکا کە لە چوارساڵی ئایندەدا هیچ ژەنەراڵێك بۆ سەرۆکایەتی کۆمار

---

١ ناوی هەندێ ناوچەن لە ئەکوادۆر

٢ من بەئانقەست نەمویستوە دەستکاری ئەو جۆرە گوزارانە بکەم

هەڵنەبژێردرێ و ڕەنگە مەبەست لەم پێشنیارە کۆتاکردنی دەستی ئوردانتا بووبێ، بەڵام سەرسەختترین کەسانی دژ بەم پێشنیازە، ژەنەڕاڵە بەهێزو زەبەردەستەکان بوون .

سوکرە گوتی: "من ئەوەندە نەخۆشم کە چیدی بەبێ قیبلەنوما ناتوانم کاربکەم ، لەگەڵ ئەوەشدا قوربان ئێوە وەك من دەزانن کە ئێرە پێویستی بە سەرۆك کۆمارێك نییە . بەڵگە پێویستی بەسەر کوتکەرێکی ئاژاوە گێڕان هەیە."

هەڵبەتە لە دانیشتنی ئەنجومەندا ئامادە دەبوو ، ئەگەر بۆ سەرۆکایەتی کردنی ئەنجومەنەکەشیان پێشنیازبکردابا بەریزەوە قبووڵی دەکرد، بەڵام لەمە بترازێ کارێکی دیکەی نەدەکرد، لە ماوەی چواردەساڵی جەنگدا لەوە گەیشتبوو کە هیچ سەرکەوتنێك لەوە گەورەتر نییە کەبە زیندوویی بمێنیەوە. سەرۆکایەتی کۆماری پۆلیڤیا، ئەو وڵاتە مەزن و نەناسراوەی کەوا خۆی بەردی بناغەی دامەزراندبوو و بەتەگبیرفەرمانڕەوایی کردبوو، دەسەڵات و توانای نیشاندابوو هۆش و دڵسافی بێکەڵکی شکۆوگەورەیی بۆ ئەو ئاشکراکردبوو، قسەکانی بە کورتی کرد: "قوربان ناتوانم ئەوە قبووڵ بکەم."لە ڕۆژی سیانزەی حوزەیران، ڕۆژی بۆنەی ئایینی ئەنتۆنیۆ، وا بڕیاربوو لە کیتۆ لەلای ژنو کچەکەی بێ، نەك تەنیا بۆ چەژن گێڕان بەبۆنەی ئەو ڕۆژە پیرۆزەوە، بەڵکە بۆ هەر ئایندەیەکی کە بۆی بێتە پێشەوە، پلان و بڕیاری لە پێناو ژیاندا، تەنیا و تەنیا لەبەرخاتری ئەوان و چێژی ئەو عیشقە لە جەژنی کریسمس ئەو ساڵە بڕیارێکی بێچەندو چون بوو و بڕابۆوە.

دەریا سالار سوکرە گوتی: "ئەمە تەنیا شتێکە کە لە ژیاندا دەمەوێ."ژنەراڵ بە ناڕەحەتییەکەوە وەڵامیداوە: "وامدەزانی کە ئیدی ناتوانی ببێتە جێگای سەرسوڕمانم."تێیڕاماو لێی پرسی: "ئەمە دوا قسەی ئێوەیە؟"سوکرە گوتی: "نا، ئەمە دوا قسەم نەبوو، دوا قسەی من ئەوەیە سوپاسێکی زۆری ئەو هەموو خۆشەویستیە زۆرەی ئێوە بکەم."

ژەنەراڵ دوای ئەوەی کە بەڕانە سڕبووەکەی خۆیدا کێشا تا لە خەوی بێدار بکاتەوە:

گوتی: "زۆرباشە، تۆ هەر ئێستا لە باتی من گرنگترین بڕیاری ژیانمت دا."

ئەو شەوە لەبەر کاریگەرێتیەکی زۆر کوشندەی دەرمانێکی هێلنجدەر، کە پزیشکێکی ئاسایی بۆ دەردانەوەی زەرداو بۆی نووسی بوو، نامەی دەست لەکار کێشانەوەی خۆی نووسی، ڕۆژی بیستەمی تەموز فرمانی کۆبوونەوەیەکی ئەنجومەنی دەرکردو ماڵئاوایی لێکردن و گوتی: لە وتەکەی خۆیدا زۆری بە دەریاسالار سوکرە هەڵکوت و وەك شایستەترین ژەنەراڵ ناوی هێنا، هەموو نوێنەرەکانی ئەنجومەن خۆشیان لەم قسانەی هات و دەستیان بە چەپڵەڕێزان کرد، بەڵام

یەکێك لەوان کە لە نزیکی ئوردانتا دانیشتبوو بە گوێی داچرپاند: "مەبەستی ئەمەیە کە ژەنەراڵی لە ئێوەش شایستەتر هەیە."

پیاهەڵدانی ژەنەراڵ و ناپەسندی ئەو ئەندامەی ئەنجومەن دووسەرەنێزەی تیژ بوون لە دڵی ژەنەراڵی رافائل ئۆردانتا ڕاچون.

ئۆردانتا تا ڕادەیەك لەسەر حەق بوو، هەرچەندە ئەو هەموو شایستەیی سەربازی و توانا و سەرنجڕاکێشی سوکرەی نەبوو، بەڵام ئەمە نیشانەیەك نەبوو کە توانای ئەو لە هی سوکرە بەناشایستەتر بزاندرێ، هۆشی تیژو وردبینی ئەو ژەنەراڵ خۆی وەسپی کردبوو، وەفاداری و هەستی بەرانبەر ژەنەراڵ لەسەر زمانی هەمووان بوو و یەکێك بوو لەو کەسانەی بە پەنجەی دەست دەژمێردران کە بوێرێ راستیەکان بە ژەنەراڵ بڵێ کە ژەنەراڵ خۆی لەزانینیان دەترسا: ژەنەراڵ لەگەڵ پەیبردن بەهەڵەکەی هەوڵێدا کە لە کاتی چاپکردنی قسەکانی کردبوونی ئەو رستەیە راستکاتەوەو لە باتی "شایستەترین ژەنەراڵ"رستەی "یەکێك لە شایستەترین ژەنەراڵەکان"ی نووسی، بەڵام ئەم کارەش ئاگری کینەی ئوردانتای دانەمرکاندەوە.

چەند رۆژێك دواتر، ژەنەراڵ لە کۆبوونەوەیەکی ئەندامەکانی ئەنجومەن کەهەمویان لە دۆستەکانی خۆی بوون، لەلایەن ئوردانتاوە تاوانبارکرا کە وانیشاندەدا دەڕوا، لە کاتێکدا کە بە نهێنی لە هەوڵی دووبارە خۆ هەڵبژاردنەوە دایە. ژەنەراڵ خۆزە ئەنتۆنیۆ پائیز سێ ساڵ پێشتر بەمەبەستی جیابوونەوە لە کۆلۆمبیا، بە زۆرو زۆردارەکی نووکی نێزە ڤەنزویلای داگیرکرد، لەسەرینایی ئەم رووداوەدا ژەنەراڵ چوە کاراکاس[1] و لەبەرچاوی خەڵکی، لەنێوان بانگ و هاواری شادی خەڵکی و زەنگی کلێسادا پائیزی لە ئامێزی گرتو ئاشتی کردەوە، لە هەمانکاتدا رەزای خۆی نیشاندا کە پائیز دەتوانێ بە ئازادی لەوێدا حوکمڕانی بکا. ئوردانتا گوتی: "لەو زەمانەوە بوو کە بەدبەختی دەستپێکرد."ئەم ئاشتەوایی و دۆستایەتیە نەك تەنیا پێوەندیەکانی لەگەڵ خەڵکی گرانادا لێڵ کرد: بەڵکە تۆوی جیاخوازیشی لەلایان چاند. ئوردانتا سەرەنجام گوتی لە حاڵی حازردا چاکترین خزمەتێکی کە ژەنەراڵ دەتوانێ بە میللەتی بکا ئەمەیە کە بەبێ کات لەدەستدان، لە دەسەڵات دەستبکێشێتەوە و لە وڵاتیش بچێتەدەر. ژەنەراڵیش بەهەمان هێزو رەوانیەوە وەڵامیداوە، بەڵام ئوردانتا دەربڕینی ڕەوانتر و ئاگرینی تری

---

١ کاراکاس: پایتەختی ڤەنزویلا

هەبوو و ئەو هەستەی لەناو خەڵکی دیکەدا بزواند کە گوایە لە ڕێو ڕەسمی بڕینی پێوەندییێکی دۆستانەی تۆکمەو کۆندا بەشداریان کردووە.

ژەنەراڵ پشتگیری لە دەست لەکارکێشانەوەکەی خۆی کردو دۆن دۆمینگۆ کایسدۆی وەك سەرۆك کۆماری کاتی هەڵبژارد، تا ئەو کاتەی کە ئەنجومەن سەرۆك کۆماری نوێ هەڵبژێرێ. ڕۆژی یەکەمی مارت بە مەبەستی خۆتەریککرتن لە پێکاهاتن لەگەڵ میوانانی کە بەپەرداخێك شامپانی پیرۆزباییان لە جێنشین دەکرد، لە دەرگای پشتەوەی ساختمانەکە لەو حەوشەی ئاودەستەکانی لێبوو، ساختمانەکەی ئەنجومەنی بەجێهێشت. بە گالیسکەیەك و بەشێوەیەکی نەناسراو چووە ماڵێك لە درفوچا[1] کە هەوارێك بوو چەندین تاقگەو قەڵبەزی تێدابوو ئەم خانووە لەلایەن سەرۆك کۆماری نوێوە بۆ ئەو دانرابوو. زانینی ئەم بابەتەی کە ئیدی تەنیا هاووڵاتیەکی ئاساییە، نەخۆشی و ڕشانەوەکانی زێتر کردبوو، لەنێوان خەو و بێداریدا داوای کاغەزو پێنووسی لە خۆزەپالاسێوس کرد تا بتوانێ بیرەوەریەکانی بنووسێ. خۆزەپالاسێوس کاغەزو قەڵەمی تەواوی بۆ برد کە بەشی چل ساڵ یادەوەری نووسینەوەی دەکرد و ژەنەراڵ نامەی بۆ فرناندۆی برازاو نووسەرەکەی نووسی تا لە سعات چواری بەیانی ڕۆژی دووشەممەی ئایندەدا بۆ نووسینەوەی یادەوەریەکانی بێتە کنی. ئەم ساتە باشترین کاتی بیرکردنەوە بوو، چونکە هەر هەموو هەستەکانی لەلای خۆی بوون.

زۆرجاران واببوو بە برازاکەی وتبوو دەیەوێ لە کۆنترین یادەوەری کە خەونێك بوو لە تەمەنی سێ ساڵیدا لە ماڵێکی درسن ماتیۆ لە ڤەنزویلا دیتبووی دەستپێکا خەونی دیتوو لە دوانیوەڕۆیی کە هەموو خەڵکی ماڵ و خزمەتکارەکان نووستبوون، بارگیرێکی ڕەشی ددان زێر هاتۆتەناو ماڵەوە و سەری بە هەموو کون و قوژبنێکدا کێشاوە هەر لە ساڵۆنی سەرەکی تا عەمبارەکان، هەرشتێکی هاتبووە پێشی بەکاوەخۆ پاکۆی دابوو، پەردە، پەرە، گوڵدان، قاپو قاچاغ، کەوچکو کەوێل، پەیکەری عیساو حەزرەتی مریەم، جلوبەرگو دۆڵابەکان، ئاگردانی ژووری چێشتخانە، دەرگاو پەنجەرە بە دەسکەکانیانەوە هەر هەموو کورسی و قەنەفەکانی هەیوان، ژووری خەو و ژوورەکانی دیکەی دەم و دەست خوارد و تەنها شتێك کە هێشتبوویەوە، قاپە شێوە هێلکەییەکەی سەر مێزی ئاوێنەی دایکی بووە لە ماڵی فوچا بەهۆی ئاووهەوای لەبارو سازگار لەوێ و لەژێر ئەو ئاسمانە شین و بێگەردەدا حاڵ و باری ژەنەراڵ ئەوەندە باشبۆوە کە چیدی باسی نوسینەوەی یادەوەرەیەکانی نەکردەوە و بەیانیان زوو لەباتی نووسینەوەی

[1] ناوچەیەکە لە کۆلۆمبیا

یادەوەری، لە ڕێگا و بانە پڕ بۆنو بەرامەو عەتراویەکانی ئەو دەستە پیاسەی دەکردو بای باڵی دەدا، ئەو کەسانەی کە لەو ڕۆژانەدا چاویان پێی کەوتبوو، وایان هەستکردبوو کە بە تەواوی چاکبۆتەوە. زۆرترین کەسانی کە سەردانی ئەویاندەکرد وەفادارترین دۆستە نیزامیەکانی بوون کە پێیان لەسەر ئەوە دادەگرت کە بە کۆدەتایەکی سەربازی لە سەرۆکایەتی کۆماربگرێتەوە دەست : بەڵام ژەنەراڵ دەیگوت دەسەڵاتێکی کە بە زۆر بێتە دەست، بەشایستەی خۆی نازانێ و بەم جۆرە ئەوانی بێئومێد دەکرد، لەگەڵ ئەم حاڵەشدا وای بەبیرخۆیدا دەهێنا کە هێشتاش ئەگەری ئەمە هەیە کە بە بڕیاری ئەنجومەن دووبارە هەڵبژێردرێتەوە خۆزەپالاسیۆس دووبارەی دەکردەوە: "هەر بەو شێوەی کە گەورەی من بیردەکاتەوە. تەنیا سەروەری من دەیزانێ."مانوێلا چەند هەنگاوێك لەو لای کۆشکی "سان کارلوس"ی جێگای دانیشتنی سەرۆك کۆمار، دەژیاو گوێی لە زەنگی هەموو دەنگ و باسەکان بوو، دوو یان سێ حەفتە چووە فوچامی زێتر لەبەردەنگ و باسی گرنگ، هەر جارێك نانێکی زۆری شیرینی بادەمی، شیرینی دیکەی جۆراو جۆرو شوکولاتەی بەدارچینی بۆ عەسرەچایی لەگەڵ خۆیدا دەبرد. کەم وا دەبوو ڕۆژنامە لەگەڵ خۆیدا ببا: چونکە ژەنەراڵ ئەوەندە بەرانبەری ڕەخنەگرتن هەستداربببوو، کە بچووکترین ڕەخنەی بچووك تووڕەی دەکرد. لەباتی ڕۆژنامە منوئلا تەواوی دەنگ و باسی سیاسی بەو دەگوت: کارنەکردن و ناپاکی و پێشینیەکانی ئەندامانی ئەنجومەن: ژەنەراڵ ناچاربوو بە نابەدڵیەوە گوێ لە هەمووان بگرێ. لەبەرئەوەی منوئلا تەنیا کەسێك بوو ڕێگای پێدرابوو کە ڕاستی بەو بڵێ، کە قسەیەکیان نەدەبوو بیکەن دەستیان بە خوێندنەوەی ئەو نامانە دەکرد کە گەیشتبوونەجێ یا مانوێلا کتێبی بۆ دەخوێندەوە یان لەگەڵ پاسەوان و خزمەتکارەکان یاری کاغەزیان دەکرد: بەڵام هەمیشە نانی نیوەڕۆیان بەجیا دەخوارد.

پێشی هەشت ساڵان لە کیتۆ، لە ئاهەنگی سەربەخۆیی ئەو شارەدا یەکدیان ناسی، ئەو ساکە منوئلا هێشتا کە ژنی دکتۆر جێمیزتورن بوو کە پزیشکێکی ئینگلیز بوو لەسەردەمی فەرمانڕەوای پێشووی لیمادا لە وێ دەژیا. پێشی بیست و حەوساڵان دوای مەرگی مێردەکەی منوئلا دواژنێك بوو کە ژەنەراڵ پەیوەندی لەگەڵیدا هەبوو سەرەڕای ئەمەش، مەحرەمی نهێنی و پەروەندەکانی بوو خوێنەرێکی زۆر زۆریش باشبوو کەوایلهێاتبوو ژەنەراڵ ئەوی بەسەرهەنگێك بەراورد دەکرد.

زۆر بەسەر ئەو دەورانەدا تێپەڕیبوو کەمنوئلا لەشەڕێکدا لەگەڵ ژەنەراڵ دڵی نەیگرتبوو قەپاڵێکی باشی لە گوێی ژەنەراڵ گیرکردبوو و هێندەی نەمابوو بیقرتێنێ. بەڵام هێشتا هەندێ لە باس و خواسی ڕۆژانەیان دەگەیشتە ئالۆزی کە هەڵبەتە لەدوای ئەوە بەقسەی خۆشی عاشقانە لەگەڵ یەکدیدا ئاشت

دەبوونەوە . هیچ کاتێك مانوێلا بۆ نووستن نەدەماوە. هەمیشە زوو دەڕۆیشت تا ئەو بەرێگاوە نەبێ. بەتایبەتی لەو کات و وەختانەدا کە پاش نیوەڕۆ زۆر کورت بوونو زوو شەو دادەهات.

وەختێ کە لە خانوێك لە ماگدالینا[1] لە لیما دەژیا. ژەنەراڵ هەمیشە بە بیانگەیەك مانوێلای لەخۆی دوور دەخستەوە تا بتوانێ لەگەڵ ژنی دەوڵەمەندو ژنانی دیکەدا بێت، بەڵام لە فوچا وا دەهاتەبەر چاوان کە ناتوانێ بەبێی مانوێلا بژێی. بەر لە گەیشتنی مانوێلا هەمیشە بەدەم چاوەڕوانی چاوی لەو جادە دەبڕی کە ئەوی لێوە دەهات. خۆزە پالاسیۆسی نارەحەت دەکرد و هەموو دەمێ لێی دەپرسی سعات چەندە، دەیویست لەم کورسی و بۆ ئەو کورسی جێگۆڕکێ بکا، ئاگری سۆبەی ناو دیوارەکەی خۆش بکا، یان دایمرکێنێتەوە و دووبارە هەڵیکاتەوە زۆربەبێ سەبرگرتیو و بێ کەیف و زەوقیەوە چاوەڕێ دەما تا گالیسکەکەی مانوێلا لەو دیو تەپۆلکەکانەوە بەدەردەکەوت و لەو وەختەدا بوو کە دووبارە گوڕی ژیان دەهاتەوە بەر لەشی ، بەڵام ئەگەر پێکەوەبوونیان زیاتر لە رادەی عادەتی درێژەی دەکێشا، دیسانەوە نیشانەکانی بێ خەوی لەودا بەدەردەکەوت. زۆرجاران بڕیاریاندابوو کە بۆ دواجار پێکەوەبن. بەڵام تەنی ژەنەراڵ توانای تەواوی بۆ رازیکردنی گیانی مانوێلا تێدا نەبوو، هەرچەندە ژەنەراڵ ڕازینەبوو ئەم مەسەلەیە قبووڵ بکا. بێخەویەکەی لەو رۆژانەدا بەرنامەکەی لێتێکدابوو. وەخت و بێوەخت بۆ نموونە لەناوەڕاستی رستەیەکی کە لە نامەدا دەینووسی یان لە کاتی یاری کاغەزدا خەوەکوتکەدەیبردەوە خۆیشی نەیدەزانی کە ئایا بەراستی خەوبردویەتیەوە یان دڵی لە خۆبۆتەوە و ئاگای لە خۆبڕاوە. بەڵام وەختێ بۆ نووستن رادەکشا. خەوی لێدەهەڕما نزیکی سپێدەدەمان بە زەحمەت خەوی لێدەکەوت و دەمێك دوای ئەوە بەوهەوا فێنکەی کە لە نێو دارو بارەکانەوە دەهات بێدار دەبۆوە ئەو وەختە نەیدەتوانی خۆی بەرانبەر حەزی پیاسە راگرێ. سەرەنجام نووسینی یادەوەرەیەکانی بۆ رۆژێکی دیکە دوادەخست و بەتەنیا بە پێیان دەڕۆیشت و هەندێجاران ئەم بەپێیان رۆیشتنەی تا نیوەڕۆ درێژەی دەکێشا. بەبێی پاسەوان دەڕۆیشت. تا دوو سەگە بەوەفاکانیشی کە لە مەیدانەکانی جەنگیشدا لەگەڵی بوون، لەگەڵ خۆیدا نەدەبرد. بەنیازی پارەکۆکردنەوە بۆ سەفەرەکەی ئەسپە ئەفسانەییەکانیشی بە هەنگی سواری نیزامی فرۆشتبوو بەسەر گەلا رزیوەکانی دارسنەوبەرەکاندا بەرەو رووبارەکەی ئەو نزیکانە دەڕۆیشت. لەبەرەورووبوونەوەی بایە ساردەکانی ئەو دەشتەدا رۆبێکی چەرمە وشتری ئەمریکایی بەسەر

---

[1] ماگدانیا : پاریزوگاو روباریك لە کۆلۆمبیا

شانیدا دەدا، چەکمەیەکی کە دیویێکی تویێژە خوریەکی ئەستوری پیێوەبوو لە پیێدەکردو کلاّویێکی ئاوریشمی کەسك کە تایبەتبوو بۆ کاتی نووستن، لەسەردەکرد.

ماوەیەکی دریێژ لەبەرانبەر پردیێکی بچووك لەژیێر سایەی داران دادەنیشتو بیری دەکردەوەو نوقمی ناوتەماشای رۆیشتنی ئاو دەبوو. جارجار رۆیینی ئاوی لەگەلّ چارەنووسی مرۆڤدا بەراورد دەکردو ئەمە ویێکچواندنیێکی جوان بوو کە لە دۆن سیمۆن رودر بکزی مامۆستای سەردەمی لاویدا، فیێری ببوو، یەکیێك لە پاسەوانەکانی تا کاتی گەڕانەوەی بەدزە دز بەدوایدا دەچوو. ژەنەراڵ لە گەڕانەوەدا کە هەمیشە یان لە تەڕی شەونم یان ریێژنە بارانە کورتەکاندا تەڕدەبوو هەناسەی واسواردەبوو کە نەیدەتوانی لە چەند کۆسپەیەکی قادرمەی ماڵەوە سەرکەویێ. بەڕەنگی پەڕیوو هەستی پەرتەوە و دووچاو پڕاوپڕ لەشادی دەگەڕاوە. ئەو پاسەوانانەی کە بە نهیێنی تاقیبی ژەنەراڵیان دەکرد. ئەویان زۆر بە شادی و دڵخۆشی دەدیت و گویێیان لە دەنگی دەبوو کە گۆرانییەکی نیێوان سەربازانی دەگوت. ئەو گۆرانیانەی کە سەربازان لەسەرکەوتنە ئەفسانەییەکانی یان شکستییە شاعیرانەییەکانیدا دەیانچڕی. کەسانیێکی کە باشتر ئەویان دەناسی بەدوای ئەوەوە بوون کە بزانن بەڵگەی گۆڕانی باری دەروونی ئەو چییە هەتا مانویێلا دوو دڵ بوو کە ئەنجومەن، ژەنەراڵ کە زۆریشی پیێداهەڵگۆتبوو، جاریێکی دیکە لایەنگری بکەنەوە و هەڵیبژیێرنەوە.

لەرۆژی هەڵبژاردندا، کاتیێ کە پیاسەی دەکرد سەگیێکی بەرەلای دیت لەنیێوان پوش و پەلاش و پنچکاندا بەدوای قەتیێ و هەویێردان حەمبازی دەهاویشت و هەڵبەزو دابەزی بوو. فیکەیەکی توندی بۆ کیێشا، سەگەکە لە جیێی خۆی راوەستا، گویێچکەکانی قولاغکردو بەدوای دەنگەکەیدا گیێرا. تا لە دواییدا ژەنەراڵی دۆزیەوە کەلەنیێوتەمیێکی زۆری دەشتیێکی فراواندا وەستابوو. دەستیکرد بە بۆنکردنی ژەنەراڵ و ژەنەراڵیش بەسەری پەنجەکانی لەشی ئەوی نەوازشکرد.

لەپڕ سەگە لەو جیابۆوە بە چاوە زەردە زیێڕینەکانی لەو ڕاما، قروسکاندی و پیێپیێوەنا، ژەنەراڵ لە حالّیێکدا کە بە دوای سەگەکە کەوتبووە ریێی بە جادەو ریێگایەکی نائاشنا کەوت و لەناکاو خۆی لەیەکیێك لە گوندەکانی ئەو دەوروبەرانەدا دیتەوە کە ریێگاوبانی خۆڵەپۆت و خانووی قوڕینی بە شیێروانی و دووکەڵکیێشی سوریان هەبوو. لە حەوشەی هەندیێك ماڵدا کە چیێلیان لیێدەدۆشی بۆن و بەرامەی شیر دەهات. لەپڕیێك ژەنەراڵ گویێی لە هاواریێك بوو: "هەی بەرازی پیس."لە گەوریێکەوە تەپاڵەیەکی گەورەی بەرەو ئەو فریێدا. ژەنەراڵ لەگەلّ ئەوەشدا ئاگای لیێبوو، دەرفەتی نەکرد خۆی لاداو تەپاڵەکە بەسەر سینەو بەرۆکیدا بلاوبۆوە و سەروچاویشی تیێوەرچوو پیس بوو. هاوارەکەی بەر لە هاتنی تەپاڵەکە ئەوی لەو داڵغەکرد کە تیێیدابوو، داڵغەیەکی کە لە کاتی جیێهیێشتنی دەوڵەتدا تیێی چووبوو، نازناویێکی کە خەڵکی گراناد‌ا پیێیاندابوو، بەباشی دەزانی، ئەم نازناوە بۆ شیێتی سەرجادان و جل و بەرگە کۆنەکانی دەستی دووی

بەکاردەهێنرا. تاکو لە ئەنجوومەن لە پاشملەی ئەو، سینا تۆرێکی لیبرالیش ئەوی بەهەمان نازناو ناوبردبوو و تەنیا دوو کەس بۆ نارەزایی بلّندببوون، بەلاّم هیچ وەختێك بەڕاستی هەستی بەوە نەکردبوو، بەدەم پاککردنەوەی دەموچاوی بەلچکی رۆبەکەی پارێزگارو پاسەوانە نهێنییەکەی بەخۆو شمشێری رووتەوە لەنێوان درەختاندا دەرپەڕیبوو تا ئەو کەسە تەمێ بکا کە تۆپە تەپاڵەکەی هاویشتبوو، ژەنەراڵ زۆر بە تووڕەییەوە پێشی لێگرتبوو و پرسی: ئەوە تۆ لێرە چ هەڵەیەك دەکەی؟"

ئەفسەرەکە خۆی گورجکردەوەو گوتی:

"سەروەری من، لەوێدا کاروفرمانی خۆم دەکەم."

ژەنەراڵ وەڵامیداوە: "من سەروەری ئێوە نیم."

زۆر بە تووڕەیی و پەلەوە لە تێکڕای بەرپرسیارێتی و پلەو نیشانەکانی خست. ئەفسەرەکە لەم کارە زۆر دڵخۆش بوو، لەبەرئەوەی ئیدی پلەوپایەکی نەما تا ژەنەراڵ بتوانێ تۆڵەی زێتری لێوەرگرێتەوە. تێگەیشتنی ئەم کارە خێرایەی ژەنەراڵ تا بۆ خۆزەپالاسیۆسیش کە ژەنەراڵی باش دەناسی، زۆر ئەستەمبوو.

رۆژێکی ناخۆشبوو، تەواوی رۆژەکەی بەهەمان باری نیگەرانی کە هەمیشە لە کاتی چاوەڕێکردنی مانوێلادا هەیبوو. بەدەوری ماڵەوەدا دەگەڕا و دەسوڕا. بەلاّم لە کەسی نەشاردەوە کە نیگەرانیەکەی لەبەر مانوێلانیە ،.بەڵکە لەبەردەنگ و باسی ئەنجوومەنە هەوڵیدەدا دەقە بە دەقە رووداوەکانی ئەنجومەن تاوتوێ بکا، کاتێك کە خۆزەپالاسیۆس وەڵامیداوە کە سعات دەیە. ژەنەراڵ گوتی: "ئەم خەڵکە فریودەرانە هەرچەندەکی بزەڕن و درێژەدادڕی بکەن ئەوا تا ئێستا دەستیان بە راوەرگرتن کردووە. ئەو ساکە لە ئەنجامی بیرکردنەوەیەکی زۆر بە دەنگێکی بەرزەوە وتی: "کێ دەزانێ کە پیاوێکی وەك ئوردانتا چ بیروڕایەکی هەیە. خۆزەپالاّسیۆس دەیزانی کە خودی ژەنەراڵ باشیش دەزانێ چونکە ئوردانتای بەهۆی نارەحەتی و دڵتەنگی خۆی لە هەموو جێگایەکدا و لەکن هەموو کەسێك دووپاتیدەکردەوە هەر بەم شێوەیەی کە خۆزەپالاسیۆس بەبەردەمی ژەنەراڵدا رادەبورد، ژەنەراڵ بەبێ ئاگاییەکەوە لێیپرسی: "بەڕای تۆ سوکرە دەنگ بەکێ دەدا؟"خۆزە پالاسیۆس و ژەنەراڵ هەردووکیان بەباشی دەیانزانی کە سوکرەی دەریاسالار ناتوانێ دەنگ بدا: لەبەرئەوەی سوکرە لەگەڵ خۆزە ماریا ئاستوز قەشەی شاری سانتامارتا[١].

لەلایەن ئەنجومەنەوە بۆ گوتوێژ لەگەڵ سەربەخۆیی خوازان بۆ ڤەنزویلا چووبوو. لەم ڕووەوە خۆزەپالاسیۆس بەبێ خۆگلّخاندن وەڵامیداوە: "قوربان ئێوە لە هەموو کەسێك باشتر ئەمە دەزانن."ژەنەراڵ لەو وەختەوەی کە لە پیاسەی سەر لە بەیانیانی گەڕابۆوە زەردەخەنەیەکی گرت.

---

١ سانتامارتا: ناوەندی پارێزگای ماگدالنا لە کۆلۆمبیا

لەگەڵ ئەمەدا بەباشی ئارەزووی خواردنی نەبوو. هەمیشە بەر لە سعات یانزە هێلکەیەکی کولاو یان کەمێك پەنیری بەپەرداخێك شەرابەوە دەخوارد. بەڵام ئەو رۆژە هەتا کاتێك کە ئەوانیدیکە خەریك بوون فراواینیان دەخوارد. ژەنەراڵ هەر لە هەیوانیّ ماوە و چاوی لە جادە بڕیبوو.

ئەوەندە بە دالغەوە رۆچوبووە ناوخۆی کە تاوەکو خۆزەپالاسیۆسیش نەیوێرا قسەیەکی لەگەڵ بکا. شتێك لە سعات سیّ تێپەڕیبوو بەبیّ ئەوەی گالیسکەکەی مانوێلا ببینیّ، دەنگ و تەقەو تەپەی وڵاغەکانی گالیسکەکەی هاتەبەرگویّ و بەتەکانێك لەسەر کورسیەکە راستبۆوە بەرەو پیریەوە رایکرد، دەرگای کردەوەو یارمەتیدا تا لە گالیسکەکە دابەزی. دەرلەحاز کە چاوی بەشێوەو روخساری کەوت، لە هەموو شتێك گەیشت. دون خوئاکین موسکرا نوێبەرە کوڕی خانەوادەیەکی خانەدانی خەڵکی پویاجان، بەبیّ دەنگ و ڕا وەرگرتن بەسەرۆك کۆمار دانرابوو.

کاردانەوەی ژەنەراڵ بە تووڕەیی بوونە بێئومێدی، تەنیا سەری سوڕمابوو چونکە خۆی ناوی دۆنخواکین موسکرای پێشنیاری ئەنجومەن کردبوو و دڵنیابوو کە ئەو قبووڵ ناکەن، لەناو غایلە و هزرەکانی خۆیدا نقوم بوو و تا وەختی عەسرە چایی متەقێکیشی نەکرد.

سەرەنجام پرسی: "تا یەك دەنگیش بۆ من نەبوو؟ هەتا دەنگێك؟ نوێنەرە رەسمیەکانی ئەنجومەن لە چەند نوێنەرو پارێزەرو لایەنگیری ژەنەراڵ کەدواتریّ چونە سەردانی. بۆیان روونکردەوە کە تێکڕای لایەنگرانی لەگەڵ یەکدا رێککەوتبوون کە لەگەڵ ئەوانیدیدا یەك بیروڕابن تا بەم شێوەیە ژەنەراڵ لەم جەنگە نابەرابەرە بەدۆڕاو دانەندریّ. ژەنەراڵ بەشێوەیەکی وا تووڕە و لەم کارە ناڕازی بوو کە ئاگای لە جوانی ئەم کارە رێکوپێکەنەبوو. بەپێچەوانەی ئەوە وایبیردەکردەوە کە شایستەی کەسایەتی ئەو دەست لەکارکێشانەوەبوو هەرکە جاری یەکەم پێشکەیشی کرد ئەویان قبووڵ کردبا باشتردەبوو. ئاهێکی هەڵکێشا و گوتی: "بەکورتی، ئەم خەڵکە فریودەرانە دووبارە بردیانەوە و ئەمجارەیان لە دوولاوە."

بەهەموو هێزو قەوارەی خۆی دەیکردو دەکۆشا کە کەس هەست بە ناڕحەتیەکەی نەکا، لەگەڵ نوێنەرەکان خواحافیزیەکی گەرمی کرد و تا دەمی دەرگا بەرێیکردن. بەڵام هێشتا گالیسکەکەیان ئاوانەببوو کە کۆخەکۆخێکی توند گرتی تا شەو داهات تێکڕای خەڵکەکەی ماڵەوەی خستەحاڵی ئامادەباشی. یەکێك لەو نوێنەرە رەسمیانە وتبووی کە ئەنجومەن بەم بڕیارە عاقڵانەی وڵاتی رزگارکردوە. ژەنەراڵ گوێی بەم قسە نەدا. بەڵام هەر ئەو شەوە وەختێك مانوێلا کاسەیەك گۆشتاوی بە گەرویدا دەکرد ژەنەراڵ وتی: "هیچ کاتێك ئەنجوومەن هیچ وڵاتێکی رزگارنەکردوە."ئەو شەوە

بەر لە نووستن هەموو ئەفسەران و خزمەتکارەکانی کۆکردەوەو بەدەنگێکی غەماویەوە ئاگاداریکردنەوە: "لەسبەینێ زووترنییە ولات جێدەهێڵم و دەڕۆم."

ئەو وەختە بۆبەیانیەکەی هیچ رووینەدا، بەڵکە چوار رۆژ درێژەی کێشا لەو ماوەیەشدا گەڕاوە سەرباری ئاسایی. نامەیەکی خوا حافیزی نووسی: بەلام لە دووتوێی نامەکەدا هیچ شوێنەوارێکی نارحەتیەکانی ناوەوەی نەدەدیترا گەڕاوە شار تا کەلوپەل و پێویستێەکانی سەفەرەکەی سازبکا. ژەنەراڵ پیدرۆ ئەلکانتا وەزیری جەنگ و هێزی دەریایی دەولەتی نوێ، ژەنەراڵی بردە ماڵەکەی خۆی لەشەقامی لائانسینانزا. ئەم کارە زێتر لەوەی میوانداریکردنبێ. لەبەر پاراستنی گیانی ژەنەراڵ بوو، لەبەرئەوەی لەم دواییانەدا هەڕەشەی زۆر کەقەسدی گیانیان دەکرد لە ژەنەراڵ کرابوو پێش ئەوەی لە سانتافە بڕوا. کەمێکی لەو کەلوپەلە بەنرخانەی کە بۆی مابۆوە فرۆشت. تا پارەو پولێکی زیاتر کۆبکاتەوە. جگە لە ئەسپەکانی تاقمێك قاپ و قاچاخی زیویشی کە یادگاری سەردەمی خۆشگوزەرانی رابردووی بوو فرۆشت. کۆشکی مۆندا[1] تەنیا دوو هەزارو پێنج سەد پەزویان پێدابوو کە تەنیا نرخی زیوەکەی بوو و نەخش و نیگارە جوان و نرخە مێژووییەکانیان لەبەرچاو نەگرتبوو، کاتێك کە دواحسابیان کرد حەڤدە هەزار و شەش سەد پەزو شەست سەنتاو پارەیان هەبوو. سەرەڕای ئەمەش هەشت هەزار پەزوی لای خەزێنەی شاری کارتاخنابوو هەروەها موچەیەکی خانەنشینی کە ئەنجوومەن بۆیبڕیبۆوە و کەمێك لەشەش سەد ئۆنس زێڕ کە لە ناو سندووقەکاندا بوو. ئەمە بڕێکی کەم بوو لە داراییەکی شەخسی کە لە سەردەمی خۆیدا لە زۆر و زەبەرترین سامانەکانی ئەمریکا بوو.

سەر لە بەیانی رۆژی سەفەرکردن ئەو حەلەی کە ژەنەراڵ جلکی لەبەردەکرد، خۆزە پالاسیۆس کەلوپەل و شمەکەکانی ئەوی بە هێمنی کۆکردەوە. ئەم ئەشمەکانە بریتی بوون لە دوو دەستە جلی ژێرەوەی زۆر کۆن، دوو کراس، کلاوە خەوێکی ئاوریشمی کلاوێکی رەنگاوڕەنگی قوچی نووك تیژ کە دەریا سالار سوکرە لە بۆلیڤیا بۆی هێنابوو و جلی سەربازی کە دوو ریز قۆپچەی (زێرین[2])ی لێدرووابوو. وەك قۆندەرەو پێتاو تەنیا ئەو سۆلانە بوون کە لە ماڵەوە بەسەر پێیەوە دەکرد و ئەو چەکمانەی کە هەمیشە لە پێی دەکرد. لەسندووقەکانی خۆزە پالاسیۆس جگە لە هەندێ تورەگەی

١ بارەگای دەولەت لەشیلی

٢ لەبەر ئەوەی نەمزانی (قۆپچەی ئانا والپا)چیە، بۆیە قۆپچەی زێڕینم وەرگێرا.

دەرمان ژمارەیەکی زۆری ئەشمەکی بەنرخ، چەند شتێکی دیکەش هەبوو، کە دوو کتێبی پەیمانی کۆمەڵایەتی رۆسۆ و نیزامگێری ژەنەراڵی ئیتالی ریموندو مونتکوکلی. دوو پارچە گەوهەری کە پەیوەندیان بەناپلیۆنەوە هەبوو کە سێر رابەرت ویلسۆن باوکی یەکێك لە ئەفسەرەکانی بەدیاری دابوویەی. شتەکانی دیکەی ئەوەندە بێنرخ بوون کە لە کۆڵەپشتێکی سەربازیدا جێگای بۆوە. کاتێك ژەنەراڵ هەموو شتەکانی ئامادەی سەفەر دیت و دیتی کە هەموو خەڵکەکە لە سالۆنیٚ چاوەڕێی ئەو دەکەن، وتی: "دۆستی ئازیزم خۆزە، هیچ وەختێك بیرمان لەمە نەدەکردەوە کە ئەم هەموو شکۆو رێزە لەم شوێنەو کەشوهەوایەدا جێگای ببێتەوە. "

هەڵبەتە حەفت بارگیری دیکە کۆڵەپشتو تورەگەی دیکەیان لێبارکرابوو کە میدالیا، کێرد و چەنگاڵە زێڕینەکانیو شتی بەنرخی دیکە بوون. دە سندووق بەڵگەنامەی تایبەتی خۆی دوو سندووق کتێبو بەلانی کەم پێنج سەندوق جلوبەرگو چەندین تورەگەو کۆڵەپشتی پڕ لە شمەکی جیاجیا کە کەس حەوسەڵەی نەبوو چیدیکە بیانژمێریٚ. خڕی ئەم کەلوپەلو شمەکانەی کەسیٚ ساڵ پێشتر لە لیماوە لەگەڵ خۆیدا هێنابووینەوە، لە حسێب نەدەهات، لەو وەختەدا لە دەسەڵاتێکی سیٚ سەرە سەرپشك بوو، سەرۆکی کۆماری بۆلیڤیاو کۆلۆمبیا و دیکتاتۆری پیرۆو قەتارێکی حەفتاودوو سەندوقی پتر لە چوار سەد کۆڵەپشت و تورەگەی پڕ لە شمەکی گرانبەهای کە هیچ کاتێك نرخی ئەوانە نەزانرا، کەلوپەلێك بوو کە ئەو وەختە لەگەڵ خۆیدا هێنابووی و سەرەڕای ئەمەش لە کیتۆ، شەش سەد کتێبی جێهێلابوو کە ئیدی قەتاو قەت نەکەوتنەوە دەستی.

سەر لە سعات شەش بوو، باران خۆشیکردبوو، بەڵام ئاسمان هەورین و هەوا ساردبوو، ماڵێکی کە سوپا کردبووی بە بارەگای خۆی، رەنگورووی سەربازگەی گرتبوو، سەربازەکان بە دیتنی ژەنەراڵ کەلەوپەڕی سالۆنەکەوە لە نێوان پاسەوانەکانیدا بەدەرکەوت، خڕی رەپیٚ بوون، لەم سپێدەی بەیانیەدا لە دوورەوە ژەنەراڵ لەنێوان پاسەوانەکانی سەوز دەینواند. رۆب بەسەر شانەوەو بە کڵاوی لێوار پان کە سێبەری دەموچاوی گەورەتر دەینواند، لە کەشوهەوایەکی بەرهەڵدا بۆ رووبەڕووبوونەوەی هەوایەکی ناجۆر، بە پێی خەرافاتی کۆنی خەڵکی دەستماڵی بۆنداری عەتراوی بەبەردەمی خۆیەوە گرتبوو، هیچ نیشانەو مەدالیایەکی پێوەنەبوو و بچووکترین شوێنی ئەو هێزو دەسەڵاتە بێکۆتاییەی پێوە نەمابوو، بەڵام خەرمانەیەك لە توانای ئەفسانەیی ئەوی لە نێوان ئەفسەرەکاندا بەدیاردەخست لە راڕەوێك کە بە لباد راخرابوو، بەبیٚ سەرنجدان و گوێدان بەو سەربازانەی کە بەرانبەری ئەو سڵاویان دەداوە، لەسەرەخۆ بەرەو سالۆنی چاوەڕوانی رۆیشت، بەرلە گەیشتنە سالۆنەکە دەسماڵەکەی لەناو قۆڵی کراسەکەی شاردەوە کارێك بوو کە تەنیا کەشیشەکان

دەیانکرد، کڵاوەکەی بەیەکێك لە پاسەوانەکانی دا، جگە لەو کەسانەی کە شەویان لێرە بەرێکردبوو، ئەوانیدیکەش لەسەربازی و غەیرە سەربازی لە سپێدە دەمانەوە کەم کەم دەگەیشتن. دەستە دەستە قاوەیان لەگەڵ یەکدی دەخواردەوەو بەو جلوبەرگە جۆراو جۆرانەیان و چپەچپیان کەشوهەوایەکی خەمگینیان خولّقاندبوو، لەنکاو دەنگی ناسکی دیبلۆماتێك لە نێوان ئەو دەنگە دەنگەدا بەرگوێ کەوت، "ئێرە دەڵێیی کۆڕی پرسەیە."

هێشتا رستەکەی بە تەواوی لە دەم نەهاتبووە دەرێ کە بۆنی کۆلۆنیا سەرتاپای هەوای سالۆنەکەی پڕکردبوو، هاتەبەر لووتی ، هەربەو فنجانە قاوەی کە لە نێوان هەردوو ئەنگوستی گەورەو ئاماژەیدا گرتبووی لەسەر ئەم خەیاڵەی کە نەکا مۆتەکەیەك کە تازە هاتبووە ناو سالۆنەکە، گوێی لە ئیهانەکەی ئەو بووبێ، بە ناڕەحەتیەوە سەری خۆی بەرەو بەرامەی کۆلۆنیاکە وەرسوڕاند. بەڵام بەمجۆرە نەبوو، لەگەڵ ئەمەی کە ژەنەراڵ دواجار بەر لە بیست و چوار ساڵان لە هەرەتی لاویدا سەفەری ئەورووپای کردبوو، بەڵام لەبەر رابردووە پڕ لە گەورەیی و وێچوەکەی بەسەر کینە و درووژانیدا زاڵ بوو. لەبەرئەوەی هەوەڵ کەسێکی کەسەلاوی لێکرد، ئەو دیبلۆماتانەبوو و بە دەنگێکی لەسەرخۆ و پڕ لە رێزەوە کە شایستەی ئینگلیزەکانبوو گوتی: "هێڤیدارم ئەمساڵ پایزێ لە هاید پارك[1] هەواکەی زۆر تەمومژاوی نەبێ."

دیبلۆماتە ئینگلیزەکە بۆ چرکەیەك داماو دوو دڵ بوو نەیزانی بڵێ چی، چونکە لەم دوا دواییە ناوی سێ جێگای بیستبوو کە ڕەنگە ژەنەراڵ بچێتە یەکێك لەو سێ جێگایە کە هیچیان لە لەندەن نەبوون.

بەڵام زۆر زوو جڵەوی خۆیگرت و گوتی: "کارێکی وا دەکەم کە خۆر بۆ جەنابی پایەبەرزتان شەو و رۆژ بدرەوشێتەوە."سەرۆك کۆماری نوێ لەوێ نەبوو ، چونکە ئەنجوومەن ئەویان لە ئامادەنەبوونی هەڵبژاردبوو و لە مانگێکی پتر دەکێشا تا لە پوپاجانەوە بگاتە ئەوێ. ئێستا تا ئەو دەگەیشت ژەنەراڵ دۆمینگۆ کایسدۆیان وەك بریکاری سەرۆك کۆمار هەڵبژاردبوو، لە بارەی کایسدۆوە دەیانگوت کە هەموو پایەو پلەیەکی دەوڵەتی بۆ ئەو دەبێ، چونکە نەجیبزادەیی و رەسەنی خانەوادانێکی شایانەی هەبوو، ژەنەراڵ بەرێزێکی تایبەتەوە سەلامی لێکردو بە دەنگێکی تیزاوی و گاڵتە ئامێزەوە گوتی:

---

١ پارکێکی ناسراوی شاری لەندەنە

"ئایا ئێوە دەزانن کە من مۆڵەتی ئەوەم نییە لە وڵات بڕۆمە دەرێ؟ "ئەم رستە هەر هەمووی ناچاری پێکەنین کردن، لەگەڵ ئەمەشدا دەیانزانی سوعبەت نەبوو، ژەنەراڵ کایسیدۆ هەرێی دا [1] کە لەگەڵ پۆستی داهاتوو گوزەر نامەیەکی قانونی بۆ بنێرنە ئوندا.

ئەوانەی لە دانیشتنەکە بوون بریتی بوون لە قەشەی شار، برای بریکاری سەرۆك کۆمار و چەند کەسێکی ناسراو و خاوەنکار و هاوسەرەکانیان، خەڵکە ئاساییەکە چاکەتی چەرمیان لەبەرکردبوو و نیزامیەکان چەکمەی سوارەیان لە پێدابوو، چونکە دەیانویست ئەو نەجیبزادە دوورخراوە تا چەندین کیلۆمەتر بەرێ بکەن. ژەنەراڵ ئەنگوستیلەی قەشەی ماچکرد ، هەروەها دەستی خانمەکانیشی ماچکردو تۆقەیەکی ئاسایی لەگەڵ پیاوەکان کرد. ئەو مامۆستای بێوێنەی ئەمجۆرە کۆڕانە بوو، بەڵام بەدابی ئەو شارە ئاشنانەبوو و جارێك لەمبارەوە وتبووی: "ئێرە مەیدانی من نییە."بەهەر یەکێك لەوان بەهەمان شێوەی کە لە سالۆنی تووشیان دەبوو وەلامی سەلامی دەدانەوەو بۆ هەریەکێکیان رستەیەکی گونجاوی حازربەدەستی هەبوو کە لە کتێبەکانی ئادابی معاشەرەتکردن فێریان ببوو، بەڵام تەماشای چاوی چشتاقەکەسی نەکرد، دەنگی تۆکمەبوو، هەرچەندە تایەکەی هاتبوویە و کاری لێکردبوو، زاراوە کارییبیەکەی خۆی وێڕای ئەو هەموو سەفەرو جەنگانەی چەندین ساڵەی بە تەواوی پاراستبوو ئەمە بەتایبەتی بەرانبەری ناسکی و جوانی زاراوەی ئەو خەڵکە زۆر دروستکراو و ناخۆش دەهاتەبەرگوێ.

کاتێك سلاوکردنەکانی تەواوبوو، بریکاری سەرۆك کۆمار نامەیەکی دایە کە تێیدا ستایشی خزمەتەکانی بۆ وڵات کرابووە زۆر لە ئەفسەرە پایەبەرزەکان مۆریان کردبوو، وەك رێزو تەشریفات وای نیشاندا کە نامەکە دەخوێنێتەوە لە حاڵێدا کە چاوێلکەی لە چاو نەبوو و لەم حاڵەدا نەیدەتوانی هەتاکو نووسینێکی بەپیتی گەورەتریش بخوێنێتەوە. کاتێك بەرواڵەت خوێندنەوەکەی تەواوکرد، سوپاسی نوێنەرانی خەڵك و ئەفسەرانیکرد. قسەکانی ئەوەندە لەگەڵ نووسراو و حاڵ و بارەکەدا دەگونجا کە کەس بەخەیاڵیشی دانەدەهات، کە ژەنەراڵ ئەو نامەی نەخوێندۆتەوە. لە دواییدا چاوێکی خێرای لە خەڵکە ئامادەبووەکەی ناو سالۆنەکەی ئەوێکرد و بەبێ ئەوەی فزول و سەرنجی خۆی بشێرێتەوە پرسی:

"ئوردانتا نەهاتووە؟"

---

١ هەرێ: گفت: وەعددان

بریکاری سەرۆك کۆمار وتی کە ژەنەراڵ رافایل ئوردانتا بۆ پارێزگاری لە هێزەکانی ژەنەراڵ خۆزەلارنسیوسیلبا سەرکوتکردنی ئاژاوەگێڕان چووە، لەم چرکەساتەدا کەسێك بە دەنگێکی بەرزتر لەوانیدیکە گوتی: "سوکرەش نەهاتووە."ژەنەراڵ نەیتوانی ئەو هەواڵە نەویستراوەی کە بە ئانقەست بەبەرگوێیاندا هەڵدا، تەحەمول بکا، تا ئەو وەختە چاوەکانی مەنگ و خامۆش بوون، لە پڕ چەخماخەیەکی دڕندانەی تێدا بریسکاوە و بەبێ ئەوەی بزانێ کێ قسەکەی کرد وەڵامی داوە:

"لەوەختی ئەم سەفەرە ئاگاداری گەورە دەریا سالار ئاجاکوچویان نەکردبوو تا زەحمەت نەدەنە بەر ئەو."

تەنانەت مۆلەتی چونەوە ڤەنزویلاشیان بە دەریا سالار سوکرە نەدابوو کە وولاتی خۆیشی بوو، ژەنەراڵ ئاگای لێنەبوو کە ئەو دوو رۆژ پێشتر، لە مەئموریەتە سەرنەکەوتووەکەی گەڕابۆوە، کەس ئاگاداری سوکرەی نەکردبوو کە ژەنەراڵ دەڕوا، لەبەرئەوەی هەموو وایان بیرکردەوە کە ئەو یەکەم کەسێك بووە کە لەم بارەوە ئاگادارە خۆزەپالاسێوس لە کاتێکی خراپدا ئاگاداری مەسەلەکە بوو دوای ئەوەش لەبەر گرفتاریەکانی دوا کاتەکانی بە تەواوی لەبیری کردبوو و ئەم بیرکردنەوە ئازاریدەدا کە دەریا سالار لەمە ئاگادار نەکراوەتەوە لەبەرئەوە رەنگە نارەحەتبێ.

لە ژووری نانخواردنی تەنیشتەوە لەسەر مێزەکەدا تێشتێکی زۆرو باش ئامادەکرابوو پیراشکی[1] محەلەبی برنج، حەلوای ئارد، زۆر جۆرە نانی شیرینی لەسەر دەسماڵان قەڵاپەچنکراو لەگەڵ یەك قابلەمەی زلی پڕ لە شوکولاتی داغ و ئیشتیاکەرەوە خانەخوێکان تێشتەکەیان بەدواخستبوو ، بەڵکە وابێ و ژەنەراڵیش قبووڵ بکا بمێنێتەوە، لەگەڵ ئەمەشدا دەیانزانی کە ئەو بەیانیان جگە لە جۆشاوێکی گوڵەلالەی کێوی و کەتیرەی دارودرەخت بترازێ هیچیدی ناخواو ناخواتەوە. بەهەرحاڵ ئامالیا خانم ئەوی بانگهێشت کرد تا لەسەر کورسییەکی رەحەتی کە لە سەرەوەی شوێنی دانیشتنەکەدا بۆی ئامادەکردبوو، دانیشێ، بەڵام ئەو ئەم رێزلێنانەی قبووڵنەکردو بە زەردەخەنەیەکی روو لە هەمووان گوتی:

"رێگایەکی درێژم لەبەرە، نۆشی گیانی ئێوە بێ."

خواحافیزی لە جێگری سەرۆك کۆمار کرد. لەبەرئەوەی ئەو ویستی ژەنەراڵ لە باوەشبگرێ، ژەنەراڵ ناچار بوو لەسەر نووکی پێیەکانی بوەستێ، ئەمجارە بووە هۆی ئەوەی کە هەموو خەڵکەکەی ئەوێ سەرنج بدەنە ئەندامی بچکۆلەی ژەنەراڵ ، هەروەها سەرنج بدەنە ئەمەش کە لە کاتی ماڵئاوایی خواستن چەندە

---

١ پیراشکی : جۆرە نانێکی کە قیمە یان مرەبای تێدەکری و لە رۆن سووردەکریتەوە. گوشاد

بێدەنگ وتەنیاو ماتو مەلوول دەهاتە بەرچاوان، دوای ئەوەی تۆقەی لەگەڵ هەمووانکردو دەستی خانمەکانی ماچکرد، ئامالیا خانم هەوڵیدا تا هەواکەی خۆشدەکاو بارانەکەی دەوەستێ ژەنەراڵ لای خۆی بهێڵێتەوە، بەڵام ئەویش و ژەنەراڵیش باش دەیانزانی کە ئەم بارانە بەمزوانە ناوەستێ، جگە لەمەش ژەنەراڵ ئەوەندەی حەز لە رۆیشتن بوو کە دواخستنی ئەم کارەی بە ریسوایی دەزانی، خانەخوێ، لەژێر باراندا تا گەورەکە ژەنەراڵی بەرێکرد، بازوی ژەنەراڵی ئەوها بەسەری ئەنگوستەکانی گرتبوو کە دەتگوت شووشەیەکی بە دەستەوە گرتووە، بەڵام فیچقەی پاڵەپەستۆی ئەو خوێنەی ژێر پێستی هەستی پێدەکرا، زۆری سەرسوڕماند. حاڵەتی نەخۆشیەکەی لەگەڵ حاڵ و باری بێدارو باری لەشە لاوازەکەی هیچ پەیوەندیەکی گونجاویان لەنێواندا نەبوو. نوێنەرانی دەوڵەت، دەستەیەك لە دیبلۆمات و خەڵکی سەربازی، کە تا گۆزینگان لە قوڕ وەرچوبوون و رۆبەکانیان بەباران تەڕببوو، لە چاوەڕوانی ئەوەدابوون کە رۆژی یەکەم ژەنەراڵ بەرێبکەن و لەگەڵیدابن، بەڵام کەس بەرێکی نەیدەزانی کە کێ لەبەردۆستایەتی و کێ بۆ پارێزگاریکردنی و کێ بۆ دڵنیابوون لە رۆیشتنی هاورێیەتی دەکا.

ئەو وڵاخەی کە بۆ ئەویان دانابوو، باشترین وڵاخی ناو سەد سەر وڵاخی بەرزەبوو کە بازرگانێکی ئیسپانیایی بەرانبەر لەناوبردنی پەروەندی دزییەکانی بە دەوڵەتی دابوو. ئەو کوڕێژگەی کە جڵەوی قاترەکەی گرتبوو، و کێبەکەی بۆ پێشەوە هێناو ژەنەراڵ هێشتا پێیەکی لەناو ئاوزینەکەدابوو کە وەزیری جەنگ و هێزی دەریایی بانگی کرد: "جەنابی پایەبەرز."پێی لەناو ئاوزنگ و لە حاڵێکدا کە بە هەردوو دەستی زینەکەی گرتبوو جولەی لەبەربڕا.

وەزیر گوتی: "جەنابی پایەبەرز بمێنەوە و لە پێناو رزگارکردنی وڵات دوا هەوڵی خۆتان بدەن."

ژەنەراڵ وەڵامیداوە: "نا جەنابی هیرران، ئیدی وولاتێکم نییە خۆمی بەراگێری بکەم."

هەموو شتێك تەواو ببوو، ژەنەراڵ خۆزە ئەنتۆنیو دلاسن تیسمیاتری نیداد پولیڤار ئای پالاسیۆس بۆ هەمیشە و بەیەکجاری دەرۆیشت، هێزی ئیسپانیەکانی شکاندوەو ئیمپراتۆرێکی مەزنی پێنج هێندەی ئەوروپای دامەزراندبوو.

لە پێناوی ئازادی و پاراستنی یەکێتیدا بیست ساڵ جەنگیوە و تایەك هەفتە پێشی ئێستا بە دەسەڵات و تواناوە حوکمی کردبوو، بەڵام لە کاتی رۆیشتندا تا دڵی بەمەش خۆشنەبوو کە کارەکانی لەلایەن خەڵکەوە باوەڕیان پێکرابوو و قبوولکرابوون. تەنیا کەسێکی ئاگای لە بارو وەزعەکان بوو دەیزانی کە ژەنەراڵ بەراستیەتی سەفەر دەکاو بەمەبەستی ئەو پەی برد، ئەو دیبلۆماتە ئینگلیزە بوو کە لە هەواڵێکی رەسمیدا بۆ دەوڵەتی نووسی بوو، ئەو تەمەنەی کە ماویەتی بەشی ئەوەش ناکا پێی بگاتە ناو گۆڕەکەی."

## (٢)

تابۆ کەسێکی لە ژەنەراڵیش تەندروستتر رۆژێکی وەك یەکەمین رۆژی سەفەرەکە خراپترین رۆژی سەفەرەکەیانبوو، لەبەرئەوەی هەر لەو رۆژەدا لە شەقامەکانی سانتافە رووبەڕووی جوێندانو کینەی دوژمنانی بۆوە کەیف و مگێزی تێکچو. تازە لە ژێر بارانەکەدا رێگای خۆیان گرتبووە بەرو تووشی چەند گایەك ببوون. بەڵام کینە لە دڵی و لە تۆڵە گەڕانی دوژمنانی ئەو لە هەموو جێگایەکدا هەستی پێدەکرا. بە گوێرەی فەرمانی دەوڵەت کەدەبوو ژەنەراڵ بەشەقامە چۆلەکانی شاردا ببەن. لەگەڵ ئەوەشدا لەوێش هەندێ نووسینی لەسەر دیوارەکاندا دیت کە لە دژی خۆی نووسرابوون.

خۆزە پالاسیۆس بە جلّ و بەرگێکی رەشەوە کە لە ناو جەنگیشدا لەبەریدەکرد، لە تەنیشت ژەنەراڵەوە دەڕۆیشت. جلوبەرگەکەی پێکهاتبوو لە چاکەتێکی ئەسکیمۆی درێژ، قەرەوێتێکی ئاوریشمی کەسنجاقێکی بەسەرەوە بوو ئەویش مرواریەکی زەردی بەسەرەوە بوو، جووتێك دەستکێشی چەرم، سوخمەیەکی بە دەزووی رەنگ زێڕی درواوەو زنجیرێکی درێژی کە سعاتەکەی بەرباخەڵی پێوە شۆڕببۆوە، نەخش و نیگاری زینو رکێبی زیوین بوو و ئاورینەی لە زێر بوو، لەبەرئەمە بەلای کەمەوە لە دوو گوندان بە هەڵە ئەو بەسەرۆك کۆمار تێگەیشتن. بەڵام ئەم بەهەڵە چوونانە بەخێرایی چاکدەکرانەوە. لەبەرئەوەی تەواوی کاروانەکە بچووکترین فرمان و خواستەکانی ژەنەراڵی جێبەجێ دەکردو ئیدی جێگای دوو دڵی نەدەماوە. هەموو خزمەتکاران و پارێزەرانی ئەویان باشدەناسی و بە ئەندازەیەك خۆشیاندەویست کە حەزو ئارەزووی ئەویان بۆ هەڵاتن لەم شارە بە تەواوی هەست پێ دەکرد. ئەمە هەمان ئەو شارە بوو کە پێش ئەوە هەر تەنیا لەگەڵ بیستنی هەواڵی گەیشتنی ئەو لەو ناوە دەبوو بە ئاهەنگ و جەژن و سەماو خۆشی. سێ ساڵ پێشتر لە کاتی گەڕانەوەی لە جەنگەکانی باشوورو بە وەدەستهێنانی گەورەترین سەرکەوتن و لێهاتویی کە هیچ ئەمریکاییەك تا ئەو رۆژە بە دەستی نەهێنابوو، تەواوی خەڵکی شار ئاهەنگێکی پڕ لە شکۆیان بۆ گێڕا، هێشتا زەمانێك بوو کە خەڵکی لە

شەقامەکان جڵەوی ئەسپەکەیان دەگرت و ئەویان ڕادەگرت تا سکاڵا لە باری گشتی و دادگاکانەوە بکەن، یان هانای بۆ بهێنن تا یارمەتیان بداو یا هەر هیچ نەبێ تەنیا ئەو و شکۆو مەزنی ئەو شك ببەن. ژەنەراڵ بە ئەندازەی ئەوەی بایەخی بە کاروباری گرنگی دەوڵەتی دەدا ئەوەندەش بایەخی بە گیروگرفتەکانی خەڵکیش دەدا. شارەزایی زۆری لەمەڕ گرفتەکانی خێزان یان مەسەلە ئابووری و تەندروستیەکانیانەوە هەبوو. هەر کەسێك قسەی لەگەڵ ژەنەراڵ دەکرد وایهەست دەکرد کە بۆ چرکەساتێك شەریکی دەسەڵاتەکەی ئەوە. کەس لەو باوەڕەدانەبوو کە ئەو هەر ئەو مرۆڤەی ئەو زەمان و یان ئەم شارە غەمناکەیە، کە ئێستا وەك دوورخراوەیەك و بۆ هەتاهەتایە بە جێیدەهێشت، هەمان شاری جاران، شارێك بوو پڕ لە کۆڵانەی تەنگژە و خوارو خێچ کە ماڵەکانی یەك شێوەو دووکەڵکێشەکانی قاوەیی و باغچەی پڕ لە گوڵی هەبوو کە خەڵکی لەو باغچانە خواردنیان وەسەر ئاگر خستبوو، خەڵکی باش و ڕەفتار جوان بوون بە زاراوەیەکی کۆنی ئیسپانیولی دەئاخافتن کە چاکتر بۆ پەنامەکی مانەوەی قسەکانیان دەگونجا. ژەنەراڵ لە هیچ جێگایەکی دیکەدا، وەك ئەم شارە خۆی بە غەریب نەزانی. لەگەڵ ئەمەشدا ئەم شارە بەستەڵەکاوی و کوێستان بوو بای ساردی هەبوو، ژەنەراڵ تا بەرلەوەی ئەو شارە ببینێ، بۆ زیادکردنی شکۆو گەورەیی خۆی هەڵیبژاردبوو، لەهەموو شارێکی دیکە پتر ئاشقی ببوو و لە بیرو خەیاڵی خۆی بە کوانووی ژیانی خۆی و پایتەختی نیوێکی دنیای دانابوو، بەڵام لەم کاتەدا خڕی ئەم بیروهزرانەی وەك گاڵتەهاتە بەرچاوان.

کاتێ کە بیری لێدەکردەوە خۆی لە هەموو کەسێك زێتر سەری دەسوڕما، دەوڵەت تا لەو ناوچانەشدا کە هێندەی ترس لێنەدەکرا. پاسەوانی داناوەو هەر ئەمەش ببووە هۆی ئەوەی تا ئاژاوە گێڕانی کە دوای نیوەڕۆی ڕۆژی پێشوو کۆتەڵی ژەنەڕاڵیان هەڵواسیبوو، نەتوانن بێنەدەرێ و هات و هاوار بنێنەوە. بەڵام بەدرێژایی ڕێگا هات و هاوارێك دەگەیشتەگوێ:

"هەی بەرازی چەپەڵ."تەنیا کەسێکی کە بەزەیی پێداهاتەوە ژنێك بوو کە بەدیتنی ئەو گوتی: "هەی مۆتەکە، برۆ بە تەمای خوا."هەموو وایان خۆنیشاندا کە گوێیان لێنەبووە. ژەنەراڵ لەناوبیرکردنەوەدا ڕۆچوو بەجۆرە دابڕاو لەم جیهانە، خەریکی لێخوڕینی وڵاخەکەی بوو تا گەیشتنە دەشتاییەکی جوان و بەرگوشاد. لە شوێنێك کە کئاتروئەسکیناسی ناوبوو و لەوێوە جادەیەکی بەردرێژ دەستی پێدەکرد، مانوێلاسنز تەنیا، بە سواری ئەسپێکەوە چاوەڕێی کاروان بوو لەگەڵ چاوی بە ژەنەراڵ کەوت، وەك دوا سڵاو درود لە دوورەوە دەستی بۆ هەڵبڕی و

تەکانیدا. ژەنەراڵیش دەستی بۆ هەڵبڕی و تەکانیدا و ڕێگەی خۆی گرتەبەر. ئیدی قەتاو قەت جارێکی دیکە یەکدیان نەدیتەوە.

کەمێك دواتر باران کژی دایە[1] ئاسمان شینێکی بێگەرد هەڵگەڕاو دوو لووتکەی بەبەفرداپۆشراو لە ئاسۆدا وەدەرکەوتن کە تا ئێوارە ئەو ڕۆژە هەر لەو شوێنەدا مانەوە. بەڵام ئەم کایەیان هیچ نیشانەیەکی پەیوەندی و خۆشەویستی ژەنەراڵ بە سروشتەوە نەدەدیترا یەکبین و بە تیژی شار و لادێیە بچووکەکانیان بڕی، بەڵام ژەنەراڵ نە سەرنجی شارەکانیدەدا و نەبەو خەڵکانەی کە بەبێ ئەوەی ئەو بناسن ماڵئاواییان لێدەکرد. لە هەمووان سەیرتر ئەوەبوو کە هەتا تەماشایەکیشی لە ڕەوە ئەسپ و ئەوانەش کە دەیانلەوەڕاندن نەکرد، لەگەڵ ئەمەی زۆر جاران خۆی گوتبووی کە ئەم دیمەنەی لە هەموو دیمەنێکی دی لەکن شیرنترە.

لە گوندی فاکاتاتیبا[2]، ئەو مەنزڵگەی یەکەم شەو تێیدا حەوانەوە، ژەنەراڵ لەو کەسانە خواحافیزی کرد کرد کەبۆ کاتێکی کەم بۆبەڕێکردنی هاتبوون و لەگەڵ سەربازو کەسەکانی لەگەڵیدا بوون درێژەی بەسەفەرەکەیدا. بێجگە لە خۆزە پالاسیۆس پێنج کەس بوون. ژەنەراڵ خۆزە ماریاکانیۆ، کە لە جەنگێکدا بازووی ڕاستی لە دەستدابوو، یارمەتیدەرە ئێرلەندیە تایبەتەکەی سەرهەنگ بەلفۆر هینتۆن ویلسۆن کوڕی جەنابی رابەرت ویلسۆنی ژەنەراڵی سابیقەداری کە وەبگرە لەسەرپاکی جەنگەکانی ئەوروپادا بەشداری هەبووە ، فرنادۆی برازای یاریدەرو مونشی تایبەتی بە پلەی ملازم یەکێك لە خزم و یارمەتیدەرەکانی کاپیتان ئەندرس ئیبارا کە دوو ساڵ پێشتر لە هەڵمەتی ڕۆژی بیست و پێنجەمی ئەیلوولدا دەستی ڕاستی بەزەبری شمشێر ئیفلیج ببوو و دواکەسیش سەرهەنگ خۆزە دلاکرو زپاردس بوو کە سەردەمێك لە جەنگەکانی سەربەخۆییدا زۆرجاران و لە کات و ساتی جیاجیادا دڵسۆزی و وەفاداری خۆی بۆ ئەو سەلماندبوو. پارێزەر و پاسەوانە تایبەتی و هەڵبژاردەکانی سەد کەس بوون کە لە چێترین زەلامی پیادەو سوارەی نیزامی ڤەنزویلا دەستبژێرکرابوون.

خۆزە پالاسیۆس بە باشی چاودێری ئەو دوو سەگەی دەکرد کە لە جەنگی ئالتۆپیرۆ بە تالان دەستیان کەوتبوو، سەگی جوان و ئازا کە تا شەوی هەوڵدانی کوشتنەکەی ژەنەراڵ کە دوو دانەیان لە سەگەکانی دیکەی بەچەقۆ کوشت. لە کۆشکی دەوڵەتی لە سانتافە پاسیان دەکرد.

---

١ کژی دایە: خۆشی کرد، بڕاوە.

٢ گوندێکی کۆلۆمبییە.

له سەفەرە بێکۆتاییەکان لە لیماوە بەرەو کیتۆ، لە کیتۆوە بەرەو سانتافە لەوێوە بەرەو کاراکاس و دووبارە گەڕانەوە بەرەو کیتۆ و گواجاکیل ، ئەم کسۆکانە[1] پێبەپێی ئەسپ و قاترەکان ڕێیاندەکردو پاسەوانی کەلوپەل و ئەشمەکەکانبوون. لەم دواسەفەرەش لەسانتافە هەمان کاریاندەکرد، هەرچەندە شمەکێکی زۆر لە گۆڕێ نەبوو و سەرەڕای ئەویش سەربازەکان چاودێریاندەکرد. ژەنەراڵ بەمگێزێکی ترش و تاڵەوە لە فاکاتاتیبا لە خەو ئاگای بۆوە، بەڵام لەو کاتەی کە لە جادەو ڕێگایەکی هەڵەمووتدا نشێو دەبوونەوەو هەواکەشی بەرەو خۆشی دەچوو، حاڵ و باری ژەنەراڵ باشتر بوو، ئەفسەرەکان کە لە خەمی تەنی لاوازو بێتوانای ئەودابوون و زۆرجاران داوایان لێکرد پشوو بدات، بەڵام ژەنەراڵ بەباشتری زانی کە بەبێ وەستان تا وەختی فراوین لە سەفەرەکەیان بەردەوامبن دەیگوت سواری بۆ بیرکردنەوە زۆر لەبارە جاری وا دەبوو بۆ ماوەی چەند شەو و ڕۆژان بەسەر پشتی وڵاغەوەبێ تەنیا ئەسپ یان بارگیرەکەی دەگۆڕی تا ئاژەڵەکە لە پەلوپۆ نەکەوێ. هەروەك سوارە بە ئەزموونەکان ئەژنۆکانی دەچەمانەوە و خۆی کووڕ دەکردەوە هەر بە ڕێگاوە دەبوو هەروەك کەسانێك کە کۆڵەپشت بە کۆڵێوە دەکەوتنەخەو. لە کەفەڵی پینەیەکی گەورەی وەك پولەکەی ماسی پەیدابببوو و لەبەرئەمە نازناوێکی شایستە "کەفەڵ ئاسنین"یان پێدابوو لە زەمانێك کە جەنگەکانی سەربەخۆیی دەستیان پێکردبوو. بەدرێژایی هەژدە هەزار ئەلکو[2] بەسواری وڵاغ ڕۆیشتبوو کە دەکاتە پتر لە دوو جاران بەدەوری دنیادا بخولێتەوە. هیچ کەسێك قەت ئەم ئەفسانەی ڕەتنەدەکردەوە، کە ئەو بە سواری لەسەر پشتی وڵاغ دەنوێ.

پاش نیوەڕۆ کاتێك کە قرچەی گەرما هەستی پێکرا، لە دێرێك[3] لەو نزیکانە مەنزلیان لێهەڵدا. دایکە روحانی ئەوێ ... خۆی چوە پێشوازیان و باوەشی بۆ کردنەوەو خزمەتیکردن و تاقمێك لە و ڕەبەنەکان شیرینی بادەمی کە تازە لەسەر ئاگر داگیرابوو بە قابلەمەیەکی پڕ لە گەنمەشامیەوەیان بەسەر سەریاندا هەڵدا[4] هەرکە دایکە ڕەبەنەکە چاوی بەوسەربازانە کەوت کە شەلاڵی ئارەقە بوون و بەناڕێکی جلەکانیان لەبەرکردبوو وایزانی کە سەرهەنگ ویلسن ئەفسەری گەورەو ڕێبەریانە، چونکە

١ کسوك: سەگ

٢ ئەلگو" ئەلگو: بەرانبەر بە پێنج هەزارو پێنج سەدو حەفتا و دوو مەترو حەفت سانتیمەترە.

٣ دێر: لە باتی صومعە بەکارهێنراوەو ئەو خانوەی راهیبەکان تێیدا دەژین .

٤ فارسیەکەی دەلێ لە نێوانیان هەڵدا، بەلاَم لای ئێمە شیرینی بەسەر بوك یان میوانێکی ئازیز بەسەر سەرا هەڵدەدرێ.

ڕێکو موزەردە بوو جلی سەربازی ڕێکتری لەوانیدیکەی لەبەردابوو و میدالیایەکی پتری پێوە بوو . لەبەر ئەمە لەگەڵ ئەودا بەرخوردو پەیوەندیەکی بەرێزو ڕەفتارێکی ژنانەی تایبەتی پەیداکرد کە بووە هۆی ئەوەی قسەو قسەلۆکی لێبکەوێتەوە.

خۆزە پالاسیۆس لەم بەهەڵەداچوونەدا سوودی وەرگرت و ژەنەراڵی بۆ بەر سێبەری درەختێك برد تا پشووێکبدا پەتۆێکی خووری تێوەرپێچا تا ئارەقەبکاو تایەکەی بڕەوێتەوە یەکێك لە خوشکە راهیبەکان کە بە تەمەنتر بوو، چەنگی دەژەنی و دەستەیەکی دیکەیان گۆرانی ئەویندariyان دەچڕی. ژەنەراڵ نەخەوی لێ دەکەوت و نەزادی دەبڕی هەر بەجۆرەی کە لە ژێر درەختەکە راکشابوو گوێی بۆ گۆرانییەکان هەڵخستبوو. دواکەس یەکێك لە خوشکە راهیبەکان بەو کلاوەی کە بە دەستەوەی بوو بە دەوری دێرەکە خولیداوە تا بۆخۆیان سەدەقە کۆبکاتەوە. ئەو خوشکەی کە چەنگی دەژەنی گوتی:

"ئەو نەخۆشە سەخڵەت نەکەی. بەڵام خوشکە ڕەبەنەکە گوێی بە قسەکەی نەدا. ژەنەراڵ بە بێی ئەوەی تەماشایەکی بکا بە زەردەخەنەیەکی تاڵەوە گوتی، کچی خۆم من خۆم خێروسەدەقەم پێدەشێ."ویلسۆن بە ناڕەحەتیەوە سەدەقەیەکی لە باخەڵی خۆیدایەو ئەمەش بووە جێی گاڵتەپێکردن لەلایەن ژەنەراڵەوە کە گوتی:

"ئێستا دەبینی کە شکۆ و گەورەیی چەندەی ئەرکو خەرجی هەیە."ویلسۆن پاشترێ ددانی پێداهێنا کە زۆر سەری سوڕماوە لەمەی کە نەلەدێرێ [1] نە لە تەواوی ڕێگاکەدا بەنێو بانگترین پیاوی وولاتیان نەناسی. بەبێی هیچ گومانێك ئەمە دەرسێك بوو بۆی بوو بە پەند.

ژەنەراڵ گوتی: "من چیدی خۆم نیم."

لەگوا دواس [2] دۆستانی ژەنەراڵ چاویان لە ڕێی بوو تا ئاهەنگێکی بۆ سازکەن، بەڵام ژەنەراڵ توانای ئەمەی نەبوو و شەوی دووەمیشی لە ماڵێکی نزیکی گوادواس ڕۆژکردەوە. کە کۆنە کارخانەیەکی تووتن بوو بەڵام ببووە خانوپەناگەی ڕێبوارو موسافیران. خانووێکی لەندەهۆر و تاریك کە تا هەڵکەوتەی جوگرافیشی پڕ لە ترس بوو. گیاکەلەیەکی زۆر و خۆڕسك ئەو ناوەی داگرتبۆوەو رووبارێکی مەنگ کە ئاوەکەی ڕەشدەچۆوە و تاڤگەی ترسناکی کە هاژەو هاڕەی ئاوی تاڤگەکانی تا باغەمۆزی زەویە گەرمەکان دەچوو، بەوێدا تێدەپەڕین، ژەنەراڵ ئەو شوێنە

---

١ دێرێ: کەنیسە.

٢ گوادواس: شارێکی بچوکی کۆڵومبیە.

شارەزابوو و جاری یەکەمی کە بەو ناوەدا رادەبورد.گوتبوی: "ئەم شوێنە جێیەکی زۆر لەبارە بۆ بەسەردادانی کتوپڕ."ژەنەراڵ لە کاتی ئاساییدا هەوڵیدەدا کە بەم ناوەدا تێنەپەڕێ، لەبەرئەوە کە رێگای بروئکوسی بەبیری خۆیدەهێناوە، ئەو رێگایەی سەر رێگای کیتۆ کە تاوەکو بە ئەزموون و شارەزاترین و ئازاترین پیاوان هەوڵیاندەدا کە نەدەنەوە ئەو رێگایە جارێك بە پێچەوانەی بۆچوونی هەمووان لە دووڕیانی دولگوا لەم دەڤەرەدا هەڵیدابوو، لەبەرئەمە بیری دەکردەوەو کە ئیدی ناتوانێ باری غەماوی و ترسناکی دەڤەرەکە تەحەمول بکا. بەڵام ئەمجارەیان بەهۆی کەنەفتی نەخۆشیەوە و لەتاو گڕی تاکەی گیانی ئەم شوێنەی لەبار زانی، چونکە نەیدەتوانی دڵسۆزی دۆستەکانی لەگوادوئاس ئەحەمول بکا.

خانەخوێ کە ژەنەراڵی لەم بارەدادیت کە جێی بەزەیی پێداهاتنەوە بوو، پێشنیازیکرد کە لە خەڵکانی گوندێکی ئەو نزیکانە بانگی سورپێستێك[1] بکا. ئەم سورپێستە تەنیا بە بۆنکردنی یەکێك لە کراسەکانی نەخۆش و بێئەوەی کە هەرگیز ئەوی دیتبێ نەخۆشیەکەی لێدەپەڕێنێ. ژەنەراڵ ئەمەی بە گاڵتەوە وەرگرت و فەرمانیدا کە هیچ کەسێك بەسەرو سۆراغی سورپێستی نەیرەنگبازدا نەچێ. تا بەوە گەیشت دکتۆرەکانیشی رەتدەکردەوەو دەیگوت ئەوان مرۆڤ پتر نەخۆشدەکەن. ببڕای ببڕ نەیدەتوانی باوەڕ بەسورپێستێکی وڵاتەکەی خۆی بکا. سەرەنجام لەبەرباوەڕنەبوونی بە زانستی پزیشکی ژوورێکی نوستنی کە لە پێشەوە بۆیان ئامادەکردبوو و بۆ تەندروستی ئەو لە هەموو لایەنێکەوە گونجاو بوو، قبولۆی نەکردو فەرمانیدا تا جۆلانەخەوەکەی لە سالۆنە گەورەکەدا هەڵواسن. لەو سالۆنەوە لەبەرانبەری خۆی زنجیرە چیایەکی دەدیت و ژەنەراڵ دەکەوتە بەرترسی شێ و گۆڕانی هەوا.

لەو جۆشاوە بترازێ کە بەیانی زوو خواردبوویەوە بەدرێژی رۆژەکە دەمی بۆ هیچی دیکە نەبرد و تەنیا بۆ رێزگرتن لە ئەفسەرەکانی لەسەرخوانی شێوی ئێوارە دانیشت. لەگەڵ ئەوەی کە باشتر لە هەر کەسێکی دیکە لە سەختیەکانی بەروبارگە بەکۆڵێوەی و سەفەرێ ئاگاداربوو و ددانی بەخۆیدا دەگرت و لەگەڵ ئەوەی کە لەکەمخۆریدا لە خەڵوەتچیەك دەچوو، بەڵام هونەری چێشلێنان و دابی نان خواردنی وەك ئەوروپاییەکی رەسەن دەزانی و هەر لەو سەفەرەی یەکەمیدا شێوەی ئاخافتن لەبارەی خواردن لەکاتی نانخواردندا فێرببوو. ئەو شەوە تەنیا نیو پەراخ شەرابی سوری خواردەوە و کەمێکی لەو خۆراکەی کە لە گۆشتی مامز لێندرابوو،

---

[1] سورپێست: مەبەست ئەو مرۆڤانەیە کە رەگەزی پێست سوریان پێدەڵێن.

تاقیکردەوە لەبەرئەوە خانەخۆێو ئەفسەرەکانی دەیانگوت کە گۆشتی مامز تامی گوڵی یاسی لێدێ. بەدرێژایی دانیشتنەکەی لەسەر سفرەی نانی ئێوارە دوو رستە زیاتری نەگوت ئەویش بەبێحاڵیو پەژارەیی کە هەر قسەکانی بەدرێژی سەفەرەکەی کردبوو گوتبۆوە. بەڵام هەموویان زانیان کە مەبەستیەتی ئەو سرکە ترشەی کە بەهۆی نەخۆشی و پێشهاتەخراپ و بەدبەختیەکانیەوە دروستبوون، بەیەك دوو رستەو کردار شیرینی بکا. پیاوێکی کە تا دوای ساڵانێك نەیدەتوانی رق و کینەکانی لەبیر خۆی بباتەوە ئەمجارە یەك وشەی لەمەڕ سیاسەتەوە لە دەم نەهاتەدەرێ و لەمەڕ رووداوەکانی رۆژی شەممەوە دەمی لێك هەڵنەپچڕی.

بەر لە تەواوبوونی نانخواردنەکە مۆڵەتی خواست کە مێزەکە بەجێبێڵێ و بەتای کراس و کڵاوی خەوو تاولەرزەوە، خۆی فڕێدا ناو جوولانەکەوە. هەوای ئەوشەوە خۆش و سازگار بوو و مانگی رەنگ نارنجی گەورە لە پشت چیاکانەوە هەڵدەکشا، بەڵام ژەنەراڵ هیچ ئارەزوویێکی تەماشاکردنی ئەم دیمەنە جوانەی نەبوو. سەربازانی پاسەوانی لە نزیکیساڵۆنەکە بە کۆمەڵ تێیانهەڵکردبووە گۆرانی. ژەنەراڵ زۆر لەوەو پێش فەرمانیدابوو کەسەربازەکانی، هەروەك سەربازانی ژولیوس سیزار، لە نزیك شوێنی خەوەکەی ئەودا بحەسێنەوەو تاکو لەقسەکانی ئەوان بتوانێ پەی بەبیرکردنەوەو حاڵ و باریان ببا، بێخەوی شەوانەی ئەوی بۆ شوێنی نووستنی سەربازەکانی پەلکێش کردبوو و هێندەی سروودی سەربازی لەگەڵ گوتبوون لە هەندێ جێگایاندا سروودەکانی بەشێوەیەکی پێکەنیناوی دەگۆڕی و زۆر شەوان بەم تەرزە رۆژی دەکردەوە. بەڵام ئەو شەوە دەنگی گۆرانییەکانی ئەوانی تەحەمول نەکرد و فەرمانیدا بێدەنگبن، بەڵام لە هاڕەو هاژەی پێکداهاتنی شەپۆلی ئاوو گابەردەکان تایەکەی ژەنەراڵ گەرمتر دەبوو، حاڵ و باری ئەوی خراپتر دەکرد. هاواریکرد: "بەنەفرەتبێ، کاشکێ دەکرا ئەم دەنگە بۆ دەقەیەك کپ کەمەوە."

بەڵام لەتوانادا نەبوو: "ئیدی چارەنووسی هەر ئەمە بوو نەدەگۆڕدرا، خۆزەپالاسێوس دەنکە حەبێکی ئارامکەرەوەی بە ژەنەراڵ دا، بەڵام ژەنەراڵ رەتیکردەوەو وتی: "بەو دەرمانە هێلنجدەرەی کە بە هەڵە بۆیان نووسیبووم هێزم تێدانەما، بەڵام ئامادەنیم گیانیشم لە دەستبدەم."ئەمەیان بۆ یەکەمجار بوو کە خۆزە پالاسێوس رستەی وای لێدەبیست. چەند ساڵێك پێش ئێستا هەوڵیدا کە (تا) دەم نا دەمەکەی بەشەربەتێکی گیراوە لە مەرگەمووش چارەسەربکا، بەڵام خەریك بوو ژەنەراڵ لەبەر سکچوونێکی بێئەندازە گیانی دەرچێ. لەو وەختەشدا وتبووی کە ئامادەنییە بۆ دەرمان گیانی خۆی لە دەستبدا. لەو وەختەدا دەرمانێکی

که قبولێدەکرد چەند حەبێکی ڕەوانکەر بوو کە بەهۆی نەخۆشیەکەی و باش حاڵێنەبوونی هەموو هەفتەیەك چەند دانەیەکی لێیان قوتدەدا و حەبێکی ڕەوانکەری دیکەی بەناوی (سنا) کە لە کاتی نەخۆشیە درێژخایەنەکەی کەڵکی لێوەردەگرت قوتدا.

نیوەشەو کەمێکی لێڕابردبوو کە خۆزە پالاسیۆس، نەخۆش و تێماو لەسەر خشتەکانی ژووری سالۆنەکە ڕاکشاو خەو بردیەوە. هەر کە بەئاگاهاتەوە، ژەنەراڵ کراسەکەی کە شەلاڵی ئارەقە بوو، لەسەر زەوی ژوورەکە فرێیدابوو ناو جۆلانەکەی جێهێلا بوو، بەلاّم ئەمە کارێکی سەیرو نوێ نەبوو. هەر کە کەس لە ماڵێ نەدەبوو، بۆ سەر گەرمبوون لە کاتی خەولێهەڕمان خوی بەوە گرتبوو ناو نوێنی خۆی بەجێهێڵێ و بە رووتوقووتی لە ماڵەوە پیاسە بکا، بەلاّم ئەو شەوە هۆی زێتری بۆ نیگەرانیەکەی هەبوو، وێڕای ئەمەی ڕۆژی ناخۆشی گوزەراند بوو ئەم هەوا شێدارو فێنکەش بۆ پیادەڕۆیین لەبارنەبوو، خۆزەپالاسیۆس پەتۆبەدەستەوە لەژێر تریفەی مانگدا بەدوای ژەنەراڵ گەڕاو ئەوی وەك کۆتەرێك لە قەبرستانێکدا لەسەر کورسی کەنار ڕێڕەوەکەو بە ڕاکشاوی دۆزیەوە. ژەنەراڵ رووی بەلای خۆزەدا وەرگێڕا. لەو تەماشایەی هیچ نیشانەیەکی (تا) و نەخۆشی نەدەدیترا.

ژەنەراڵ گوتی: "هەر لەو شەوە دەچێ کە لە (سن خوئان دپاچارا) بووین، بەلاّم بەداخەوە بەبێی شاژن مارسالویزا، خۆزە پالاسیۆس ئەو شەوەی باش لەبیربوو. شەوێك لە شەوانی مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٨٢٠ بوو کە ژەنەراڵ بەخۆی و دوو هەزار پیاوی لەشکرەکەی گەیشتبووە دێیەکی لاچەپی ناوچیاکانی ئاپۆرەی ڤەنزویلا، لەنوێ هەژدە پارێزگاو ناوچەی لەژێر دەسەلاّتی ئیسپانیاییەکاندا ئازادکردبوو.

لەگەڵ ئەوەی ولاّتی نوئباگرانادا و سەرۆکایەتی کۆماری ڤەنزویلا و کیتۆ کۆماری کۆلۆمبیای دامەزراندو ببووە فەرماندەی بەراستی لەشکرو یەکەمین سەرۆك کۆماری ئەو ولاّتە. دوا ئارەزووی درێژەپێدانی جەنگ بەرەو باشوور بوو تابتوانێ بەخەون و خەیاڵەکەی کە دامەزراندنی مەزنترین حکومەتبوو بهێنێتەدی، ولاّتێکی ئازادو یەکگرتوو لە مەکسیکەوە تا کابۆدوائورانس [1] بەلاّم ئەو شەوە پلەو پایەی سەربازی ئەوەندە نەبوو کە بتوانێ بیر لە هێنانەدی ئەو خەونەی بکاتەوە، نەخۆشیەکی درم و ترسناك بلاّوببۆوە و زۆر بەخێرایی کە تا ئێستا بەدرێژایی چواردە لگوا بلاّوببۆوە زۆر لە ئەفسەران کە نائومێدببوون و لە فەرمانەکان

---

١ دووترین خاڵی باشوری ئەرژەنتین.

سەرپێچیاندەکرد و یان دزیاندەکرد. ژەنەراڵ گەفی تیربارانکردنیانی کردبوو بەڵام گاڵتەیان بە گەف و گوڕەکەی کردبوو، دوو هەزار سەرباز بە جلوبەرگی تیتی [1] و بەپای پەتی، بەسەڵتی و بەبێ چەك و خواردن و یان پەتۆیێك کە لەم سەرمایە خۆیانی پێداپۆشن، ماندوو لە دەست ئەو هەموو جەنگە بە خۆشیەکی زۆرەوە دەستە دەستە لە سوپا رایاندەکرد.

ژەنەراڵ کە هیچ رێگاچارەیەکی نەدۆزیەوە. فەرمانیدا بوو کە ئەگەر پاسەوانێك سەربازێکی راکردوی گرت و دایەوەو دەستمان ئەوا دە پزوی وەك دەستخۆشخانە بدەنێ. جگە لەمەش فەرمانیدابوو کە سەربازی راکردوو بەبێ دادگاییکردن گوللە بارانکەن.

ژیان فێریکردبوو کەوا هیچ تێکشکانێك دواشکست نابێ، پێشی دوو ساڵان کاتێك کە لەگەڵ سەربازەکانی لەناو جەنگەلی ئۆرینوکو [2] ونبوون، ژەنەراڵ لەترسی ئەوەی کە نەبادا سەربازەکان یەکدی بخۆن، فەرمانیدەرکرد کە ئەسپەکان بکوژنەوەو بیانخۆن، بەقسەی ئەفسەرێکی بەریتانی لەو سەردەمەدا رواڵەتی شەڕانییەکی گەلحۆی پێوەبوو، کڵاوی خوزەی روسی لەسەرنابوو، پێڵاوی وەك قاپقایی لەپێو رۆبێکی درێژی شین و خەت سوور و قوپچە زێڕینی لەبەردابوو. نێزەیەکیشی بەدەستەوەبوو کە ئاڵایەکی بچووکی هەردەم شەکاوەی بەسەری نووکەوە بوو کە وێنەی پەیکەرێکی ئێسقانو دووهێسکی راستوچەپ بەسەر یەکدیدا هاتووی لەسەر نەخشکرابوو و بەچەند پیتێکی سوور لەسەری نووسرابوو، ئازادی یان مردن، ئەو شەوەی کە لە سن خوان و پاجارا بوو رێکپۆشتربوو، بەڵام حاڵ و باری لەو زەمانە باشترنەبوو، ئەو نەك هەر تەنیا گوزارشتکەری باری لەشکەرەکەی خۆیبوو، بەلکەلە باری پڕ لە داخ و مەخابنی تەواوی لەشکری ئازادیخواز بەرپرسیاربوو، هەر ئەم سوپایەش زۆر جاران دوای شکستیەکانی دووبارە هەلسابۆوە سەر پێیان و لەگەڵ ئەمەشدا لەژێر باری ئەم هەموو سەرکەوتنانەدا توانای تەحەمولی نەمابوو. لەبەرانبەر ئەم سوپایەدا. ژەنەراڵی ئیسپانیایی، پابلۆمۆریجۆ، لەگەڵ لەدەستدابوونی تێکڕایی ئامرازو ئاسانکاری لە پێناو سەرکوتکردنی نیشتمانپەروەران و گێڕانەوەی یاسا، هێشتاش بەشێکی زۆر بەرگوشاد لە رۆژئاوای ڤەنزویلای لەژێر دەسەڵاتدابوو و بنکەو سەربازگەکانی خۆی لە نێو شاخ و کێوەکاندا توندکردبوو.

---

١ تیتی : پارچە پارچە بۆ جلوبەرگ و پەرۆ بەکاردەهێندرێ یان بۆگونیە و جواڵ و رەشکەی کا.

٢ ئورینۆکۆ: جەنگەلێکە لە ڤەنزویلا.

لەناو ئەم بار و وەزعانە ژەنەراڵ بۆ زۆرانبازی لەگەڵ بێخەویدا لە ژوورەکانی ئەو ماڵە گەورەدا کە بە تریفەی مانگ رووناکبۆوە، دەهات و دەچوو، زۆربەی ئەو ئەسپانەی کە رۆژی پێشوو مردارببونەوە. لە دووری ماڵێ ئاگریان تێپەڕدابوون، بەڵام تا ئەو وەختەش بۆگەنی ئەوان لە توانابەدەر بوو. لە حەفتەی پێشووکە حەفتەیەکی گەلێ دمۆر[1]و خوێناوی بوو، سەربازان هیچ گۆرانیەکیان نەگوتبوو، تا ئەوەی ژەنەڕاڵ دڵیشی نەدەهات پاسەوانەکانی کە لە تاو برسیەتی خەو بردبوونیەوە، بەئاگابێنێ. لە هیکرا لە بنەبانی یەکێك لە سالۆنەکان شازادە ماریالویزای[2]دیت کە لەسەر کۆسپەی قادرمەکان دانیشتبوو. ئەو کچێکی دوورەگەی زۆر جوانبوو لە نێو سالآنی پێگەیشتن و بالقابووندا بوو.

چەرچەفێکی گوڵگوڵی درێژی لەخۆی ئالآندبوو و جگەرەیەکی چرووتی دەکێشا. بەدیتنی ژەنەراڵ ترسی لێنیشت و نیشانەی خاچێکی بەدەستی کێشا.

کیژەکە گوتی: "لەلای شەیتان هاتووی یان لەلای خواوە؟ چیتدەوێ؟"ژەنەراڵ وەڵامیداوە،"چیم بوێ باشترە؟"

ئینجا پێکەنی و کچەکە درەوشانەوەی ددانەکانی لەژێر رووناکایی تریفەی مانگدادیت، ژەنەراڵ داوای لێکرد نەبزوێ و ئەوەندە لە تەوێلوچاو و گۆناو گەردنی راما تا ئارامیگرت و سوکنایی هات. داپیرەی کە لەگەڵ ئەودا لە ژوورێك دەنووست. شەوانە جلوبەرگەکانی لێدەشاردەوە تا نەتوانێ بۆ جگەرە کێشان قیتبێتەوە. بێئەوەی ئاگای لەمەبێ کە هەمیشە بەرەبەیانیان چەرچەفی لەخۆی وەردەپێچاو خۆی دەدزیەوە. کچەکە کە لەتەماشا حەپەساوەکانی ژەنەراڵ ترسابوو، گوتی: "قوربان من کارەکەرێکم."

هەربەیانی ئەو رۆژە ماریالویزای لە خاوەنماڵەکە کڕی و بەبێ هیچ مەرجێك ئازادی کرد. لەبابەتی ئەو کچە سەد پزوی لە گیرفانی خالی خۆیدا. بەڵام بەرلەوەی ئەوێ بەجێبهێڵی لە توانای دا نەما و مەسەلەیەکی هێنا گۆڕێ[3].

---

[1] دمۆر: نحس

[2] هەر بەروالەت ژەنەرال ئەوی بە شازادە وێنادەکرد.

[3] نازانم بۆ ئەو رستەیە پەیوەندیدار بەرستەکانی دیکەوە نابینم.

ئەفسەرەكان سواری ئەو ئەسپانەبوون كە مابوونەوەو لەگەڵ ژەنەراڵ لە حەوشەی ماڵێدا لە چاوەڕوانیدا مانەوە. هەروەها سەربازەكانی دیكەیشی بە فەرماندەیی ژەنەراڵ خۆزە ئەنتۆنیۆپائز كەشەوی پێشتر گەیشتبوون لەگەڵ ئەوان یەكیانگرتەوەو هاتنە پاڵیان.

ژەنەراڵ بە كورتە دوانێك ماڵئاوایی خواست و كاتێك ئامادەی رۆیشتنبوو لەپڕ چاوی بە شاژن ماریالویزا كەوت ئێستاكە ئەو ژنێكی ئازادبوو، تازە لە حەمام هاتبووە دەرێ و زۆر جوانو بەرەنگو ڕوو دەهاتەبەرچاوان.

كراسێكی سپیو بلوزێكی وەك هی كارەكەرانی لەبەردابوو، ژەنەراڵ بەزیرەكیەوە لێیپرسی:

"لێرە دەمێنیەوە یان لەگەڵ ئێمە دێی ؟"

ئەو بەزەردەخەنەیەكی شیرینەوە وەڵامیداوە:

"سەروەری من، هەر لێرە دەمێنمەوە."

ئەم وەڵامە بووە هۆی پێكەنینی هەمووان، لەو وەختەدا خاوەنماڵ، لایەنگرێكی ئازادی ئەمریكای لاتینی كە یەكێك لە دۆستە كۆنەكانی ژەنەراڵ بوو، بەدەم قاقای پێكەنینەوە كیسەكەی كە سەد پزوی تێدابوو بۆ ژەنەراڵ فڕێداو ژەنەراڵ لە حەوادا گرتیەوە.

خاوەنماڵ گوتی: "ئەی پایەبەرز ئەم پارە بۆ جەنگەكانتان هەڵگرن. لە هەموو حاڵێكدا ئێستا ئەو كچێكی ئازادە."

ژەنەڕاڵ خۆزە ئەنتۆنیۆ پائز كە شێوەی رەنگ و رووی لەگەڵ رەنگی كراسەكەی زۆر لێكدەهاتن. بەدەنگی بەرزەوە و قاقا پێكەنی و گوتی:

"دەبینی ژەنەراڵ، ئەم رێكەوتانە بۆ كەسانێك دێتەپێشی كە لەگەڵ ئازادیخوازان تێدەكەون."

ژەنەراڵ پشتگیری ئەم قسەیكردو بە جوولاندنەوەی دەستی یەكەمجار لە هەمووان و ئینجا لە شاژن ماریا لویزا وەك براوەیەك، خوا حافیزی كردو ئیدی هەرگیز دەنگ و باسێكی لە بارەیەوە بەدەست نەكەوتەوە. تا ئەوەندەی كە خۆزەپالاسیۆس لەیادی بوو، هێشتا ساڵێك بەسەر رووداوەكە تێنەپەڕیبوو كە ژەنەراڵ دووبارە ئەو شەوەی بەبیرخۆی دەهێناوە، شەوێكی هەمیشە ناخۆش و غەمناك بوو، سعات پێنج كاتێك كە خۆزەپالاسیۆس یەكەم فنجانە جۆشاوی بۆ ژەنەراڵ برد. ئەویدیت كە بە چاوی كراوەوە ئیسراحەتی دەكرد. ژەنەراڵ بە تواناو بەچوستی لە جێی خۆی هەڵساوە كە نزیك بوو سەراو سەر بكەوێتە خوارێ و كۆخەیەكی توندی گرت. لەناو جۆلانەكەی دانیشت و سەری خۆی

بە هەردوو دەستەکانی گرت تا کۆخەکەی بڕاوە، پاشان فڕێکی لە جۆشاوە داغەکەی خواردەوەو هەندێ باشتر بوو.

ژەنەراڵ گوتی: "تەواوی شەوەکە خەونم بە کاساندرۆوە دەدیت."

کاساندرۆ ناوی خوازراوەی ژەنەرالی گرانادایی فرانسیسکۆ دپائولا سانتاندربوو. ئەو دۆستێکی لە مێژی و بە هەموو باروکات و ساتێکدا بە گەورەترین رەقیبی ئەودادەنرا. هەر لە سەرەتای جەنگەوە فەرماندەی گشتی لەشکرەکەی و دەسەڵاتداری کۆلۆمبیای سەردەمی سەربەخۆیی کیتۆ پیرۆ و دامەزرێنەری دەوڵەتی پۆلیڤیابوو، لەو رووداوانەی کە هاتبوونە پێشیێ. ئازایەتی و توانای خۆی بە باشی نیشاندابوو و نێوانێکی تایبەتی لەگەڵ سەختگیریدا هەبوو، بەبێ گومان ئاکارو رەفتاری خودی خۆیو پەروەردە سەربازیە زۆرو زەبەندەکەی هۆی پاراستنی ناو و دەنگو گەورەیی ئەو بوو. دووەمین پیاوی سەربەخۆیی و یەکەمین کەسێك بوو کە هەنگاوی بۆ دانانی قانوون بۆ ئەو کۆمارە ناو هەر ئەمکارەش بووە هۆی ئەوەی کە بۆ هەمیشە وەك کەسێکی محافەزەکار ناسرێ. لەیەکێك لەو جارانەی کە ژەنەراڵ بڕیاری وازهێنانی دەدا، بە سانتاندری گوتبوو کە بە خەیاڵێکی رحەتەوە وازدەهێنیێ، لەبەرئەوە: "کۆمار بەدەستی ئێوە دەسپێرم کە تۆش وەك من و ڕەنگە باشتریشی لەمن."لەبەر هۆیەك یان لە ناچاریان بوو هەرچۆنێکبێ ئەو کە بەوی هەبوو بە هیچ کەسێکی دیکەی نەبوو. ژەنەراڵ ناوی ئەوی نابوو پیاوی قانوون، لەگەڵ ئەم هەموو شایستەییەدا، سانتاندر پێشی دوو ساڵ، بەهۆی یان بە تۆمەتی هاوکارکردنی لەگەڵ بکوژانی ژەنەراڵ و لەناوبردنی کە هەڵبەتە ئەم تۆمەتە هەرگیز سپینەکراوەو تا بەسەریدا ساغبێتەوە ، وەك دوورخراوەیەك لەپاریس دەژیا.

رووداوەکە بەمجۆرە بوو و نیوەشەوی چوارشەممەی بیست و پێنجی ئەیلوولی ساڵی ١٨٢٨ بوو لە سانتافە کە دوازدە کەسی ئاسایی و بیستو شەش کەسی سەربازی دەرگەی سەرەکی خانوێکیان شکاند کە بارەگای دەوڵەتی تێدابوو. دوو سەگی ژەنەڕاڵیان سەربڕی، چەندین پاسەوانیان بریندار کرد، بە شمشێر بازووی کاپیتان ئەندرس ئیبارا یان بە سەختی بریندار کردو سەرهەنگی سکۆتلەندی "ویلیام فرگوسن"یان بە گوللەیەك لە کۆڵکردەوە. فەرگوسن ئەندامی لژیۆنی بەریتانی و یاریدەدەری تایبەتی ژەنەراڵ بوو، ژەنەراڵ لە بارەیەوە وتبووی کە ئەو هێندەی سیزارێك ئازاو نەبەردە، دوای کوشتنی فرگوسن بە بانگ و هاواری بژی ئازادی و مردن بۆ دیکتاتۆر بەرەو ژوورەکەی ژەنەراڵ رۆیشتن. ئەو یاخیانە کارەکەی خۆیان ئەوها بڵاودەکردەوە کە ژەنەراڵ پێشی سێ مانگ بەهۆی سەرکەوتنی لایەنگرانی سانتاندر لە ئەنجومەنی ئۆکانیبا

بارێکی دیکتاتۆری تایبەتی بەخۆیەوە گرتووە. پایەی یاریدەدەری سەرۆکایەتی کۆمار کە بۆماوەی شەشساڵ لەدەست سانتاندر بوو لەو وەرگیراوە.

سانتاندر بەهەمان دەنگی تایبەتی بەیەکێك لە دۆستەکانی خۆی گوتبوو.: "شانازی بەوەوە دەکەم کە لە ژێر وێرانەی قانوونی بنەڕەتی ساڵی ١٨٢١ دا بنێژرێم."

ئەو سەردەمە تەمەنی سی و شەش ساڵ بوو و بەباڵیوز لە واشنگتن دامەزرابوو، بەڵام زۆرجاران سەفەرەکەی بە دواهێخستبوو تابتوانی سەرکەوتنی ئەو پیلانە بەچاوی خۆی ببینیّ.

تازە ژەنەراڵ و مانوێلا سئز لەسەرەتای شەوێکی ئارام و ئاشتەوایی دابوون. دوا حەفتەیان لە گوندێکی سوئاجا. بەمەودای دوولگواو نیو دوور لە شاری بەسەربردبوو دووشەممە دوای ناکۆکی شەڕو دەمەقاڵەیەکی توندتر لە هی ئاسایی بە گالیسکەی جیا بۆ شار گەڕابوونەوە. ناکۆکیان لەسەر ئەمە بوو کە ژەنەراڵ هیچ بایەخی بە دەنگ و باسی هەوڵی کوشتنەکەی نەدەدا، دەنگ و باسێك بوو کە هەموو خەڵکی قسەیان لەبارەوە دەکرد کە تەنیا ژەنەراڵ باوەڕی نەدەکرد. مانوێلا لە ماڵی خۆیدا مابۆوە و وەڵامی پەیامەکانی ژەنەراڵی نەدەداوە کە ئەوسا لە کۆشکی سان کارلۆسی سەر رێگاکەی بەرانبەر دادەنیشت. تا ئەو شەوە، سعات نۆ، لەدوای سیّ پەیامی پڕ لە تکاو بەپەلە، جووتێك پاپۆشی پلاستیکی دژە بارانی لەسەر پێڵاوەکانیەوە لەپێکرد: شتێکی بەسەرسەری خۆیداداو لەو جادەی کە سێڵاوی لێهەڵسابوو، تێپەڕی. ژەنەراڵی لەناو حەوزی حەمام بەبیّ ئەوەی خۆزەپالاسیۆسی لەلابیّ، دیتەوە و ئەگەر پێشتریّ ئەوەی بەدەم دالغە و لەبیرڕاچوون نەدیتبا. گومانی لەمەدا نەدەبوو کە مردووە. ژەنەراڵ تەپەی پێی مانوێلای ناسیەوە و بەبیّ ئەوەی چاوەکانیی بکاتەوە لەگەڵێدا کەوتە قسە. ژەنەراڵ وتی: "بەمزوانە پیلانێك دەنرێتەوە."

منوئلا کینەی خۆی نەشاردەوەو بە توانج و پلارەوە گوتی: "پیرۆز بیّ، رەنگە دە جاران قەسدی گیان و کوشتن رووبدا، لەبەرئەوەی تۆ زۆر گویّ بە ئامۆژگاری خەڵکی دیکە دەدەی."

ژەنەراڵ گوتی: "من تەنیا باوەڕم بەپێشبینی هەیە."سوعبەتی لەگەڵ مانوێلادا دەکرد، لەبەرئەوەی فەرماندەی گشتی لەشکر ئاگاداری کردبوو کە هەوڵی کوشتنی بەبیّ ئەنجام ماوە. بەڵام هەر ئەو کەسە زانیاری تەواوی لەبارەی پاسەوانانی کۆشك و ئەمەی کە لە چ شەوێکدا و بەچ شێوەیەك دەتوانریّ ئەوان غافگیر بکرێن. بەیاخیەکاندا بوو. ژەنەراڵ بە شادیەوە لە ئاوی ناو حەوزەکەی حەمام هاتەدەریّ و بەردەوامی بە قسەکانی دا: نیگەران مەبە، واپێدەچیّ ئەم هیچ و پووچانە چیان لەدەست نەیە."ژەنەراڵ و مانوێلا تازە لێیکەوتبوونە خەو کە یەکەم بانگ

و هاوارو تەقەکردن و دانەبەرتۆپی سەربازگەیەکیان گوێ لێبوو. مانوێلا بەخێرایی یارمەتی ژەنەراڵی دا تا جلەکانی لەبەربکا. پاپۆشەکانی خۆی لەپێی ژەنەراڵ کرد، چونکە ژەنەراڵ تاکە جووتە پۆتینەکانی بۆ بۆیاخکردن ناردبوو، ئینجا شیرو حەفتیرەکەی دا ژەنەراڵ و یارمەتیدا تا لەبالەکۆنەکەوە بۆیدەرچێ، بەڵام ژەنەراڵ هیچ جلوبەرگێکی وای لەبەردانەبوو بۆ ئەوەی لەو بارانە بەلێزمە بیپارێزێ. هەر لەگەڵ ئەوەی گەیشتە سەر شەقام، سێبەرێکی دیت. بە حەفیترەکەی خۆی سێبەرەکەی دابێژتە بەر گوللان و گوتی "کێ بژی."شیرینی چییەکەی ژەنەراڵ بوو کە بەبیستنی دەنگۆی مەرگی ئەو بەغەمباری بەرەو ماڵ دەبۆوە. ئەو لەو کەسانە بوو کە ئامادەبوو تا لێواری مەرگ لەتەك ژەنەراڵ بمێنێتەوە و بەمجۆرە هەردووکیان لە ژێر پووشو پەڵاشی پردی کارمن، لە کەناری رووباری سان ئاگوستین. خۆیان حەشاردا تا لەشکرو سوپاکەی لایەنگیریان ئاژاوەکەیان سەرکوتکردەوە.

مانوێلا بە زیرەکی و ئازایەتیەکی زۆرەوە کە لە زۆر کات و شوێنی دیکەشدا نیشانیدابوو، لە ژووری نوستنەکە لە چاوەڕێی ئاژاوەگێڕەکاندا ماوە، پرسیاری ژەنەراڵیان لەو کرد، گوتی لە ژووری کۆبوونەوەیە. پرسیان لە شەوێکی وا ساردوسڕ بۆچی پەنجەرەی بالەکۆن کراوەتەوە. مانوێلا وەڵامیداوە کە ویستوویەتی بزانێ ئەم هات و هاوارە چییە. پرسیاریان لێکرد، ئەدی بۆچی ناونوێنەکە گەرمو تێکپرژاودا پرژاوە. وەڵامی دانەوە کە بە جلکەوە بەدەم چاوەڕوانی ژەنەراڵ خەو بەلایدا بردبووم، مانوێلا بەو شێوەی کە بە وەڵامەکانی کاتی بەرێدەکرد و جگەرەیەکی ئاساییشی دەکێشاو مژی توندی لێدەدا و دووکەڵەکەی بەبادەکردەوە تا بۆن کۆلۆنیای ژەنەراڵ کە هێشتا نەختێکی بەرلووت دەکەوت، لەنێو ببا.

لە دادگاییەك بەسەرۆکایەتی ژەنەراڵ رافائل ئۆردانتا بەم ئەنجامە گەیشتن کە ژەنەراڵ سانتاندر کوانوی سەرەکی ئەم پیلانەیە و حوکمی مردنیان بەسەردادا، ناحەزو دوژمنانی سانتاندر دەیانوت کە ئەم حوکمەش بۆ ئەو کەمە. نەك تەنیا لەبەربەشداریکردنی لە ئاژاوەکە. بەڵکە پتر لەبەرهەڵەپاچی کارەکەی کە، دوای هەوڵی کوشتنی ژەنەراڵ، یەکەمین کەسێك بووە لە گۆڕەپانی گەورەی شاردا سەر سەلامەتی لە ژەنەراڵ کردوەو پیرۆزبایی لێکردوە. ژەنەراڵ بەتای رۆبێکەوە و سەرتاپا ئاوی لێدەچۆڕاوە بە سواری ئەسپەوە لە ژێررێژنەی باراندا، لە گۆڕەپانی شاردا وەستابوو و سەربازو لەشکرەکەی و خەڵکی دەستەدەستە لە هەموو لایەکەوە بۆ دیدەنی دەهاتن و بانگیان بە مەرگی ئاژاوەچییەکان دەدا، ژەنەراڵ لە نامەیەکدا بۆ سوکرەی سەرکردەی دەریایی نووسی "سەرپاکی ئاژاەچی و هاوکارەکانیان بە پلەی جیاجیاوە پاداشتی

خراپەکاریەکانیان وەردەگرنەوە.سانتاندر داشی بنچینەیی ، بەڵام لە هەمووان خۆشبەختترە، چونکە رابردوو جوامێری من لەمەڕ پشتیوانیکردنی ئەوەوەیە، هەر بەم شێوەیەش بوو بەو رێگایانەی کە لەبەری بوو، حوکمی مەرگی بە دوورخستنەوە بۆ پاریس گۆڕی.

بەڵام سەرکردەی دەریایی خۆزە پردونسیوپادیجا بە تۆمەتی ئاژاوەگێڕی کە بە کارتاخنادئیندیاس. لە سانتافە لە حەپسخانەدابوو، بەبێ بەڵگەی تەواو گوللە بارانیانکرد، خۆزەپالاسیۆس نەیدەزانی کەی خەونەکانی ژەنەراڵ لەمەڕ سانتاندرکەی راستی هەیە و کەی دەبێتە شتێکی خەیاڵی. جارێکیان لە گوئاجاکیل باسیکرد کە سانتاندری لە خەونێ دیتووە کە کتێبێکی کراوەی لەسەر ورگی داناوە، بەڵام لە باتی ئەوەی کتێب بخوێنێتەوە، یەك یەك لاپەڕەکانی لێدەکردەوەو لەسەرەخۆ دەیجوین و قوورتی دەدان و وەك بزن دەیقاڕاند، دیسانەوە لە کوکوتا[1] لە خەونێی دیتبوو کە سیسرکەیەکی زۆری لێنیشتبوو، هەروەها کەڕەتێکی دیکەش لە ماڵێکی گوندی مون سرات لە سانتافە دەم بەهاوارەوە لە خەو ڕاپەڕی، لەبەرئەوەی خەونی دیتبوو هەر بەجۆرەی کە لەگەڵ سانتاندر دووبەدوونانیان دەخوارد، ئەو چاوەکانی خۆی لەقەپێلکان دەرپەڕاندبوو و دەستی بە خواردن کربۆوە، بەجۆرە بەیانی ئەو رۆژی لەو شوێنە لە نزیکی گوادوئاس کاتێك کە ژەنەراڵ وەسپی کرد کە سانتاندری لە خەونێدادیووە خۆزەپالاسیۆس تا بابەتی خەونەکەشی نەپرسی، تەنیا هەوڵیدا کە دڵنەوایی ژەنەراڵ بکاو دڵی بداتەوەو گوتی:

"لەنێوان ئەو و ئێمەدا دەریایەکی گەورە هەیە."بەڵام ژەنەراڵ بەروانینێکی توندەوە ئەوی ڕاگرت. ژەنەراڵ وتی: "بەڵام بەجۆرە نیە، دڵنیام کە ئەم گەمژە پیاوە، خواکین موسکرا، مۆڵەتی گەڕانەوە بەو دەدا."

لە کاتێ کە لە دوا سەفەریدا گەڕابۆوە و بابەتی وازهێنانی هەمیشەیی دەسەڵاتی بەشێوەیەکی بەراستی لەبەردەم دانرابوو، بیری گەڕانەوەی سانتاندر کێچی دەخستەکەولێەوە. بەخۆزەپالاسیۆسی وتبوو، یان مەرگ یان دوورخرانەوەی بەسووکی و ریسوایی، ئەم هەموو شکۆو گەورەییە دەدەمە دەست کالج سان بارتلومە."بەڵام ئەم پادزەهرە[2] ژەهریشی لە خۆیدایە، لەبەرئەوە ژەنەراڵ چەندەی لە دوا بڕیاری خۆی نزیکتر دەبۆوە، ئەوەندەش دڵنیایی زێتر پەیدا

---

١ کوکوتا، شاریك لە کۆلۆمبیاو، لەسەر سنوری ڤەنزویلا، م. فارسی.

٢ پادزەهر: ترياك : مادەیەکی ژەهری لەشی لە نێو ببا

دەکرد کە هەر لەگەڵ دوورکەوتنەوە لە دەسەڵات و دەستکێشانەوەی لە حوکم ئەوا ژەنەراڵ سانتاندر، بەنێو و دەنگترین خوێندەوار و خاوەنبڕوانامە لە تەویلەی پیاوانێکی کەلە قانوون و قانوون داناندا کۆڵەوارن، لە تاراوگە دەگەڕێتەوە. ژەنەراڵ وتی: "ئەمە کەسێکی بەراستی زرنگ و بێبەزەییە."تایەکەی بە تەواوی لێڕەویبۆوە و ئەوها سەرحاڵ بوو کە فەرمانی بە خۆزەپالاسیۆس دا کاغەز و پێنووس بێنێ و بەدەستخەتی خۆی نامەێکی شەش دێڕی بۆ منوئلاسئنز نووسی، ئەم کارە هەتا بۆ کەسێکی وەك خۆزەپالاسیۆس کە بە خووە لە پڕەکانی ژەنەراڵ زۆر ئاشنا بوو، سەیر هاتە بەرچاوان. تەنیا توانی ئەوە وەك پێشبینی خۆشبەختی و خوێندنەوەی ئایندەیەکی رووناك یان زەبرێکی ئیلهامبەخشی. چاوەڕێنەکراو و لە توانابەدەر وەرگرێ. ئەو وا خوی پێوەگرتبوو کە لە هەر کاتێکدا بێت (مونشی) یەکانی بە ئاگابێنێ تا نامە دواکەوتووەکان بنووسێ و رەوانیانبکاتەوە و یا بەراوێژی ئەوان ئەو بیرو هزرانەی لە کاتی بێخەویدا بەمێشکمدا رادەبوورد، مشتوماڵ داو رێکیانبخا، بەڵام ئەمەی کە خۆی نامە بنووسێ، نەك تەنیا بە پێچەوانەی خوی هەمیشەیی بەڵکە بە پێچەوانەی بڕیارێك بوو کە رۆژی هەینی پێشوو دایبووی کە ئیدی تا ماوە یەك نامەش نەنووسێ. سەیرتر لەمەش ئەوەبوو نامەکەی بەبێ پەلەپەل نووسی، نامەیەکی سادەو بۆ خوا حافیزی بوو و تەنیا یەك رستەی نادیاری تێدابوو: "وریای کارەکانت بە ئەگینا خۆت نابووتدەکەی بە نابووتکردنی خۆت هەردووکمان لەناو دەچین: "نامەکەی بەشێوەیەکی وانووسی کە وەك بڵێی هیچ بیری لە رستەکانی نەکردۆتەوە. ئەوسا نامە بە دەستەوەو لەناو بیروخەیاڵی خۆیدا راچو و لەناو جووڵانەکەی لەسەر ئەو لاکەلەکەی خۆی بۆ سەر ئەولاتەنکێشی وەردەگێڕا. لەپڕ ئاهێکی هەڵکێشاو وتی: "مەزنترین توانا لە هێزی تەحەمولنەکراو عشقی شاراوەیە. بەراست ئەم رستە هی کێیە؟"

خۆزەپالاسیۆسی وەڵامیداوە: "هی هیچ کەسێك نییە."خەت و قەڵەمی نەبوو هیچ کاتێك نەیویستبوو فێرببێ، تەنیا دەیگوت هیچ زانستێك لە زانستی کەران باڵاتر نییە. بەڵام هەر ڕستەیەکی ئەگەر بێتو بۆ جارێکیشی بەرێکەوت بەرگوێی کەوتبێ دەیتوانی بەبیری خۆی بێنێتەوە و بەڵام ئەم رستەیەی بەبیرخۆی نەدەهێناوە.

ژەنەراڵ گوتی: "دە کەواتە من گوتومە، بەڵام باوادانێین کە ئەم رستە هی دەریاسالار سوکرەیە."

بۆ ئەم وەختانە کەس لە فرناندۆ باشتر دەستنەدەکەوت. هەرچەندە لە هەمووان بەهۆشترو بە ئاوەزتر نەبوو، بەڵام باشترین و بەئارامترین نووسەری ژەنەراڵ بوو و بە ئارامی و لە کرۆکی دڵەوە ئازارەکانی بێخەوی ژەنەراڵ و کارە ناوەخت و بێوەختەکانی ئەوی تەحەمول دەکرد. ژەنەراڵ بۆ خوێندنەوەی کتێبێکی کەمبایەخ یان لەبۆ نووسینی بیرو هزرە لەپڕ و راگوزاریەکانی کە هەڵبەتە بۆ بەیانی رۆژی دوایی لەناو زبڵدانبوو، لەهەر سعاتێك بایە ئەوی بێداردەکردەوە. لەگەڵ ئەوەی شەوە عیشقبازیە لەئەژمارنەهاتووەکانی ژەنەراڵ هیچ وەچەیەکی لێنەکەوتەوە، دوای مردنی براکەی سەرپەرشتی فەرناندۆی لەئەستۆگرت و ناردیە قوتابخانەی سەربازی جۆرج تاون[1] لەویّ ژەنەراڵ لاڤایت زۆر ریّزی لەو هەموو ئاکارە جوان و رەفتارە شیرینانەی گرت کە مامی فێری کردبوو، دوایی بە کالچ جفرسون، دەرچارلوت وێل و ئینجا بۆ دانیشگای فیرجینیا چوو، بەڵام فرناندۆ ئەو جێنشینە نەبوو کە ژەنەراڵ بیری لێدەکردەوە چونکیّ سەروسەلیقەی بەرنامە بڕیاردراوەکانی ئەو قوتابخانانەی نەبوو، لەباتی ئەوە حەزی لە ژیانێك بوو کە نەیبەستێتەوە و لەکەشوهەوایەکی ئاوەڵاو کراوەدا و مەیلی پتر بۆ گوڵ و گیاو گۆڵ و کاری ناوباغان دەنواند. هەر لەگەڵ ئەمەی خوێندنەکەی تەواو بوو، ژەنەراڵ ئەوی هێنا سانتافە و لەبەرئەوەی دەستخەتێکی زۆر جوان و خۆشی هەبوو دەسەڵاتی تەواوی بەسەر قسەکردن و نووسینی زمانی ئینگلیزیدا هەبوو و توانای داهێنەرانەی لە نووستنی بەیانان و بانگەوازدا هەبوو کە سەرنجی خوێنەری بەلای خۆیدا رادەکێشا و خستنە سەری هەندیّ رستە لە خۆیەوە و لە کاتی خوێندنەوەدا، تاکو گوێگر ئاگای لەلایەنە ناخۆش و وەڕزەکەرەکانی کتێب نەبیّ، ئەوی وەك مونشی خۆی هەڵبژارد. بەڵام وەك هەموو ئەو کەسانەی کە لە خزمەتی ژەنەراڵ دابوون. رۆژگاری بەدبەختی فرناندۆش داهات، جارێکیان کە رستەیەکی لە قسەکانی (دموستن)[2]ی دابووە پاڵ شیشرۆن [3] و ژەنەراڵیش ئەو هەڵەیەی لەیەکێك لە گوتەبێژیەکانی بەکارهێنا. ژەنەراڵ لەبەر رەچەڵەك و خزماتیەکەی بۆ فرناندۆ سەختگیرتربوو، بەڵام بەرلەوەی ماوەی تەمیّ کردنەکەی تەواوبیّ ئەویبەخشی.

١ جۆرج تاون، پایتەختی گویان

٢ فەیلەسوفی یۆنانی .

٣ فەیلەسوفی رۆمی .

دوو رۆژ بەرلەگەیشتنی ژەنەراڵ و هاوڕێ و دارو دەستەکانی، ژەنەراڵ خواکین بوسادا گوتی بەرز، پارێزگاری ئەو ناوچەیە، تێکڕای ئەو شوێن و ناوچانەی کە بڕیاربوو ژەنەراڵ پێیاندا تێپەڕێ یان تێیاندا بمێنێتەوە، سەردانکردو خەبەری گەیشتنی ئەو و باری ناخۆشی تەندورستی ئەوی پێڕاگەیاندن بەڵام هەموو ئەو کەسانەی کە ئەو دووشەممە دوای نیوەڕۆکەی گەیشتن ژەنەراڵیان لە گوادواس دیت، دڵنیابوون کە تەواوی قسەکانی پارێزگار جگە لە پڕوپاگەندەیەك شتێکی دیکە نەبووە و ئەم سەفەرەی ژەنەراڵیش لە مانۆڕێکی سیاسی بترازێ شتێکی دیکە نییە. بۆ جارێکی دیکەش ژەنەراڵ خۆڕاگر و ورەبەرزو تێکنەشکاو دەهاتە پێش چاو. دەسماڵێکی لەسەری بەستبوو تا ئارەقەکەی هەڵمژێ. قۆپچەکانی کراسەکەی کرابوونەوەو دەفەی سینگی لە گۆڕێ بوو. سواری قاترێك بوو و بەشێوەیەکی پێکەنیناوی و خێرا ڕێی دەکرد. لەشەقامی سەرەکییەوە هاتە ناوشار. بوونی ئەم قاترە بە تەواوی ڕەسمیەتی ئاهەنگەکەی شێواند. ژەنەراڵ لەنێو بانگ و هاواری ئاپۆڕای خەڵکی، فشەفشی تەقەمەنی هەوایی و زەنگی کلێسەکە نەیدەهێشت دەنگی تیپی مۆسیقا ببیسترێ، بەکڵاوەکەی سڵاوی لە خەڵکی دەکرد. تەنیا ماڵێکی کە پەنجەرەکانی نەکردەوەو بەداخراوی ماوە، قوتابخانەی خوشکەراهیبەکانبوو، دەنگۆییێکی وا هەبوو مۆڵەتی ئەو خوشکانەیان نەدابوو بەشداری لەو ئاهەنگەدا بکەن بەڵام هەر کەسێکی ئەمەی بۆ ژەنەراڵ دەگێڕاوە پێیدەگوتن بەمە باوەڕ مەکەن، خۆزەپالاسێوس شەوی پێشتر، ئەو کراسەی کە ژەنەراڵ ئارەقەی پێوەکردبوو بۆ شوشتن بەڕادانی دەدا، خزمەتکارێکیش کراسەکە دەداتە سەربازەکان. ئەوانیش بەیانی زوو بۆ شوشتنی کراسەکە دەچنە دەم ئاوی رووبار، بەڵام وەختی ڕۆیشتن کراسەکە وندەبێ، بەدرێژایی سەفەرەکە تاناوچەی گوئادوئاس و تا وەختی ئاهەنگەکە، خۆزەپالاسێوس بەدوای کراسەکەدا دەگەڕا و لەدواییدا بۆیدەرکەوت کە خاوەنماڵەکە کراسەکەی بەر لە شوشتن دزیوە تابیداتە سورپێستی جادووگەر تا توانای خۆی لەمەڕ نەخۆشیەکەی ژەنەراڵەوە بنوێنێ. کاتێك کە ژەنەراڵ گەڕاوە ماڵێ. خۆزەپالاسێوس ژەنەراڵی لە کارەکەی خاوەنەماڵەکە ئاگادارکردەوە ، هەروەها پێشی گوت کە لەو کراسەی بەری بترازێ کراسێکی دیکەی نییە تا لەبەری بکا. ژەنەراڵ بەشێوازێکی فەیلەسووفانە رووبەڕووی ئەم ڕووداوە بۆوە و گوتی: "خەرافات لە عیشقیش دلڕەقترە."

خۆزەپالاسێوس وەڵامیداوە: "سەیر ئەمەیە کە لە دوێنی شەوەوە تا ئێستا تاتان نەهاتووتێ ڕەنگە ئەو جادووگەرێکی بەڕاستیبێ؟"

ژەنەراڵ لەم چرکەساتەدا هیچ وەڵامێکی نەداوە. خۆی فڕێداوە ناو جۆلانەکەی و لەفکرڕاچوو و جۆلانەکەیشی هەماهەنگ لەگەڵ بیرکردنەوەی ئەودا کەوتە جووڵە. دوای چەند چرکەساتێك ژەنەراڵ گوتی: "راستیەکەی ئەمەیە کە ئیدی ژانەسەرم نەگرتۆتەوە ناو دەمیشم تاڵ نییەو هەستیش ناکەم لە تۆقەڵەی سەری بورجێکەوە دەکەومە خوارێ."بەڵام لە دواییدا مشتێکی بە ئەژنۆی خۆیدا کێشاو لەپڕ لە جێگای خۆی راستبۆوەو گوتی:

"ئەم هەموو قسە پڕوپووچانە لە مێشکم مەئاخنە."

دوو کەس لە خزمەتکارەکان مەنجەڵێکی گەورەی پڕ لە ئاوی کوڵاوی پڕ لە گیاو گوڵی بۆنداریان بردە ژووری خەوەکەی و خۆزەپالاسیۆسیش بەدڵنیاییەوە لەوەی کە ژەنەراڵ لەبەر شەکەتی ئەو رۆژەی زوو دەنوێ، حەمامی شەوانەی بۆ ئامادەکرد. بەڵام حەمامەکە ساردبۆوە لەبەر ئەوەی ژەنەراڵ بۆ گابریل کاماچۆ هاوسەری برازاکەی ڤالانتینا پالاسیۆس و نوێنەری لە کاراکاس نامەی نووسی. لە نامەکەدا بابەتی فرۆشتنی کانزای مسەکەی ئاروئاس کە لە ئەژدادیەوە بە میرات بۆی بەجێمابوو باسکردبوو ژەنەراڵ خۆیشی نەیدەزانی دەیەوێ چیبکا، لەدێڕێکدا دەیگوت کە دەیەوێ بۆ کورازائوا[1]بڕوا و لە دێڕێکی دیکەدا داوای لە نوێنەرەکەی دەکرد نامەیەکی بۆ جەنابی رابرت ویلسون لە لەندەن بنووسێ و لە هاتنی ئەو ئاگاداری بکاتەوە و دانەیەکی لەبەرگیراوەی نامەکە بۆ بەرێز مکسول هایسلوب لە جامایکا بنێرێ، تا ئەگەر نامەیەك ونبوو نامەکەی دیکە بگا.

بەڕای زۆر کەسان بەتایبەتی مونشی و نووسەرەکانی کانزاکانی ئاروئاش وڕێنەیەکی دیکەی ئەو وڕێنانە بوو کە لە ئەنجامی تاو نەخۆشی بەخەیاڵیدا دەهات. هێندەیان بایەخ پێنەدەدا لەم رووەوە مەعدەنچیانی جیاجیا ساڵهابوو لەوە سوودیانی وەردەگرت. ژەنەراڵ لەبەر دەستکورتی لەو رۆژانەی دواییدا ئەوانەی بەبیری خۆی هێناوە، بەڵام لەبەرنەبوونی بەڵگەنامەکانی موڵکدارێتی نەیتوانی بەکۆمپانیایێکی ئینگلیزی بفرۆشێ، هەر ئەمە بووە هۆی بەڵاو ناخۆشیەکی دادگایی مێژوویی و تا دوو ساڵ دوای مردنیشی هەر درێژەی کێشا.

لەگەرمەی جەنگ و گێروگرفت و ناکۆکیە سیاسیەکاندا هەموو دەم ژەنەراڵ دەیوت:

"داواکاریە بچووکەکانی من."هەموو کەسێك لە مەبەستەکەی دەگەیشت و کەس بەهەڵەدا نەدەچوو، چونکە ئەو هیچ داواکاریەکی لە کانزایی ئاروئا بترازێ نەبوو.

---

١ دوورگەیەکە لە باکوری ڤەنزویلا لەسەردەریای کاریبی

نامەکەی کە بۆ دۆن گابریل کاماچۆی نووسی ئەم بیرەی فرناندۆی برازای ورووژاند کە تا ئەو کاتەی ئەم گرفتە چارەسەرنەکرێ. ناچێتە ئەوروپا و لە دواییدا جارێکیان کە لەگەڵ ئەفسەرەکانی دیکەدا یاریدەکرد ئەم مەبەستەی خۆی بۆ ئەوان دووبارە کردەوە.

سەرهەنگ ویلسۆن گوتی: "کەواتە هەرگیز نارۆین. کار بەمەگەیشتوە کە باوکم لە خۆی دەپرسێ، ئایا بەراستی ئەم مسە هەیە یان نا."

کاپیتان ئەندرس ئیبارا وەڵامیداوە: "لەبەرئەمەی کە کەس ئەم کانزایەی نەدیوە، ئەمە مانای ئەوە نابەخشێ کە هەر نییە."

ژەنەراڵ کارنیو گوتی: "هەیە لە ڤەنزویلایە."

ویلسۆن بە نارەحەتیەکەوە وتی: "لەم دەم و دەستە لە خۆم دەپرسم ئایا ڤەنزویلاییێك هەیە."

ویلسون وای بیردەکردەوە کە ئیدی ژەنەراڵ ئەوی خۆشناوێ و تەنیا لەبەر باوکی ئەوی لە دەستە و هاوڕێیەکانی خۆیدا هێشتۆتەوە. بەهۆی ئەوەی کە باوکی ویلسۆن لەپەرلەمانی بەریتانیا بەرگری لە ئەمریکا کردبوو، ژەنەراڵ هەمیشە منەتباری بوو سوپاسی دەکردو بەباشی یادی دەکردەوە.

ویلسۆن لە راوێژکارێکی کۆنی فەرەنسایی بیستبوو کە ژەنەراڵ گوتویەتی: "دەبێ ویلسۆن لە ژیاندا ماوەیەك سەختی و هەژاری تاقیبکاتەوە تا قاڵ بێتەوە دروستبێتەوە."سەرهەنگ ویلسۆن نەیتوانیبوو دڵنیابێ کە لە راستیدا ژەنەراڵ قسەیەکی وایکردوە یان نا، بەڵام بەهەرحاڵێك لەو باوەڕەدابوو کە بەشداریکردن لە جەنگێك لەو دوو تاقیکردنەوە پڕ لە گێروگرفت و ناخۆشترە، تەمەنی بیست و شەش ساڵ بوو و ئەوە بەر لە هەشت ساڵ دوای تەواوکردنی خوێندنی لە وێست منیستەر و ساند هورست، باوکی ئەوی ناردە خزمەتی ژەنەراڵ، لە جەنگێکی خوێناوی راوێژکاری ژەنەراڵ بوو و هەر ئەو بوو کە قانوونی بنچینەیی پۆلیڤیای لە چوکیساکا[1] تا مەودای سێسەدو شەست لگوئا بەسواری گەیاندە ئەوێ. کاتی خواحافیزی ژەنەراڵ پێی گوت، ئەوپەڕەکەی تا بیست و یەك رۆژی دیکە دەبێ لە لاپاز[2]بێت. ویلسۆن دەمودەست وەڵامیداوە: "قوربان بەبیست رۆژان دەگەمە ئەوێ."وابوو لە نۆزدە رۆژان رێگاکەی بڕی.

ویلسۆن بڕیاریدا بوو لەگەڵ ژەنەراڵ بۆ ئەوروپا بگەڕێتەوە، بەڵام هەر رۆژێك کەرادەبورد پتر دڵنیادەبوو کە ژەنەراڵ هەمیشە بیانوێك بۆ دواخستنی سەفەرەکەی پەیدا دەکا، لە دوو ساڵ پتر

---

١ پارێزگایەك لە پۆلیڤایە.

٢ پایتەختی پۆلیڤیایە.

بوو کە ئیدی کانزاکانی ئاروائا باسی لێوە نەدەکراو نەدەهاتەگۆڕێ و هێنانەگۆڕێی ئەم داواکاری و ئەم بابەتە بەرای ویلسۆن تەنیا بیانگەیەك بوو بۆ نەرۆیشتنە ئەوروپایی.

خۆزەپالاسیۆس دووبارە ئاوی گەرم کردەوە. بەڵام ژەنەراڵ حەمامی نەکردو دوای تەواوکردنی نامەکەی کەوتە پیاسەکردن و بەدەم پیاسەکەیەوە بەدەنگێکی کە لە تەواوی ماڵەکەدا دەنگی دەداوە گۆرانی سەردەمی منداڵی چڕی و ئەو شیعرانەی کە خۆی وتبوونی و تەنیا خۆزەپالاسیۆس گوێی لێ ببوو، خوێندەوە. هەر بەدەم گۆرانی وتنەوە بەو ساڵۆنەدا رابورد کە ئەفسەرەکانی یاری روپیێجا[1] یاندەکرد، بۆ چرکەیەك دەوەستاو لەپشت هەر یەکێکانەوە سەیری باری بەرێوەچوونی یاریەکەی دەکرد و ئینجا درێژەی بە پیاسەکەی خۆیدەدا.

ژەنەراڵ جارێکیان گوتی: "نازانم چۆن دەتوانن کاتی خۆتان بە یارییەکی وا تاقەت بڕووکێن بەفێرۆ بدەن."لەگەڵ ئەمەشدا دوای چەند چرکەساتێك خۆی پێڕا نەگیراو تکای لە کاپیتان ئیبارا کرد تا جێگاکەی خۆی بداتێ. سەبرو ئارامی یاریکەرێکی باشی نەبوو و توانای نەدۆڕاندنی نەبوو. زبر، بەڵام لە هەمانکاتدا هۆشیارو خێرا بوو و دەیزانی چۆن خۆی لە ئەفسەرەکانی بە گەورەو وێچوتر دەگرێ لەگەڵ ژەنەراڵ کارینو شریك بوو. شەش دەستیان یاریکرد و هەر شەشیان دۆڕاند. کاغەزەکانی فڕێدا سەر مێزەکە و گوتی:

"ئەمە چ یارییەکی قۆڕە. ئەگەر دەوێرن بایاری ترسیجو[2]بکەین."یاریانکرد. ژەنەراڵ سێ دەستی لەسەریەك بردەوەو حاڵی باشتر بوو. یاریەکە کەوتە دەستی سەرهەنگ ویلسۆن. ویلسۆن ئەمەی بە خۆشبەختی وەرگرت و غیرەتی دابەرخۆی کە لە ژەنەراڵ وەپێشکەوێ و ئیدی نەدۆڕێنێ. ژەنەراڵ گوڕاحی تێکچوو و لێوەکانی وشك هەڵگەڕان و رەنگی لەبەردانەما. چاوەکانی تووڕە دەیاننواند. ئیدی متەقی نەکرد، کۆخەکۆخێك رێگای لە بیرکردنەوەی گرت. کاتێك کە یاریەکەیان راگرت سعات لە دوازدە تێپەڕیبوو. ژەنەراڵ گوتی: "هەموو شەوەکە بای لێداوم."

مێزەکەیان بۆ شوێنێکی پەنا با گوازتەوە تا ژەنەراڵ نارحەتنەبێ. بەڵام ئەو هەر دەیدۆڕاند، دەنگی فلوتی ئاهەنگێکی ئەو نزیکانە دەهاتەگوێی. فەرمانیدا کە ئەم دەنگانە ببڕێننەوە،

---

١ روپیجا: جۆرە یاریەکی کاغەزە

٢ ترسیجو: یاریەکی سێ کەسیە و هەریەکەی ٩ کارت وەردەگرێ هەرکەسێك کارتی زۆرتر کۆبکاتەوە دەیباتەوە وەرگێری فارسی .

بەڵام دەنگی فلوتەکە لەگەڵ ئاژاوەو دەنگە دەنگو سیرەسیرِی سیسرکان هەر بەردەوامبوو. کورسیەکەی گۆڕی، بالیفێکی لەسەر کورسیەکە دانا، تا جێگاکەی بەرزو رحەتتربێ، فنجانێك جۆشاوی هەڵقوڕاند کۆخەکەی برِا، هەر بە پیاسە چەند دەستێکی یاریکرد، بەڵام هەر دەدۆڕا. ویلسۆن بە چاوی پڕ لە کسکەو درەوشانەوەو خوێنگرتووی سەیری ئەویدەکرد، بەڵام ژەنەراڵ نەیدەوێرا لەگەڵ ئەم نیگایەدا ڕووبەڕوو بێتەوە.

ژەنەراڵ وتی: "ئەم کاغەزانە نیشانکراون."

ویلسۆن وەڵامیداوە: "کاغەزی ئێوەن."

لەراستیشدا کاغەزەکانی ئەو بوون، لەگەڵ ئەمەشدا ژەنەراڵ کاغەزەکانی یەك یەك سەیرکردو لە دواییدا فەرمانیدا تا دەستە کاغەزێکی دیکە بێنن. بەڵام ویلسۆن لەسەر بردنەوەکەی بەردەوامبوو موچەی [1] نەدا ژەنەراڵ هەناسەیەکیش بدا. سیسرکەکان ماتبوون و بێدەنگیەکی لەبن نەهاتووی کە حوکمفەرمابوو، لە پڕێك بەدەنگی هەڵکردنی شنەیەکی فێنك شڵەقاو سێ جاران کەلەشێرێك قوقاندی. ژەنەراڵ ئیبارا وتی: کەلەشێرێکی ناوەختە، هێشتا سەعات دووە، ژەنەراڵ بەبێ ئەوەی رووی خۆی لە کاغەزەکان وەرگێڕێ بەدەنگێکی زبرەوە گوتی: "نەفرەتییە، کەس لەبزی نەبزوفت، ژەنەراڵ کارنیو کە زۆرتر لەبەر نیگەرانی نەك لەبەر یاریەکە لەیاریەکە بەردەوام دەبوو، لە ناکاو درێژترین شەوی ژیانی بەبیرخۆی هێناوە، شەوێك بوو دوو ساڵ بەر لە ئێستا کاتێك کە چاوەڕێ ئەنجامی ئۆکانیایان دەکرد. سعات نۆی شەو دەستیان بە یاریکرد و بۆ سبەینێ بەیانیەکەی سعات یانزە کاتێ کە هەموویان ڕایان لەسەر بوو تا لێگەڕێن ژەنەراڵ سێ دەست لەسەر یەك بباتەوە. یاری تەواو بوو، ژەنەراڵ کارنیو لە ترسی ئەوەی کە لەو شەوەدا و لە گوادوئاس دیسان ئەم رووداوە دووبارە نەبێتەوە. ئاماژەی بۆ ویلسۆن کرد تا خۆی بە دۆڕاندا، بەڵام ویلسۆن هیچ گوێی پێنەدا. پاشان کە ویلسۆن ویستی بۆ پێنج دەقە پشووبدا تا داخ لە دلآنە میز بکاتە سەر گوڵەکانی ناو شەمعدانی خاڵی. ژەنەراڵ کارنیو بۆ سالۆنەکە بەدوای کەوت.

ژەنەراڵ کارنیو گوتی: "سەرەهەنگ ویلسۆن ئاگاداربە."

ویلسۆن بەبێ ئەوەی ئاوڕیشی بداتەوە وەڵامیداوە:

"ئارامت هەبێ، تا کارەکەم تەواو دەبێ."

---

١ موچە: دەرفەت . ماوە

لەسەرخۆ کارەکەی تەواو کرد و بەدەم داخستنەوەی قۆپچەکانی پانتۆڵەکەیەوە، بەرەو کن کارنیو گەڕاوە.

ژەنەراڵ کارنیۆ بەویلسۆنی وت: "ئەگەر بۆ بەزەیی پێدا تلیسانەوەش بووبێ دەبێ بدۆڕێنیێ."

ویلسون بە توانجەوە وەڵامیداوە: "من هەرگیز ناپاکی لەگەڵ هیچ کەسێکدا ناکەم."

کارنیو وتی: "فەرمانێکە پێتی دەکەم."

ویلسۆن لە هەمان کاتدا خەبەردارانە تەماشایەکی سەرشۆڕانەی کارنێوی کردو دوای ئەوە گەڕاوە سەر مێزەکەو بە ئانقەسد چەند دەستێکی دۆڕاند، ژەنەراڵ هەستپێکردو گوتی:

"ویلسۆنی ئازیز، هیچ پێویست ناکا ئەوەندە خراپ یاریبکەی وا دەزانم وا باشترە هەمووومان برۆین بنوین."

تۆقەی لەگەڵ هەمووان کردو خواحافیزی لێکردن، ئەمە دابێك بوو لە کۆتایی یاریدا دەیانکردو تا واتێبگەیەنن کە یاریەکە هەستی هیچ کەسێکی نەڕوشاندوە. ئەوساکە بۆ ژوری نووستنەکەی گەڕاوە. خۆزەپالاسیۆس لەسەر زەوی لێی راکشابوو و بەدیتنی ژەنەراڵ لە جێی خۆیدا رەپێ[1] بوو ژەنەراڵ بەخێرایی جلەکانی داکەندو بە رووتی خۆی فڕێدا ناو جۆلانەکەیەوە. سەرقاڵ و ناڕحەت دیاربوو هەرچەندەی بیریدەکردەوە دەنگی هەناسەی بەرزترو زبرتر دەبوو. وەختێ کە چووە ناو حەوزی ئاوی حەمامەکەوە تا سەر ئێسقانان هەڵدەلەرزی ، بەڵام لەبەر تایەکەی یان لەسەرما نەبوو. بەڵکە هۆیەکەی رق و تووڕەیی بوو.

ژەنەراڵ گوتی: "ویلسۆن مرۆڤێکی زرنگەو لەژێرکاری سۆزی دەروونیدا نییە."

یەکێك بوو لە خراپترین شەوەکانی ژیانی. فرمانی ناکۆك و دژبەیەکی دەردەکرد و خۆزەپالاسیۆس ئەفسەرەکانی ئاگادارکردبۆوە تا ئامادەبن کە ئەگەر پێویستی کرد پزیشك ئاگادارکەنەوە. چەرچەفێکی لە ژەنەراڵ ئالاند تا ئارەقە بکا. چەندین چەرچەفی بە ئارەقە تەڕکردبوو. چەند چرکەیەك ئارامی دەگرت و دووبارە حاڵ و باری تێکدەچۆوە. چەندین جار هاواریکرد:

"کوڕە دە دەنگی ئەو فلوتە نەفرەتیانە ببڕیننەوە."بەڵام لەمبارەوە کەس نەیدەتوانی لەمە یارمەتی بدا، چونکە ئەوان لە نیوەشەوەدا کپ ببوونەوە. دوای ماوەیەك هۆی لاوازی و نەخۆشی خۆی دۆزیەوە.

---

١ رەپێ: لەبەر هەڵسان

ژەنەراڵ گوتی: "تا ئەو حەلەی کە کراسەکەمیان بۆ کن ئەو سوورپێستە سەگبابە نەبردبوو حاڵم باشبوو."

لەدوا قۆناغی سەفەر بەرەو ئاوندا کە لە بەرزاییەکی زۆر ترسناك هەڵکەوتبوو. هەواش زۆر گەرمبوو و تەنیا خۆڕاگری لەش و توانایەکی پۆڵایین. وەك ئەوەی ئەو هەیبوو، دەیتوانی دوای شەوێکی ئەوها سەخت بارێکی ئەوها دژوار هەڵگرێ. هەر لە هەمان کیلۆمەترەکانی یەکەمدا لە شوێنی هەمیشەیی خۆی بۆ دواوە کشابۆوە و لە تەنیشت سەرهەنگ ویلسۆن دا بە سواری رێیی دەکرد. ویلسۆن ئەمکارەی ژەنەراڵی وەك نیشانە بۆ فەرامۆشکردنی ناڕەحەتیەکانی دوێنی شەو لێکداوەو بازوی درێژکرد تا ژەنەراڵ بتوانێ دەستی خۆی پێبگرێ. ویلسۆن بەوروژاویەکەوە بۆ رێزگرتنی ژەنەراڵ و ژەنەراڵ بەهەناسە بڕکێوە، بەڵام خۆڕاگر لەسەر زینی ئەسپ و بە هەموو توانای خۆیەوە، ئەو هەورازەیان بڕی. هەر کە ناخۆشترین بەشی هەورازەکەیان بڕی. ژەنەراڵ بە دەنگێکی گڕەوە پرسی:

"هەوای لەندەن چۆن چۆنیە؟"

سەرهەنگ ویلسۆن تەماشایەکی خۆری ناوەڕاستی ئاسمانی کردو گوتی:

"زۆر خراپە، جەنابی ژەنەراڵ."

ژەنەراڵ هەر هیچ سەری نەسوڕما و دووبارە بە هەمان دەنگ پرسیەوە:

"بۆچی خراپە؟"

ویلسۆن وەڵامی داوە: "لەبەرئەوەی لەوێ سعات شەشی باشنوەڕۆیە و ئەویش خراپترین کاتی لەندەنە. جگە لەمەش بارانێکی بەخوڕ دەبارێ، لەبەرئەمە بۆ ئێمە بەهار وەرزێکی خراپە، ژەنەراڵ گوتی: "مەبەستتان ئەمەیە کە بەسەر غەمی غوربەتدا زاڵبوون؟"

ویلسۆن گوتی: "بە تەواوی بە پێچەوانەوە ئەمە دڵتەنگیەیە کە بەسەرمدا زاڵ بووە. ئیدی هیچ بەرگریەکم بەرانبەری نەماوە."

ژەنەراڵ پرسی: "دەتەوێ لە کۆتاییدا بگەڕێیەوە یان نا؟"

ویلسۆن وەڵامیداوە: "بەهیچ جۆرێك نازانم، بوومەتە یاری چارەنووسێك کە لەدەست خۆمدا نییە."

ژەنەراڵ چاوی لە چاوەکانی ویلسۆن بڕی و بەسەر سامیەوە وتی: "من دەبوایە ئەم قسەم بکردبا."

هەرکە دووبارە دەستیان بە قسەکردەوە دەنگ وحاڵ و باری ژەنەراڵ گۆڕابوو. بە ویلسۆنی وت: "نیگەران مەبە، هەرچی رووبدا هەر دەچینە ئەوروپا، ئەگەر تەنیا لەبەر ئەمەش بێ کە باوکت چاوێکی پێتان بکەوێ، چەند چرکەساتێك لەبیرڕاچوو پاشدان گوتی:

"ویلسۆنی ئازیز، ماوە بدە دوا قسەی خۆمتان پێبلێم، هەموو شتێکت لێدێ جگە لە بێسۆزی."

سەرهەنگ ویلسۆن جارێکی دیکەش خۆیداوە دەستی گەورەیی ژەنەراڵ ، ویلسۆن لە هەمان کاتی کە دەستی گەرم و تاداری نەخۆشترین کەسی ئەمریکای وەك بازێك لە کاتی پشووداندا بەسەر بازوانەوە بوو، بە ئارامی لەسەر هاژوانی ولآخەکەی بەردەوامبوو، هەواش دەم لە دەمێ گەرمتردادەهات و وەك ئەمەی مێش و مەگەز لە خۆیان دەرکەن، ناچار بوون چەند مەلێکی کە بەسەرسەریاندا دەورو خولیاندەدا لە خۆیان دوورخەنەوە. لەدژوارترین شوێنی هەورازەکە تووشی دەستەیەك لە هاوولآتی و کەسانی ناوچەکەی خۆیان هاتن، کە تاقمێك ئەوروپاییان لەسەر کورسیانەوە لە کۆڵێ کردبوون. بەرلەوەی هەوارەزەکە کۆتایی پێبێ لەپڕ سوارەیەك زۆر بە خێرایی هەربەو لایەی ئەوان بۆی دەڕۆیشتن. لێی ڕەتدان. ڕۆبێکی ڕەنگاوڕەنگی لەبەردابوو کە تەواوی شێوە و دەموچاوی داپۆشیبوو و خێراییەکەی بە جۆرێکی ئەوتۆ بوو کە ولآخەکەی کاپیتان ئایبارا ڕەویەوەو هێندەی نەمابوو لە شیوەکە هەڵدێرێ، ژەنەراڵ تەنیا بەوە راگەیشت بەسەریدا بقیژێنێ."بەنەفرەتبێ ئاگاتان لە لێخوڕینەکەتانبێ."ژەنەراڵ چاوی لێهەڵنەگرت تا لە یەکەم پێچی رێگاکە ئاوا بوو و لە چاوان ونبوو ، بەڵام بەشێوەیەکی ئەوتۆ نیگەرانبوو هەر جارێکی کە لە پێچەکەیدیکە بەدەردەکەوتەوە هەر تەماشایدەکرد.

سعاتی دووی دوانیوەڕۆ هەورازەکەیان بڕی و لەم و سەری سەرەوە ئاسۆیەکی کراوەو دەشتێکی رووناکیان لەبەردەمدا بەدەرکەوت. لە کۆتایی ئەو دەشتە بازێری جوان و بەناوبانگی راونادا لە شیرینی خەودابوو، شارێکی کە پردێکی بەردین و ئیسپانیایی کە لەسەر رووبارێکی گەورەی پڕ لە قوڕو لیتە دروستکرابوو و بەشێکی دیوارەکان و بورجی کلێسەکانی بەهۆی بوومەلەرزەوە وێرانببوو، ژەنەراڵ باشی سەرنجی ئەو دۆڵ و شیوە جوانەیدا، بەڵام هیچ هەستێکی لە خۆیدا نیشان نەداو ئەو تەنیا لە خەیاڵی ئەو سوارە عەبا ڕەنگاوڕەنگەدا بوو کە لە هەمان چرکە ساتداو بە هەمان خێرایی بەسەر پردە بەردینەکەدا دەپەڕیەوە لەپڕ وەك ئیلهامی بۆهاتبێ وتی:

"ئەی خوداکەم، تاکە هۆی ئەم خێرایی و پەلەپەلە ئەمەیە کە نامەی بۆ کاساندرۆ دەبرد لە لە رۆیشتنی ئێمە ئاگاداری بکاتەوە."

## (٣)

لەگەڵ ئەمەشدا کە فرمانیاندا بوو هیچ خۆپێشاندان و کۆبوونەوەیەکی جەماوەری نەکرێ. بەڵام خەڵکێکی زۆر شادان وخەندان بۆ پێشوازی ژەنەراڵ هاتبوونە بەندەری شارو فەرماندار (پۆسادا گوتی بەرز) تیپی مۆسیقاو ئاوربازی ئامادەکردبوو، بەڵام بەرلەوەی ژەنەراڵ و دارو دەستەکەی بگەنە شەقامە سەرەکییەکانی شار. بارانێکی وەك کوندەی سەر بەرەو ژێر دایکرو ئاهەنگەکەی بە تەواوی تێکدا. بارانێکی ناوەخت و بەخوڕ بوو کە سێلاوی لەتێکڕای شەقامەکانی شار هەڵساندو بەشە هەژار نشینەکەی شاری وێرانکرد، بەڵام گەرمای هەواکەی کەم نەکردەوە، لەناو ئەو هەموو پێشوازی و سلاوانەدا کەسێك قسەیەکی زۆر گەلحۆیانەی کرد، گوتی: هەواکەی هێندە گەرمە هێلکەو رۆن بە مریشك دەکا، بارانەکە دیسانەوە تا سێ رۆژان یەکبین باری. هەر پاشنیوەڕۆیێکی هەورێکی رەش لە داوێنی چیاکاندا دەهاتنەخوارێ. ئاسمانی شاری دادەپۆشی و دوایی دایدەکردە بارانێکی بەلێزمە، دوای ئەوە هەتاوێکی گەرم و هەڵقرچێنەر لە ئاسمانێدا بەدەردەکەتەوەو کەناس و گسکلێدەران خەریکی کۆکردنەوەی قوڕو لیتە و کاری دیکە دەبوون، لە هەمان کاتدا هەوری رەشی دیکە لە ئاسمانێ و لە دامێنی چیاکاندا پەیدا دەبوونەوە کە هەواڵی بارانی سبەینێی پێدەداین. بەڵام لە هەموو ساتێك و شەو و رۆژ بەباشی گەرمانی‌ی هەوا هەستی پێدەکرا.

ژەنەراڵ لەبەرتاولاوازی بەزەحمەت خۆی لەبەر پێشوازی و بەخێرهێنانی خەڵکەکە راگرت. هەوای سالۆنەکەی پێشوازی لە توانابەدەر بوو، بەڵام ژەنەراڵ بەبێ ئەوەی لەسەر کورسیەکەی راستبێتەوە، بەدەنگێکی کزو بڕگەبڕگە وەك قەشەکان وتاری دەدا، کچۆلەیەکی تەمەن دەساڵەی کەجلێکی سپی وەك فرشتان دووباڵی لە پشتەوە پێوە بوو، لەبەردابوو، بەخێرایی شیعرێکی ئەزبەری لە ستایشی ژەنەراڵ خوێندەوە بەڵام هەڵەیەکی کردو سەر لە نوێ

پێداهاتەوە دیسان هەڵەی کردەوەو سەرەنجام بە دووچاوی پڕلەوەحشەت و شەرمینەوە لە ژەنەراڵ ڕاما. ژەنەراڵ گرت و بەشێکی شیعرەکەی بەبیرهێناوە:

بریسکانەوەی شمشێرەکەی نیشانەی مەزنی و زەبردەستی ئەوە. ژەنەراڵ لەیەکەمین ساڵەکانی کە دەسەڵاتی گرتبووە دەست لە هەموو کات و بۆنەیەك بۆ سازدانی میوانداری سوودی وەردەگرت. ئاهەنگی گەورەو پڕ لە شکۆی سازدەکردو هەمیشە میوانەکانی ناچار دەکرد زۆر بخۆن و بخۆنەوە. لەم رابردووە شاهانەی تەنیا چەقۆو چەنگاڵەکانی خۆی مابوونەوە کە پیتی یەکەمی ناوی خۆی لەسەریاندا هەڵکەنرابوو و خۆزەپالاسیۆس هەمیشە کاتی نانخواردنی ژەنەراڵ ئەو چەقۆو چەنگالانەی بۆ دەهێنا. لە میوانداریەکەی کە لە ئاوندا لێیکرا قبوولێکرد تا لەسەرەوەی کۆڕەکە دانیشێ، بەڵام تەنیا پەرداخێك شەرابی خواردەوە و کەمێکیشی شۆرباوی کیسەڵی رووبار فڕکرد کە تامی ناودەمی زۆر ناخۆشکرد. فەرماندار پوسادا گوتی یەرز لە ماڵەکەیدا ژورێکی گەورەی بۆ ژەنەراڵ ئامادەکردبوو. ژەنەراڵ زووتر لە رۆژان بۆ نووستن چوە ژۆرەکەی، بەڵام ئەم هەواڵەی کە بەیانی پۆستی سانتافە دەگاتەجێ، هەندێك لەو خەونەیشی کە لە پێناویدا مابۆوە، خەوی لێتێکدا پەرێشان و نارەحەت لەبیری چارەنووس و بەدبەختیەکانی خۆیدا راچو و بەردەوام خۆزەپالاسیۆسی دەدابەر پرسیاران، دەیویست بزانێ لەو کاتەوەی کە ئەو رۆیشتووە چی روویداوە. باری شار دوای سەقامگیربوونی دەوڵەتی نوێ چۆنبووە و ژیانی رۆژانە بەبێی ئەو چۆن بەڕێوە چووە. جارێکیشیان لەنێو پەرێشانحاڵیەکی تونددا گوتبووی کە ئەمریکا نیوەگۆیەکە و بەسەری پەڕیوە. لەو حاڵ و بارەدا لە ئاوندا مافی خۆیبوو بەمجۆرە بیربکاتەوە.

هەموو شەوەکەی بە نارەحەتی بەرێکرد. لەبەرئەوەی پەردەی نەگرتبۆوە پێشوولە زۆر نارحەتیانکرد. جارێکیان بە دەوری ژۆرێدا دەگەڕاو قسەی لەگەڵ خۆیدا دەکرد. جارێکی دیکە بە توندی خۆی فڕێدەداوە ناو جۆلانەکەی و هەندێ کاتیش پەتۆی لە خۆی دەئالاند، لە گەرمان وڕێنەیدەکرد هاواری دەکردو شەلالی ئارەقە دەبوو، خۆزەپالاسیۆس هەموو شەوەکە لەتەك ئەو دابوو، وەلامی پرسیارەکانیدەداوە و بەبێ ئەوەی تەماشای هیچ کام لە دوو سعاتەکەی بەرباخەڵی بکا. لە هەر چرکەیەکدا کە ژەنەراڵ دەیپرسی بە سعات و دەقەوە کاتەکەی پێدەوەت. کاتێ کە ژەنەراڵ پێی نەدەماو نەیدەتوانی جۆلانەکە راژێنێ خۆزەپالاسیۆس رایدەژاند. توانی ژەنەراڵ بۆ سعاتەوەختێك بخاتە خەو. بەڵام بەر لە سپێدەی بەیان لە دەنگی ئاژەڵ و مرۆڤانی ناوەخت لە خەو ڕاپەڕی و هەر بەمجۆرە بە جلو بەرگی خەوەوەو بە پێشوازی پۆست بەرەو حەوشەی ماڵێ چوو.

راوێژکارە لاوە مەکسیکیەکەی ئاگۆستین دایتوربیدە کە بەهۆی چەند گیروگرفتێکەوە لە سانتافە نەیتوانی بوو دەگەڵ ژەنەراڵ دابێت. لەگەڵ ئەم کاروانەدا هاتبوو نامەیەکی لە دەریاسالار سوکرەوە

هێنابوو کە سوکرە لە نامەکەدا بەهۆی ئامادەنەبوونی لە ڕێو ڕەسمی خواحافیزەیەکەدا زۆری داخ و مەخابنی نیشاندابوو، لە پۆستەکەدا نامەیەکی دیکەش بۆ ئەو هاتبوو کە پریزدێنت کایسدۆ بۆی نووسیبوو. چەند چرکەساتێك دواتر فەرمانداری (پوسادا گوتی یەرز) خۆی بە ژۆرەکەی ژەنەراڵ داکرد و چەند پارچەیەکی بڕاوی ڕۆژنامەکانی بەیانی پیشاندا. ژەنەراڵ داوای لێ کرد تا ئەوانەی بۆ بخوێنێتەوە، چونکە هێشتا ژۆرەکە هێندە ڕووناك نەبوو تا بۆ خۆی بیخوێنێتەوە.

هەواڵی نوێ ئەمە بوو کە یەکشەممە باران لە سانتافە وەستابوو و ڕۆژەکەی هەتاوی و خۆشبوو، خێزانێکی زۆر بە خۆیان و خاوو خێزانەوە و بەسەبەتەی پڕ لە خواردەمەنی وەك کودەڵە بەرازی سوورکراوەو کفتەی برنجو سێوی بنئەرزی و پەنیرەوە بۆ هاوینەهەوارەکان وورژمیان هێنابوو و لە ژێر سۆرەی هەتاوێدا کە لە مێژ بوو نەیاندیتبوو، دانیشتبوون و نانیان خواردبوو. ئەم شتە سەیرو سەمەرە و عاجباتیە نارحەتیەکانی ڕۆژی شەممەی لەبیردەبردەوە.

قووتابیانی سان بارتولۆمە دووبارە ڕژابوونەوە سەر شەقامەکان و دەکەوتنەوە خوێندنەوەی ئەو شیعرانەی کە زۆرجاران خوێندبوویانەوە بەڵام کەس گوێیان پێنادا حەوسەڵەیان لەسەردا نامێنێ و کەم کەمە پەرتەی لێدەکەن. دوای دەمێك دووبارە لە نێوان خەڵکێکی کە خۆیان لەبەرهەتاو گەرم دەکردەوە، پەیدا دەبنەوەو کایەکی دیکەش دەکەنەوە سەماو قونبادان و گۆرانی گوتنەوە تا لە پڕێك سعات پێنجی دوای نیوەڕۆ باران بە لێزمە دادەکاتەوەو ئاهەنگەکەیان لێتێکدەدا.

پوسادا گوتی یەرز وازی لە خوێندنی ڕۆژنامەکان هێنا و بە ژەنەراڵی وت:

"هیچ شتێك لەم جیهانەدا ناتوانێ لەمەزنی تۆ کەمبکاتەوە، هەرچیەکی دەڵێن با بیلێن، قوربان ئێوە بە نێو بانگترین و گەورەترین کۆلۆمبایی ڕووی زەمینن."

ژەنەراڵ وەڵامیداوە: "گومانم نییە. تەنیا ئەوە بەسبوو من بڕۆم، تا دووبارە خۆر هەڵبێتەوە."

ژەنەراڵ لە نێوان داواکاری ئەو ڕۆژنامانە و پارچە ڕۆژنامە بڕاوەکاندا تەنیا لە شتێك نارحەتبوو، ئەویش ئەمەبوو کە یەکێك لە ڕاوێژکارانی سەرۆك کۆمار، لایەنگرانی سانتاندرایان بە لیبرال لە قەڵەم دابوو و ئەمەش بە بۆچوونی ژەنەراڵ کارێکی خراپبوو و خراپ بەکاری هێنابوو، ژەنەراڵ بە تووڕەییەوە وتی: "نازانم ئەم خەڵك فریودەرانە بە چ مافێك خۆیان بە لیبرال ناو دەبەن. وەك هەر شتێکی دیکەی بەردەستیان بکەوێ، ئەم وشەشیان دزیوە."لە ناو جۆلانەکەی دەرپەڕی و هەر بەو شێوەی کە ژۆرەکەی بە هەنگاوی سەربازیانە دەپێوا دیقی دڵی خۆی بە فەرماندا هەڵدەڕێژت سەرئەنجام وتی: "ڕاستی ئەمەیە کە لێرە لە دوو حیزب زیاتر

نییە، یەکیان لایەنگرانی من و ئەویدی ئەوانەن کە دژی منن و ئێوە ئەمە لە من باشتر دەزانن. لەگەڵ ئەمەی کە باوەڕیش ناکەن، بەڵام هیچ کەسێك لە من لیبڕالتر نییە."

تەتەرە تایبەتیەکانی فەرماندار، نامەی مانوێلایان یان بۆ ژەنەراڵ هێنا، مانوێلا نامەیەکی نەنووسیبوو، چونکە هەموو پۆستەچییەکان دەستووری تەواویان پێبوو کە هیچ نامەیەکی ئەو قبووڵ نەکەن. ئەو خۆی ئەم تەتەرەی ناردبوو و لە هەمانکاتدا نامەیەکی ناڕەزایی ئامێزی لەمەڕ ئەم فەرمانەوە بۆ سەرۆك کۆمار نووسیبوو ئەو کارە دەبێتە هۆی هاندان و نانەوەی گێروگرفتێك کە سەرنجام بە دوورخستنەوەو فەرامۆشکردنی مانوێلا دەشکێتەوە. لەگەڵ ئەم هەواڵە ناخۆشەشدا، بە پێچەوانەی ئەوەی پوسادا گوتی یەرز چاوەڕێی دەکرد کەبە پەیوەندی ئەو دوو دڵدارەی دەزانی. ژەنەراڵ بە زەردەخەنەیەکی تاڵەوە گوتی: "نانەوەی هەڵاوهوریا حاڵەتێکی سروشتی دڵدارەکەی منە."

خۆزەپالاسێوس بەهۆی نەبوونی بەرنامەڕێژی راست و دروست لەم سێ رۆژە لە ئاوندا زۆر تووڕەبوو و ئەو نارحەتیەی نەدەشاردەوە.

سەرسوڕمێنترین بانگهێشتی ئەو سێ رۆژە سەردانی کانەکانزاکانی (نو) ی سانتائانا کە لە مەودای شەش ئەلگۆی ئەو ناوەدابوو بەڵام لەوەشی سەرسوڕهێنتر ئەوەبوو کە ژەنەراڵ ئەو بانگهێشتەی قبوڵکردو دیسانەوەش لەمە عاجباتیتر ئەوەیە کە ژەنەراڵ چووە ناو رێڕەوێکی تونێلی کانە نوقرەکان. بەڵام ئەمە دواکار نەبوو، لە گەڕانەوەدا لە تاو ژانەسەری زۆر لەگەڵ ئەوەشدا هانکەهانکی بوو، خۆی فڕێدا ناو ئاوی رووبارەکەو تێکەوت[1]. لەو رۆژانەدا ئامادەبوو گرەوبکا کە بە دەستێکی بەستراوەوە لە رووبارێکی بەخوڕ بپەڕێتەوە و لە باشترین مەلەوانانیش بباتەوە، وەختێکی زۆر تێدەپەڕی. بەڵام بە هەر حاڵ ئەمجارەش بەبێ ماندوبوون نیو سعات مەلەی کرد، هەرچەند کەسانێك کە پێیە باریك و لاقەپرغە دەرپەڕیوەکانیان دیت. نەیاندەتوانی باوەڕ بکەن کە بەم لەشە لەڕو لاوازەوە چۆن تا ئێستا ژیاوە.

لە دوا شەودا، (شارداری) دانیشتن و ئاهەنگێکی سەمای بۆ سازکرد کە ژەنەراڵ بەهۆی پیادەڕۆیشتنی رۆژانە و شەکەتیەوە عوزریهێناوەو لەو ئاهەنگەدا بەشدارینەکرد. لە سعات پێنجەوە خۆی کوتاوە ژۆرێ.

و نامەیەکی بۆ ژەنەراڵ دۆمینگۆ کایسدۆ بە فرناندۆ نووسیەوە، ئەوساکە داوای لێکرد کە چەند لاپەڕەیەکی لە چیرۆکەکانی لیما بۆ بخوێنێتەوە کە لە هەندێکی ئەو چیرۆکانە خودی

---

١ تێکەوتن: مەلەکردن

ژەنەراڵ دەوری سەرەکی هەبوو، دوای ئەوە چووە حەمام و پاشان بێهەست و خوست چۆوە ناو جۆلانەکەی و لێی درێژبوو و گوێی دایە ئەو مۆسیقایەی لە ئاهەنگەکەوە دەهات. خۆزەپالاسیۆسیش لە هەمان حاڵدا کە نووستبوو گوێی راگرتبوو تا ئەمکاتەی کە ژەنەراڵ لێی پرسی: "ئەم ڤالسەت لەبیرماوە؟"بە فیکە فیك چەند نۆتەیەکی ڤالسەکەی چڕی تا یادی لە زەینی پێشخزمەتەکەی خۆیدا زیندووبکاتەوە. بەڵام خۆزە بەبیری نەهاتەوە ژەنەراڵ گوتی: "ئەو شەوەی کە لە چوکیساکاوە گەیشتینە لیما، ئەم مۆسیقایە لە هەموو شوێنێك لەهەموو کۆڵانەیەکدا لێدەدرا."خۆزە پالاسیۆس هەر بەبیری نەدەهاتەوە. بەڵام هەرگیز ئەو شەوە پڕشکۆیەی هەشتی شوباتی ساڵی ١٨٢٨ ی لە بیرنەدەچۆوە.

ئەو رۆژە لیما پێشوازیەکی پاشایانەی لە ژەنەراڵ کرد و ئەو لەگەڵ هەر سڵاو و لە هەموو بۆنەو کاتێکدا رستەیەکی دووبارە دەکردەوە.

لەم وڵاتە پان و بەرین و بەرگوشادەی پیرۆدا یەك ئیسپانیاییش بۆ دەرمان نەماوە. ئەو رۆژە سەربەخۆیی ئەو کیشوەرە گەورە تەواو ببوو ئەو کیشوەرەی کە بەپێی قسەی ژەنەراڵ خۆی دروستی کردبوو تا ئەو بۆ بەرفراوانترین عاجباتیترین یان بەهێزترین وڵاتی رووی زەوی بگۆڕێ. هەر هەموو جۆش و خرۆشی ئەو ئاهەنگە بەو سەمایەوە بەسترابۆوە. چونکە کە ژەنەراڵ فرمانیدا سەمایەکە ئەوەندە دووبارە بکەنەوە تا بتوانێ سەما لەگەڵ هەموو میوانەکانی دا بکا. ئەفسەرەکانی کە جلوبەرگی رەسمی و رێك و خاوێنیان لەبەردابوو، ئەوەندەی توانیان لەگەڵ ئەودا سەمایانکرد. ئەوان زۆرلیهاتووبوون و یادی ئەو سەمایە لە دڵی هەموو سەماکەرەکانیدا پتر بۆ یادی سەرکەوتنەکانی جەنگ بوو.

لەو دوا شەوەی ئاوندا ئاهەنگەکەیان بەهەمان سەمای سەرکەوتن دەستپێکرد ژەنەراڵ لەناو جۆلانەکەی خۆی لە چاوەڕوانیدا ماوە و گوێی هەڵخست بەڵکە دووبارەی کەنەوە. بەڵام لەبەرئەوەی هەواڵی دووبارە کردنەوەی نەبوو. لەپڕ لە جێگادا راستبۆوە و هەر هەمان جلو بەرگی کە بەیانی بۆ سەردانی کانەکانزاکان لەبەریکردبوو، لەبەرکردەوەو بەبێ هیچ ئاگاداریەکی پێشوەخت چووە ناو ئاهەنگەکەوە سێ سعات سەمایکرد و هەرجارەی کە سەماکەرەکەی بەرانبەری دەگۆڕی. فرمانیدەدا مۆسیقاکە دووبارەکەنەوە، رەنگە دەیویست خۆڵەمێشی زەمانە لە شکۆو گەورەیی سەردەمی رابردووی بتەکێنێ.

ئەو زەمانەی کە تەنیا ئەو لەناو ساڵۆنە چۆلەکەدا تاسپێدەی بەیانی لەگەڵ دوا ژنی کە دەماوە و سەمایدەکردو ئەوانیدیکە خۆیاندەدا بەدەستەوە ساڵانێك تێپەڕیبوو هێندەی حەز لە سەمابوو کە بەبێ ئەوەیش کەس سەمای لەگەڵ بکا خۆی تەنیا سەمایدەکرد یان لەگەڵ ئاوازی

فیکەفیکی خۆی درێژەی بەسەماکەیدەداو شادی و خۆشی خۆی بەسەماکردن لەسەرمێزی گەورەی نانخواردندا بەدیارخست. لەو دوا شەوەی ئاوندای ئەوەندە بێتوانابوو کە لە نێو سەماکەدا دەمنا دەمێك پشووی دەداو دەسماڵە بۆن کۆلۆنیاکەی خۆی بەبەردەم و لووتیەوە دەگرت تا هەناسەی باشتر بۆ بدرێ. بەڵام ئەوەندە بە خۆشی و شاگەشکەیی و ئارەزووەوە سەمایکرد کە بەبێی ئەوەی خۆی ئاگای لێبێ، هەر هەموو پڕوپاگەندەکانی سەر نەخۆشیەکەی بەدرۆخستەوە کاتێك بەرەو ماڵ گەڕاوە. شتێك لەنیوەشەو رابردبوو، ئاگاداریانکرد کەوا خانمێك بۆ دیداری ئەو لە سالۆنەکە چاوەڕێی دەکا، رێکپۆش و بەژن بەرز بوو، بۆنی گوڵی بەهارانی لێدەهات. کراسێکی مەخمەڵی قۆڵدرێژی لەبەردابوو، پێڵاوی لە باشترین پێستەی لەپێدابوو کڵاوێکی گەورەی بە داوێکی ئاوریشمیەوە لەسەرکردبوو، ژەنەراڵ لەبارو ساتی ئەو دیدارە بەسەر سامیەوە سەلامێکی کورت و رەسمی لێکرد. ژنەکە بەبێ ئەوەی دەمی لێکبکاتەوە خورجنێکی زۆر چکۆلانەو کۆنەی کە بە گەردەنیەوە شۆڕببۆوە بەرچاوەکانی ژەنەراڵی گرت.

ژەنەراڵ هاواریکرد: "میراندا لیندسی."

میراندا وتی: "خۆمم، بەڵام زۆر گۆڕاوم."

دەنگێکی گەرمی وەك ئاوازی کەمانچەی هەبوو کە کەمێکی هی کاریگەری زاراوە ئینگلیزییەکەی بوو، ئەم دەنگە یادەوەریەکی زۆری لای ژەنەراڵ زیندووکردەوە. بەدەست ئاماژەی کردو فرمانیدا کە ئەو پاسەوانەی لەناو چەقی دەرگاکە وەستابوو بڕوا. بەرانبەری میراندا دانیشت. زۆر لە نزیکیەوە ژەنەراڵ لە دەستەکانی ئەویگرت. پێشی پازدە ساڵان کاتێك کە ژەنەراڵ ماوەی دووەمین جاری دوورخستنەوەی خۆی بەسەردەبرد، لە میوانداریەکی ئاسایی لە ماڵە بازرگانێکی ئینگلیزی کە ناوی مکسون هایسلوب دەرکینگستۆن بوو لەگەڵ یەکدا ئاشنایەتیان پەیداکرد. تاکە کچی دیپلۆماتێکی خانەنشینی ئینگلیز بوو ناوی سێڕ لەندەن لیندسی بوو کە لە کارخانەیەکی قەندی جامایکا نیشتەجێ بوو خەریکی نووسینی کتێبێکی شەش بەرگی بوو لەمەڕ یاداشت و بیرەوەریەکانی خۆی کتێبێك کە کەس نەیخوێندەوە، لەگەڵ ئەو هەموو جوانیە سەرسوڕهێنەرەی میرەندا دڵی ناسکی ئەو لاوە دوورخراوەیە، لەو سەردەماندا ئەو لاوە ئەوها نقومی ناوخەون و خەیاڵەکانی خۆی بۆ کچێکی دیکە بوو کە جگە لەو بەری بە هیچ کچێکی دیکەوە نەبوو.

لەبەر زەینی میرەندادا ژەنەراڵ و بەخەتی سمێڵ و ریشی زبروڕەشەوە بە قژی درێژیەوە کە تا ناوشانەکانی هاتبوونەخوارێ. زۆر بە تەمەنتر لەسی و دوو ساڵ دەهاتەبەرچاووە وەك لاوە خانەدانەکانی ئینگلیزی جلی پۆشی بوو، جل وبەرگێکی ئەستوری لەبەردابوو کە بۆ ئەو ئاوهەوایە نەدەگونجا. بۆینباخی سپی لەبەرکردبوو گوڵیشی لە شوێنی قۆپچەکە دابوو، بەم روو

و روخسارو سەرو کەللەوە، لەیەکێك لە شەوەکانی ساڵی ١٨١٠ دا سۆزانیەك ئەوی لەباتی هاوجنس بازێکی سۆزانی خانەکانی لەندەن بەهەڵەگرتبوو.

بەڵام ئەوەی لە هەموو شتێك زیاتر لە یاد دەماوە، باش یان خراپ چاوە مات و سەرسامەکانی ئەو و تەرزی قسەکردنی ئەو بوو کە بەدەنگێکی خۆشی وەك جریوەی چۆلەکە یەك بە دوای یەکدا و بەبێ هەستکردن بە ماندووبوون قسەی دەکرد. لە هەمووی سەیرتر ئەمەبوو و سەری لەبەرخۆی دەناو بەبێ ئەوەی راستەوخۆ تەماشای ئەو کەسە بکا کە قسەی بۆ دەکا، سەرنجی ئەوی بۆ خۆی رادەکێشا.

تەرزو ئاوازی قسەکانی وەك دانیشتوانی دوورگەکانی کەناری و شێوەی قسەکردنی وەك خەڵکی مادرید بوو کە هەڵبەتە ئەو رۆژە لەبەرئەوەی دوو میوان لەوێبوون و ئیسپانیان نەدەزانی بە ئینگلیزیەکی سەرو گوێلاك شکاو بەڵام مرۆڤ تێیان دەگەیشت قسەی دەکرد.

لەسەر فراویندا جگە لە خۆی و قسەکانی بەری وەکەسەوە نەبوو. بەبێ وەستان و بێئەوەی قسەکانی لەبەرکردبێ، بە سۆزو سەرنج راکێشانێکەوە بەشێوەی شیعرو خوێندنەوە دەدوا. قسەی پێشوەخت و کاڵو نەگەییوی کرد کە زۆریان لە رۆژی دواییدا لە رۆژنامەکانی کینگستوندا چاپکرابوون و لە دواییدا مێژوو ناوی لەو بڵاوکراوە نا جامایکا، ژەنەراڵ گوتی: "ئەم ئیسپانیانە نین بەڵکە یەکنەگرتوویی خۆمانە کە جارێکی دیکە ئێمەی خستۆتەوە ژێر باری کۆیلەیەتی."هەر کە قسە دەهاتە سەر گەورەیی ئەمریکاو هۆشتیژی و زرنگی ئەمریکیەکان، زۆرجاران دووبارەی دەکردەوە ئێمە نەژادێکی بچووکی نێو مرۆڤانین، باوکی میراندا لە گەڕانەوەی بۆ ماڵێ بیروڕای ئەوی لە بارەی ئەم کەسەو، کە تا ئەم رادەیە ئارامی لەبەر کاربەدەستان و سیخوڕەکانی دوورگەکەی بڕیوە ، پرسی، میرانداش بەیەك رستەدا هەموو شتێکی کورتکردەوە، ئەو وای دەزانی بۆناپارتە."

دوای چەند رۆژان ژەنەراڵ پەیامێکی لە میراندا بۆهات کە فرمان و رێ و شوێنی وردی تێدابوو تا بتوانێ شەممەی ئاینندە سعات نۆی شەوێ تەنیاو پیادە لە شوێنێکی چۆڵدا بچێتە دیدەنی ئەم خواستە نەك تەنیا بۆ گیانی ئەو بەڵکە بۆ چارەنووسی ئەمریکا ترسناك بوو، چونکە ئەو لەو سەردەمەدا تەنیا بە پاشماوەی راپەرینێکی سەرکوتکراو دەژمێردرا، دوای پێنج ساڵ سەربەخۆیی. ئیسپانیا دووبارە وڵاتەکانی نیوباگرانادا، و ڤەنزویلای داگیرکردبۆوە بەبێ ئەوەی کە هیچ کەسێك لەبەرانبەر هێرشە خێراییەکەی ژەنەراڵی ئیسپانی پابلۆ مۆیجۆ، کە بە ئاشتیخواز ناسرابوو، بەرگری بکا، مۆریجۆ بەپێی قاعیدەیەکی خێراو رحەت هەر هەموو ئەو کەسانەی کە خوێندن و نووسینیان دەزانی لە سێدارەدا هەر هەموو فەرماندەکانی هێزە جیاوازی خوازەکانی کوشت.

له ڕەچەڵەکی کەسانێکی کە لە مەکسیکەوە تا ڕووباری لاپلاتا تۆوی سەربەخۆییان چاندبوو، ئەو زیرەکترین و سەرسەخترینیان بوو لە هەمووان باشتر هۆشی سیاسی خۆی لە جەنگ دا بەکاردەهێنا. لەخانوویێکی بەکرێ لەگەڵ دووهاوڕێ لە ڕاوێژکەرانی سەربازی و دوو کۆیلە کە لە دوای ئازادیاندا خزمەتی ئەویاندەکرد و لەگەڵ خۆزەپالاسێوس دەژیان بەحسێبی ئەو هەلاتنی بە تەنیا و بەپێی پیادە، نەك قبولی ترسێکی بێهودەبوو ، بەڵکە کارێکی گەمژانەی مێژوویی بوو ، بەلام لەگەڵ ئەو هەموو نرخەی کە بۆ گیانی خۆی و ئەو ڕاپەرینەی دادەنا، کەچی هیچ شتێك هێندەی ژنێکی شۆخ و شەنگ نەیدەتوانی بیجوولێنێ. میراندا بەسواری ئەسپەوە لە ژوانگە چاوەڕێی بوو. ژەنەراڵ سواری تەرکی ئەسپەکەی کرد و هەردووکیان کەوتنەڕێگا باران بوو و لەبەرزاییەکی دووری ئاسمان چەخماغەی هەورە بروسکانبوو، چەند سەگێك لەم لاو ئەو لای ئەسپەکەوە دەبەزین و حەپەحەپیان بوو ، بەلام میراندا بە چەند وشەیەکی کە بە ئینگلیزی دەیوت ئارامیکردنەوە. لە نزیك کارخانە قەندەکەی ئەو شوێنەی کە سێر لەندەن ليندسی بیرەوەرەیەکانی دەنووسیەوە و جگە لە خۆی ئاگای لە زاڵی بیزەواڵ نەبوو، تێپەڕین، دوایی لە ڕووبارێکدا پەڕینەوە و چونە ناو دارستانێکی دارکاژی ئەو بەری ڕووبارەکە کە کلێسایەکی وێرانەی لە دواوە بوو. لە ئەسپەکە دابەزین. میراندا دەستی ژەنەراڵی گرت و ئەوی بۆناو وێرانەکە ڕێنمایی کرد. لە ساڵۆنی نوێژو دوعا خوێندن کە تاریك بوو، تێپەڕین و چونە ناو ژوورێك کە تەنیا بە شاپلێتەیەکی کە لە دیوارەکە چەقێنرابوو ڕووناك دەبۆوەو لەدوو کاریتە بترازێ کە بە زەبری تەور داتاشرابوون و وەك کورسی لێکرابوون بۆ دانیشتن. هیچ شتێکی دیکەی بۆ دانیشتن لێنەبوو، تەنیا لەو کاتەدا بوو کە ڕووی یەکدیاندیت ژەنەراڵ کراسێکی قۆڵدرێژی لەبەردابوو و قژی لەگەڵ داوێك وەك کلکی ئەسپ شۆڕببۆوە، میراندا ئەوی لەو ڕۆژە لاوترو قۆزتر دیت کە پێکەوە فراوینیان دەکرد. ژەنەراڵ دەستپێشخەری نەکرد، لەبەرئەوەی شێوازی دلداری ئەو لەسەر هیچ پەیڕەویەکی تایبەتی نەبوو و بەپێی حاڵەتی کەسەکەی بەرانبەری بەتایبەتی لە هەنگاوەکانی یەکەمدا بۆی هەبوو بگۆڕێ. پێشتر وتبووی: "لە پێشەکی و سەرەتای دلداریەکدا هیچ غەڵەتێك قبووڵناکرێ."لەبەرئەوەی بانگهێشتەکە لە میرانداوەبوو ژەنەراڵ بیری دەکردەوە ئیدی کۆسپێك لەسەر ڕێگایاندا نەماوە ، بەلام ژەنەراڵ هەڵەی دەکرد. میراندا لەگەڵ جوانی و سەنگینیەکی زۆر خەریك بوو پێدزەی لەو گرفتە دەکردو بەم پێیە ماوەیەك ڕابورد تا ژەنەراڵ بۆیدەرکەوت کە ئەمجارەیان ئەو دەبێ هەنگاوی یەکەم بنێ. میراندا داوای لێکرد دانیشێ و هەردووکیان بەجۆرەی کە بڕیاربوو پازدەساڵ دواتر لە ئاوندا دانیشتن ، لەسەر کاریتە داتراشراوەکە دانیشتن. بەلام زۆر لە نزیك یەکەوە ژەنەراڵ دەستەکانی میرانداری گرت و ئەوی بەلای خۆیدا بەکێش هێنا و هەولێدا ماچی بکا.

میراندا کە هەستی بە گەرمایی هەناسەی ژەنەراڵ کرد خۆی لێبردەپێشێ و دوایی رووی خۆی لێ لەولاکرد و گوتی:

"هەر کارێك بە کاتی خۆی."

ئەو شەوە هەر جارێکی ژەنەراڵ دەیویست رایمۆسێ، میراندا بەم رستەیە کۆتایی بە هەموو شتێك دەهێنا نیوەی شەوێ هەرکە لەقەڵشو کەلەبەرەکانی ژێر ساپیتەوە دڵۆپەی باران دەهاتە ناو ژوورەکەوە ئەوان هێشتاش دەست لەناو دەستی یەکدی و بەرانبەری یەکتر دانیشتبوون و ژەنەراڵ شیعرێکی بۆ دەخوێندەوە کە خۆی گوتبووی ئاوازێکی کێش جوانی هەبوو و لە شیعرەکەدا باسی ئەڤین و جەنگ کرابوو میرەنداووروژاو ویستی دانەری شیعرەکە هەڵێنێ و سێ ناوی ژمارد ژەنەراڵ گوتی: "پیاوێکی نیزامیە."

میراندا پرسی: "نیزامیەکی شەڕکەرە یان هی پشت مێزان؟"

ژەنەراڵ وەڵامیداوە: "هەردوو کاران دەکا، گەورەترین و تەنیاترینی هەر هەموو ئەوانەیە کە تا ئێستا هەبوون."

میراندا ئەوەی کە دوای نانی نیوەڕۆ لە ماڵەوە بە باوکی وتبوو بەبیرخۆی هێناوە و وتی: "تەنیا دەبێ بۆ ناپارتبێ."

ژەنەراڵ گوتی: "وەبگرە وایە. بەڵام ئاکارو ورەیان لەگەڵ یەکدی لێکجیاوازە چونکە دانەری ئەم شیعرە ماوەی نەدا کە تاجی لەسەر سەردا بنێنن."

هەرچەندەی بولێلەی بەیان نزیکتر دەبۆوە، وورژمەکانی ژەنەراڵیش زیاتر دەبوون. میراندا هەولێدەدا بەشێوەیەك ژەنەراڵ بۆ دواوە بگەڕێنێتەوە و نارحەتیشی نەکا. تەنیا ناوە ناوە رێگای دەدا دەمی بیگاتێ و ماچێکی لێبکا و هەموو جارێکیش دەیگوت: "هەموو کارێك لەدەم و کاتی خۆی."

ژەنەراڵ گوتی: "بەیانی سعاتی سێی پاشنیوەڕۆ من بەیەکجاری بەرەو هایتی دەڕۆم."میراندا بەزرنگی ژەنەراڵ پێکەنی و گوتی:

"یەکەم ئێوە تا هەینی بەرەو هایتی ناڕۆن و دووەم ئەو کێکەی کە ئێوە بە تەرنەر خانمتان بەڕاداناوە ئیمشەو بۆ ژنێکی دەبەن کە لەم جیهانەدا لە هەموو کەسێك زۆرتر ڕقی لە من دەبێتەوە."ئەو خانمەش ناوی خولیا کۆبێر بوو و خەڵکی دۆمینکانبوو ژنێکی زەریف و دەوڵەمەندبوو. لە جامایکادا دەژیا و بەپێی قسەکانی ژەنەراڵ چەند شەوێك لە ماڵی ئەودا مابۆوە. ئیمشەو بڕیاربوو بەیادی لە دایکبوونی خولیا ئاهەنگ بگێڕن.

ژەنەراڵ وتی: "تۆ تا لە سیخوڕەکانیشم باشتر لە دەنگ و باسەکان ئاگاداری."میراندا گوتی: "بۆچی وابیرناکەیەوە کە رەنگە منیش یەکێکیم لە سیخوڕەکانت؟"ژەنەراڵ تا سەعاتی شەشی بەیانی ئەو حەلەی کە بۆماڵێ گەڕاوە لە ناواخنی ئەم رستە نەگەیشت.

وەختێ کە گەیشتەوە ماڵ و فلیکس ئامستۆی دۆستی بە کوژراوی لەناو جۆلانەکەیدا دۆزیەوە ئەگەر ئەو ژوانە نەدەبوو هەنووکە ئەو لە جێی دۆستەکەی کوژرابوو فلیکس چاوەڕوانی ژەنەراڵی دەکرد تا هەواڵێکی گرنگی بداتێ. لەم سەروبەندانە دا لەناو جۆلانەکەی ئەو راکشابوو خەو بردبوویەوە لەم حاڵەشدا یەکێك لە کۆیلە ئازادکراوەکان کە ئیسپانیایی بەکرێیانگرتبوو بەو خەیاڵەی کە ژەنەراڵ لەناو جۆلانەکەیدا نووستوە. بەرچەقۆی دابوو بە یازدە چەقۆ لە لەوەڕی خستبوو. میراندا لە پلانەکەی ئەوان ئاگادارکرابۆوە، بەڵام جگە لە بانگکردنی ژەنەراڵ هیچ چارەیەکی دیکەی بۆ بەرگرتن لەم کارە بە خەیاڵدا نەهاتبوو ژەنەراڵ هەوڵیدا کە خۆی سوپاسێکی تایبەتی بکا بەڵام ئەو وەڵامی نامەکانی ژەنەراڵی نەداوە، ژەنەراڵ پێش رۆیشتن بۆ پرتۆ پرنس[1] لە رێگای خۆزەپالاسیۆسەوە پشتەکۆڵەیەکی کە لە دایکیەوە بە میرات بۆی بەجێمابوو، بۆ میراندا نارد و لەگەڵ ئەو نامە مۆرنەکراوە کە لەیەك دێردا نووسرابوو و تێیدا نووسرابوو:

"مەحکومم بە چارەنووسێك کە وەك شانۆنامەیەك وایە."میراندا هەرگیز لەمەبەستی رستە ناوەرۆك نادیارەکەی ئەو لاوە جەنگاوەرە نەگەیشت، بەڵام هەرگیزیش لەبیری نەکرد، ژەنەراڵ لە ساڵانی دواییدا بەکۆمەکی سەرۆك کۆماری هایتی ژەنەراڵ ئەلکساندەر پتیۆن و دەستەیەك سەرباز بەپای پەتی لە شاخ و کێوەکانی ئاندا تێپەڕی و لەپردی بۆجاکا[2] ئیسپانیەکانی تێکشکاند. بۆ دووەمجار و دواجار نوئباگراناداو دوای ئەوەش زێدی خۆی واتە ڤەنزویلای ئازادکردەوەو لە ئەنجامدا وڵاتی سەخت و دژواری باشوور تا سنووری ئیمپراتۆریەتی بەرازیل لە چەنگی ئیسپانیەکاندا دەرهێنا. میراندا تا هەنگاوەکانیشی لە دوای هەنگاوی ئەودا دەنا بەتایبەتی لە رێگای ئەو موسافیرانەی کە هەمیشە لەمەڕ شاکارەکانی ژەنەراڵ شتیان دەگێڕاوە. وەختێ کە وڵاتە داگیرکراوەکانی پێشووی ئیسپانیا سەربەخۆیی خۆیان وەرگرتەوە میراندا شوی بە نەخشەچییەکی ئینگلیزی کرد. ئەوان بۆ نوئباگرانادا کۆچیانکرد، لەبەرئەوەی پیاوە کارەکەی گۆڕی و دەیویست لەگەلی ئاوندا قامیشی شەکری جامایکایی بچێنێ. رۆژی پێشوو هاتبووە ئەوێ بیستبوی کە دۆستی دێرینی ئەو هەمان دوورخراوەی کینگستۆن کە تەنیا

---

١ پایتەختی هاپتی

٢ بۆجاکا : ناوچەیەکە لە کۆلۆمبیا .

سیٚ له گوا له ماڵەکەی دووره، بەڵام هەر کە گەیشتە کانە زیوەکان ژەنەراڵ ئەویٚی جیٚهیٚشتبوو بۆیە بۆ دیدەنی ئەو ناچار بوو دانی [1] رۆژیٚکی دیکە ریٚگا بکوتیٚتەوه.

میراندا ئەگەر بەشیٚوەیەکی ئاسایی بەبیٚ ئەوەی خەتی سمیٚڵ و ریشی سەردەمی لاویٚتی بینیبیٚ هەر بەو قژە سپی و تەنکەی ژەنەراڵی دەدیت، نەیدەناسیەوه حاڵ و باری ژەنەراڵ ئەم هەستانەی لەنیٚو ئەودا دروستکردبوو کە وەك لەگەڵ مردوویٚك قسەبکا، کاتیٚك کە میراندا دڵنیابوو لەوەی کە لە شەقام ئەو ناناسن، ویستی رووی خۆی ئاشکرابکاو بەهەمان حاڵەت لەگەڵ ژەنەراڵدا قسە بکا. بەڵام خەیاڵی ئەمەی کە ژەنەراڵ ئاسەواری رۆژگاری رابردوو لە چەهرەیدا دەدینیٚ ئەوی لە م کارە پەژیوانکردەوه هەر لەگەڵ ئەمەی بەخیٚرهیٚنان و پیٚشوازیەکە تەواوبوو، میراندا بەپەلە مەبەستی خۆی خستەروو و گوتی: "هاتوم تا داخوازیەکتان لیٚبکەم."

ژەنەراڵ گوتی: "بەهەموو قەوارەیەکمەوه لە خزمەت و ژیٚرفرمانی ئیٚوەدام."میراند وتی: "دەبیٚ باوکی پیٚنج مندالاٚنم لەبەر کوشتنی کەسیٚك سالاٚنیٚك لە زینداندا بەسەر ببا."ژەنەراڵ پرسی: "ئایا بەریٚزو شانازی و سەربلٚندیەوه کوشتی؟"

میراندا وەلاٚمیداوه، له دوئیلێك[2] ئەوی کوشت. هەروەها درێژەی پێداو وتی: "لەبەر ئێرەیی پێبردن بوو."

ژەنەراڵ گوتی: "گومانی تیٚدا نییە بیٚ بناغەو هۆ بووه."

میراندا وەلاٚمیداوه: " بەبیٚ هۆ هەر نەبووه."

ئیدی هەموو شتیٚك پەیوەندی بەڕابردووەوه هەبوو، تاکە داخوازیەکی کە میراندا هەیبوو ئەمەبوو کە ژەنەراڵ بە زەبری توانای خۆی پیاوەکەی لە زیندانیٚدا ئازاد بکا، ئەو حەلە ژەنەراڵ راستیەکەی ئاشکراکرد:

"هەروەك دەیبینی، نەخۆش و بیٚتوانام، بەڵام بۆ ئیٚوه هەرکاریٚکبیٚ جیٚبەجیٚی دەکەین."

ژەنەراڵ کاپیتان ئایبارای بانگکردو فرمانیپیٚدا کە ئەم بابەتە بە خاڵ و فاریزەو ویٚر گوڵەوه بنووسیٚتەوەو هەموو هەوڵیٚکی خۆی بەکاربیٚنیٚ تا بتوانی زیندانیەکە ئازاد بکا، هەر هەمانشەو بەتەنیایی لەگەڵ ژەنەراڵ پوسادا گوتی یەرز گفتوگۆو تەگبیریکرد، بەڵام تا ناساندنی پیٚکهاتەی دەوڵەتی نویٚ هەموو کاریٚك راگیرابوو، میراندای تا ناو دەرگا بەریٚکرد لەویٚدا شەش کەسی لە کۆیلە ئازادکراوەکانی چاوەڕیٚی بوون. ژەنەراڵ دەستی ماچکردو خواحافیزلیٚکرد.

---

١ دان: نیوەرۆژ ، دانی سبەینیٚ ، دانی ئیٚواریٚ.

٢ دوئیل : مبارزە لە پیٚناو بەرگریکردن لە شەرەف.

میراندا گوتی: "شەوێکی زۆر خۆشبوو."
ژەنەراڵ خۆی پێڕانەگیراو پرسی:
"ئەم شەوە یان ئەوێ شەوێ؟"
میراندا وەڵامیداوە: "هەردووکیان."

سواری ئەسپێکی رەسەن و حەساوە بوو بە بێئەوەی ئاوڕبداتەوە دواوە، تیژ لەو شوێنە دوورکەوتەوە ژەنەراڵ ئەوەندەی ئارامگرت تا میراندا لە کۆتایی شەقامەکە ئاوابوو ئیدی نەیدیتەوە ، بەڵام بەیانی کە خۆزەپالاسیۆس لە خەوێی هەستاند تا درێژە بەسەفەرەکەیانبدەن و بکەونەڕێ. ژەنەراڵ تازە خەوی بە میراندا دەدیت.

حەوت ساڵ پێشتر ژەنەراڵ مۆڵەتی تایبەتی کەشتیەوانی بە دەریاوانی ئەلمانی خوان بە ئەلبێرس دابوو، خۆشی جارێکیان لەگەڵ یەکێك لە کەشتیەکانی ئەو سەفەریکردبوو لە بارانکانوئبا، لەگەڵ تێپەڕین لە بەندەری ئاوکانیا، بۆ بەندەری رئال چووبوو و گوتبووی کە ئەمە رێگایەکی ساناو خۆش و دڵنیاترە بۆ سەفەرە لەگەڵ ئەمەیشدا دەریاوان ئەلبێرس دەیوت کە ئەم کارە هیچ سوودێکی بۆی نییە. مەگەر ئەمە کە خاوەندارێتی سنووردارێتی کەشتیەوانی بەو بدرێ و کاتێکی کە ژەنەراڵ سانتادرا سەرۆکی کۆمار بوو، ئەم خاوەندارێیتەی ئیمتیازەی بەودا دووساڵ دواتر ئەنجوومەن دەسەڵاتی تەواوی بە ژەنەراڵدا و ئەو ئەم خاوەندارێتییەی لە ئەلبرس وەرگرتەوە و بەمجۆرە گوتی: "ئەگەر ئەم مۆڵەتە بە تەنیا بۆ ئەلمانەکان سنووردار بکەین و بیدەینە دەستیان دوای ماوەیەك دەیدەنە وولاتە یەگکرتووەکانی ئەمریکا، دوای ماوەیەك بانگی ئازادی کەشتی لێخوڕین لە رووبارەکاندا بۆ هەموان درا، لەبەر ئەم هۆیە کاتێك کە بۆ سەفەرەکەی پێویستی بە کەشتیەکی هەڵمی بوو، رووبەڕووی زۆر گیروگرفتان بۆوە کە بەبڕوای ژەنەراڵ کارێکی وەك تۆڵە کردنەوە بوو و سەرئەنجام ناچاربوو کە بە کەشتیەکی ئاسایی سەفەربکا، فەرماندار زۆر بەپەڵە لەو دەوروبەرانە خەڵکی کۆکردبۆوە تا وەك جاریجاران بەشایستانە بەرێی بکا. بەندەرەکە لە سعات پێنجی بەربەیانیەوە پڕی خەڵك بوو کە لە پیادە سوارە پێکهاتبوون لە شوێنەکانی لەنگەرگرتن قەیاغ و کەلەکێکی زۆر دەیترا کە ئاپۆرایەکی ژن و ژاری دەم بە قاوقیژ هاوارەوە لەو ناوە بوون تاسەرنجی سەربازان بۆ خۆیان راکێشن و سەربازەکانیش بەقسەی پڕ لە تەوس و ناشیرینەوە وەڵامیان دەدانەوە. ژەنەراڵ و هاوڕێیەکانی سعات شەش گەیشتنە بەندەر. ماوەی نێوان بەندەرو ماڵی فەرمانداری شار و بەپیاسەو لەسەرخۆ بڕی لە کاتێکدا دەسماڵە بۆن کۆلۆنیاکەی بەبەردەم و لووتەوە گرتبوو.

واپێشبینی دەکرا ڕۆژێکی هەورو هەوێربێ، کۆگاکانی شەقامە سەرەکییەکانی ناوچەقی شار لە بەری بەیانیانەوە کرابوونەوەو هەندێکیشیان کاڵای دوکانەکانیان لەو گۆڕە و لەنێو کاولەکانی بوومەلەرزەی بیست ساڵ لەمەوبەر دانابوو. ژەنەراڵ بەدەسماڵەکەی وەڵامی ئەو کەسانەی دەداوە کە لە پەنجەرەکانەوە سڵاویان لێدەکرد، بەڵام ئەوان هێندە نەبوون، چونکە ئەوانەی دیکە لەبەر باری نەخۆشی ئەو سەرسوڕماو ماتبوو ن و بەبێدەنگی سەیری تێپەڕینەکەی ئەویاندەکرد، کراسێکی قۆڵدرێژی لەبەردابوو تاکە جووتە پۆتینێکی کەهەیبوو، لە پێکردبوو و کڵاوێکی پوشینی سپیشی لەسەرنابوو. کەشیشی شار لەبەر پلیکانەکانی دەرگای چوونە ژوورەوەی کێسادا وەستابوو تا گوتەیەك بۆ ژەنەراڵ بێژی ، بەڵام ژەنەراڵ کارنیو ئەوی لەمکارە پەشیمانکردەوە. ژەنەراڵ چووە پێشێ و تۆقەی لەگەڵدا کرد. لە پێچی دواییدا هەورازێك بەدەرکەوت و ژەنەراڵ بە تیلە چاوێك لەوە گەیشت کە ناتوانێ ئەم هەورازە ببڕێ. بەڵام بازووی ژەنەراڵ کارنیوی گرت و بەدارە دارە بۆی سەرکەوت تا ئەو کاتەی کە بڕشتی لەبەربڕا ئەوساکە هەوڵیاندا رازیکەن کە لەسەر کورسیەك دانیشێ کە پوسادا گوتی یەرز پێشوەخت بۆی ئامادەکردبوو.

ژەنەراڵ بەهەناسە بڕکێوە گوتی: "نا، ژەنەراڵ هیوادارم ئەم زەبوونی و کڵۆلیەم بەسەردا نەسەپێنن."ورەو خۆراگریەکەی زێتر لە تواناو بڕشتی لەشی بۆ بڕینی هەورازەکە یارمەتیدا. لەو سەری هەورازەش هێشتا هێزی تەواوی لەبەردامابوو کە بتوانێ نشێوەکە تا لەنگەرگایەکە ببڕێ لە لەنگەرگاکە لە یەکەیەکەی ئەو کەسانەی کە هاوڕێیەتیان کردبوو، بەچەند وشەیەکی دۆستانە خواحافیزیکرد. ئەم کارەی بەزەردەخەنەیەك دەکرد تاوەکو هیچ کەسێك بەوە نەزانێ کە سەفەرێکی بێگەڕانەوە دەکا. میداليا زێڕینەکەی کە وێنەی خۆی لەسەر هەڵکەندرابوو. وەك یادگار دایە پوسادا گوتی یەرز و بەدەنگێکی بەرزەوە تا هەموو بیبیستن سوپاسی لوتفی ئەویکردو زۆر بە گەرمی باوەشی تێوەرهێنا. ئینجا چووە ناو کەشتیەکەو بە تەکاندانی کڵاوەکەی بەبێی ئەوەی تەماشای کەس بکا یا بایەخ بە قەیاخ و بەلەم و منداڵەکانی دەوروبەرییدا کە وەك ماسی لەناو ئاودا مەلەیان دەکرد، ماڵئاوایی لە خەڵکەکەی لە ڕۆخ ئاوەکە وەستابوون کرد تا ئەو دەمەی کە هەموو شتێك جگە لە بورجە بڵندەکەی کلێسا، لەبەرچاو ونبوو، ژەنەراڵ هەر کڵاوەکەی تەکاندەداو بەبارێکی زۆر سەیرەوە لە خاڵێك رامابوو، دوای ئەوە چووە ناو ژوورەکەیەوە لەسەر جۆلانەکەی دانیشت و قاچەکانی لێڕاکێشا تا خۆزە پالاسیۆس بۆ لە پێداکەندنی پێڵاوەکانی یارمەتیبدا.

لە هەمانکاتدا وتی: "بابزانین ئایا ئێستا باوڕدەکەن کە ئێمە ڕۆیشتین."ناوگانەکەیان[1] لە هەشت بەلەمی گەورەو بچووك و بەلەمێکی تایبەتی بۆ ژەنەراڵ و هاوڕێیەکانی بوو، لەسەر

---

١ ناوگان: وشەکە فارسییە، بەدەستەیەك کەشتی دەوترێ کە بۆ مەبەستێك پێکەوە بن و دەریا ببڕن.

عەریشەی بەلەمەکەدا سوکانێك و هەشت سەوڵی دەسك لەداری گواجاکان دروستکراو دەدیترا. لەناوەڕاستی بەلەمەکانی دیکەدا، کەپرۆکەیەك لە گەڵاو لق و پۆپی درەختانی خورمائاسا قیتکرابۆوە کە ئامرازو کەلوپەلەکانیان لە ژێر دادەنا، بەڵام سەری بەلەمەکەی ژەنەراڵ بەپارچە قوماشێك گیرابوو کە لە ناوەوە بە قوماشێکی پەمەیی درویبوویان حەسیریشیان وەك تامان بە چوار دەوریدا گێڕابوو لەناو حەسیرەکانیشدا پەنجەرە دروستکرابوو تا هەواو رووناکی زێتر بێتەناوەوە. جۆلانەکەی ژەنەراڵیشیان لەناو ئەم ژوورە لە حەسیر دروستکراوە هەڵواسی. مێزێکی بچووکیشیان بۆ لەسەر نووسین و یاری کاغەز لێدانا. فەرماندەی کەشتیەکان کە لە نێوان باشترین مەلەوانەکان هەڵبژێردرابوو ناوی کاسیلدۆ سەنتوس بوو کە جاران کاپیتانی کەشتیەگەلێکی جەنگی بەناوی تیرادورس دلاگوئاردیا بوو، دەنگێکی خۆڕاگرانەو بەرزی هەبوو، ئازاو بێباك بوو پارچە پەرۆیەکی رەشی وەك رێگرەکانی دەریا بەسەرچاوی چەپیدا بەستبوو مانگی مایسی سەرەتای ئەو مانگانەیە کە بۆ کەشتیەکانی ئەلبرس کەشتیوانبوو، بەڵام ئەمە بۆ بەلەمەکان جیاوازی هەبوو، گەرمای کوشندە گەرداوی بەهێز رۆیشتنی پێچەوانەی ئاو و ترسی هێرشهێنانی شەوانەی گیانەلەبەری درِندە هەموویان دەستیان لەناو دەستی یەکدی نابوو تا ئیسراحەتو ئاراموئاسایش لەمووسافیران ببڕن، گرفتێکی دیکە بەتایبەتی بۆ ئەوانەی نەخۆشبوون، بۆنی سارتکو ناخۆشی گۆشت و خۆراکەکانی دیکەی کەسوێر، یان بۆ سۆبوون، کە لە قوژبنێکی بەلەمەکەی ژەنەراڵدا هەڵواسرابوون.

ژەنەراڵ هەر لەگەڵ سواری کەشتیەکە بوو ئەم دیمەنەی دیت فرمانیدا کە ئەو شتانە لەوێ هەڵگرن و کاتێك کە کاپیتان سنتوس پێیزانی کە ژەنەراڵ ناتوانێ بۆنی ئەم خواردنانەش بکا، جێگای بۆ تێکرای ئەم خواردنانە لەلای مریشك و کەڵەباب و بەرازە زیندووەکان لە کۆتایی بەلەمەکەدا کردەوە، لەگەڵ ئەمەشدا هەر لە رۆژی یەکەمەوە دوای ئەوەی کە ژەنەراڵ بە ئیشتیاوە دوو قاپی لە خۆراکی گەنمەشامی شیرین خوارد، ئاشکرابوو کە بە درێژایی سەفەرەکە لە گەنمەشامی شیرین بترازێ شتێکی دیکە ناخوا.

ژەنەراڵ دوای نانخواردن وتی: "وا پێدەچێ کە ئەمانە بە دەستە جادوویەکانی فرناندی حەفتەم لێنرابن.

هەر ئەوهاشبوو، ناوەڕاستیەکەی فرناندا باریگا و لەم ساڵانەی دواییدا چێشتلێنەری تایبەتی ژەنەراڵ بوو، ئەو هەموو دەم ژەنەراڵی ناچاردەکرد کە خواردنێك بخوا کە حەزی لێنەدەکرد، ژەنەراڵ ناوی لێنابوو فرناندای حەفتەم و ئێستا بەبێ ئەوەی ئاگای لێبێ فرناندا لەناو بەلەمەکە دابوو، کەسێکی شادو خرپنەو زۆر بلێ بوو، باشترین خاسیەتی ئەو زێتر لە دەستاو و توانای چێشتلێنانی

ئەمە بوو کە دەیزانی چی لێبنێ تا ژەنەراڵ دڵی پێخۆشبێ، منوئلا کاتی خۆی ئەوی پەیداکردبوو و ژەنەراڵیش قبووڵی کردبوو کە فرناندا لە کن منوئلا لە سانتافە بمێنێتەوە، بەڵام کاتێك کە خۆزەپالاسیۆس بە نیگەرانیەوە ئاگاداری ژەنەراڵ کارنیوی کردەوە کە ژەنەراڵ لەسەرەتای سەفەرەکەیەوە تێر بە سکی خۆی نەخواردوە، ژەنەراڵ کارنیو بەپەلە فرناندۆی لە گوادواسەوە هێنابۆوە. بەیانی هەمان رۆژ گەیشتبووە ئەوێ. بەو بەلەمەی کە زەخیرەو خۆراکیان تێدا دانابوو ئەویان شاردبۆوە تا لە کاتێکی گونجاودا ژەنەراڵ بیبینێ. لەو سەردەمەوەی کە ژەنەراڵ حاڵ و باری نەخۆشیەکەی لێ قورس ببوو، خۆراکی گەنمەشامی تەنیا خواردنێك بوو کە بە ئیشیاوە دەیخوارد و هەر لەبەر ئەم هۆیە، فرناندۆ بریاریدا کە زووتر لە وەختی پێشبینی خۆی نیشانی بدا.

یەکەمین رۆژی سەفەر دەکرا دوا رۆژی ئەوبێ، سعات دووی دوانیوەرۆ دنیا تاریك داهات و رووبار هەڵساو لافاوێهێنا بروسکەو هەورەتریشقە چەخماخەیاندەدا و ئاسمانیان رووناك دەکردەوەو وا دەهاتە بەرچاوان کە ئیدی سەوڵەکان ناتوانن رێگا لە پێکاهاتنی بەلەمەکان بگرن کە بەگابەردەکان نەکەون. ژەنەراڵی لە ژوورەکەی خۆی کردو کارەکانی رزگار بوونیان کە کاپیتان سنتوس رێبەرایەتی دەکرد، چاودێری دەکرد، بەڵام وادیار نەبوو ئامادەگی کاپیتان بۆ رووبەڕووبوونەوەی لافاوێکی ئەوها بەسبێ، سەرەتا تەنیا بۆ کنجکاوی تەماشای ئەویدەکرد، بەڵام لە دواییدا بە نیگەرانی و پەشۆکاویەوە ئەوی خستە ژێر چاودێری و لە ترسناکترین و هەستدارترین چرکەساتدا بە ئاگاهات لە کاپیتان فرمانێکی هەڵەی داوە. لەو چرکەساتەدا بەبێ ئەوەی ئاگای لە خۆیبێ و هەر بە هەستی دەروون لە جێگای خۆیدا دەرپەڕی، لەنێو باوباراندا رێگای خۆیکردەوەو فرمانێکی پێچەوانەی فرمانی کاپیتانیدا. دەم بە بانگ و هاوارەوە وتی: "نەفرەتیان لێدا، لەم لایەوەنا، لە دەستی راستەوە ، سەوڵ لێدەرەکان یەکسەر کاردانەوەی خۆیان بەرانبەر ئەم دەنگە کزە بەڵام ئاشکراو یەکلاکەرەوە بەخێرایی نیشانداو تا ئەو دەمەی گەرداوە کە نیشتەوە، ئەو رێبەرایەتی عەمەلیاتەکانی لە ئەستۆدابوو، خۆزە پالاسیۆس بەپەلە پەتۆیێکی بە ژەنەراڵ دادا. ویلسۆن و ئیبارا ئەویان بە توندی لە شوێنی خۆیدا گرتبوو، کاپیتان سەنتوس کە بۆیدەرکەوتبوو جارێکی دیکە دەستەواژەی دەریایی راست و چەپی لێتکەڵ بووە و هەڵەیکردوە لاتەریك وەستاو چاوەڕوانیکرد تا ژەنەراڵ بەدوایدا بنێرێ. کاتێك کە هات ژەنەراڵ بەتێڕوانینێکی واوە کە پیاوی دەهێنا لەرزین تەماشای کرد، ژەنەراڵ پێی وت: "بمبوورە کاپیتان."بەڵام لە ناوەوەی خۆیدا ئارامی نەگرت. ئەو شەوە بۆ یەکەمین جار بۆ نووستن لە رۆخ رووبارەکەدا هەڵیاندا و ئاگرێکیان لێکردەوە و بەدەم ئەوەوە کە لە چوار دەوری ئاگرەکە دانیشتبوون، ژەنەراڵ چەند داستانێکی لەبیرنەکراوی لە رووداوەکانی دەریا گێڕاوە. ژەنەراڵ وتی کە براکەی خوان بیسنتە باوکی فرناندۆ، کە بۆ کرینی چەك و تەقەمەنی چوبووە واشنتۆن، لە

ڕێگای گەڕانەوەی دا لە ڕووداوێکی دەریاییدا گیانی لە دەستدا. هەروەها گوتیشی کاتێك کە بە چیاکانی ئارائوکا[1] ڕەتدەبوون هێندەی نەمابوو خۆیشی دووچاری هەمان چارەنووسی براکەی بێت، چونکە هێندەی نامێنێ لە ئەسپەکە بپەڕێ. پێی لە رکێبی ئەسپەکە گیردەکاو هەر بەجۆرە ئەسپەکە لەسەر زەوی بەدوای خۆیدا ریادەکێشێ تا سەرەنجام ڕێنوماکەی لەوە سەردەکەوێ کە قایشی رکێبەکە بپسێنێ گێڕایەوە نەختێك دوای سەربەخۆیی نوئباگرانادا لە ڕێگای ئانگوستورا لە ڕووباری ئورینوکو، لەو جێگایانەی کە ئاوەکەی بەخوڕ بوو، بەلەمێك قلپ بۆوە و ئەفسەرێکی نەناسراوم دیت کە بەرەو ڕۆخی ڕووبار مەلەدەکا، بەمنیان گوت کەوا ژەنەراڵ سوکرەیە و من بەتووڕەییەوە وەڵامم داوە،: "هیچ ژەنەراڵ سوکرەیەك بوونی نییە."لە راستیدا ئەنتۆنیۆ خۆزە سوکرە بوو کە کەمێك پێشتر لەم وەختەدا پلەی بۆ ژەنەراڵی سوپای ئازادییەخشی سەرکەوتبوو و ژەنەراڵ لەو کاتەدا پەیوەندی زۆر دۆستانەی لەگەڵ ئەودا دروستکردبوو.

ژەنەراڵ کارنیو گوتی: "من ئاگام لەو پەیوەندیانە بوو ، بەڵام هەر هەموو ڕووداوەکەم نەدەزانی.

ژەنەراڵ گوتی: "ڕەنگە من لە مەیاندا لەگەڵ یەکەمین کارەساتی دەریایی سوکرە هەڵەم کردبێ، ئەو سەردەمە کە مۆریجو تاقیبی ئەوی دەکردو سوکرە لە کارتاخنامی رایکردو خوا دەزانێ ڕەنگبوو بیست و چوار سعاتان مەلەیکردبا."ئەوسا درێژەی بە قسەکانی خۆیدا."تەنیا مەبەستم ئەمەیە کە کاپیتان سنتوس بەشێوەیەك لە شێوەکان ئاگاداری بێئەدەبی ئەم دوای نیوەڕۆیە مبێ."بەیانی زوو، کاتێك کە هەموو لە خەودابوون، گوێی لە گۆرانییەك بوو لەکرۆکی دڵەوە دەهاتەدەرێ و جەنگەڵی بەرتیشکی هەتاوی دیت، خۆزەپالاسیۆس لەسەرەخۆ گوتی: "ئایتۆربیدە"هەر لەگەڵ ئەوەی کە ئەم قسەی لەدەم هاتەدەرێ، دەنگێکی زبرو گڕ کۆتایی بە گۆرانییە خۆشەکە هێنا.

ئاگوستین ئایتۆربیدە، نۆبەرە کوڕی ژەنەراڵێکی مەکسیکی ناوجەنگەکانی سەربەخۆیی بوو کە ناوی ئیمپراتۆری وولاتەکەی لە خۆینابوو، بەڵام تەنیا توانی ماوەی ساڵێك لەم پایەدا بمێنێتەوە. یەکەمینجاری کە ژەنەراڵ ئایتور بیدەی دیت تەمەنی بیست و دوو ساڵ بوو، بە ئامادەییەوە لە بەرانبەریدا وەستابوو ، بەڵام لەبەرئەوەی لەبەرانبەر قارەمانی سەردەمانی منداڵی خۆیدا وەستابوو هەموو لەشی دەلەرزی و نەیدەتوانی خۆی راگرێ. لە هەمان جاری یەکەمەوە ژەنەراڵ هەستێکی جیاوازی بەرانبەر بەوە پەیداکرد. ئایتور بیدە هێشتا حەڤدەساڵەی تەواو نەکردبوو،کە باوکیان لەلادێیەکی وێرانەو بچووکی مەکسیك گوللەباران کرد، هێشتا چەند سعاتێکی بەسەر گەڕانەوەی لە

---

١ ئارائوکا: زنجیرە چیایەکەو هەروەها شارێکی ڤەنزویلایە.

تاراوگە تێنەدەپەڕی و ئاگادارنەبوو کە ئەویان بەبێ ئەوەی خۆی ئامادەبێ دادگایی کردوەو بە تۆمەتی ناپاکی لەگەڵ وولات بەمەرگ مەحکومیانکردبوو.

سێ رووداو لە یەکەمین چرکەساتەکاندا کاریگەریان لەسەر ژەنەراڵدا جێهێشتبوو.یەکەم ئەوەی کە سعاتە زێڕو بەردە بەنرخەکانی باوکیان لە دوای گوللە بارانکردنی بۆناردبۆوە هەمیشە لە ملی خۆیدەکرد تا هیچ کەسێك گومان لە ریزی ئەو بۆ باوکی نەکا. دووەم سادەیی و راستگۆییەکی کە لە گێڕانەوەی سەرگوزشتەی باوکیدا هەیبوو کە چۆنچۆنی بە کۆنە جلو سیپاڵی هەژاران خۆی نیشانداوە تاکەس نەیناسێتەوە و تەنیا لەبەر سوار چاکی و جوان لێخوڕینی ئەسپ ئەویان ناسیبۆوە و سێیەم دەنگ و ئاوازە لە دڵان ڕاچوەکەی بوو.

دەوڵەتی مەکسیك بۆ ئەوەی ئایتۆر بیدە بێتە ناو ئەرتەشی کۆلۆمبیا زۆری بەربەست بۆ دروستکردبوو بەم بیانگەیە کە مەبەستی ئەو لەبۆ هاتنە ناو سوپاو بەدەستهێنانی و لەدەستگرتنی هونەرەکانی جەنگ بەشێك لەو ئاژاوەیەکە بە پشتیوانی ژەنەراڵ و ژەنەراڵ دەیەوێ ئایتۆر بیدە وەك جێنشینی خۆی، بە ئیمپراتۆریەتی مەکسیك بگەیەنێ بیکاتە میراتکری خۆی. ژەنەراڵ بەقبوولکردنی ئاگوستین جوان بە هەموو ناونیشانە سەربازیەکانی و ئەمەی کە ئەوی کردە یاریدەدەری خۆی، بەرپرسیارێتی رووداوێکی سیاسی و ترسناکی لە ئەستۆی خۆیدا گرت. ئاگۆستین شایانی ئەو پێشت پێبەستنەبوو، گەرچی تەنیا رۆژێکیش خۆشی لە خۆی نەدیبوو، ئەوە گۆرانی گوتنبوو توانای ئەوەی پێدەبەخشی درێژە بە ژیانێکی وا تاڵ بداو لەگەڵیدا هەڵبکا. لەبەرئەمەبوو کە لە جەنگەڵەکانی ماگدالنا ئەوسا کە کەسێك گۆرانی بە ئایتوربیدە بڕی، ژەنەراڵ بە جۆلانەکەی هاتە دەرێ. پەتۆێکی لە خۆی وەرپێچا، ئۆردوگاکەی کە بە رووناکی مەشخەڵی ئاگردانەکان رووناکببۆوە بەجێهێشت و رۆیشت تا ئایتور بیدە بدۆزێتەوە ئەوی لە دەم رووباردا دیتەوە دانیشتبوو تەماشای ئاویدەکرد.

پێی وت: "کاپیتان لەسەر گۆرانییەکەت بەردەوامبە."لەتەنیشتیەوە دانیشت و بەدەنگە کزەکەی لەهەرجێگایەکی گۆرانیەکە، کە شیعرەکەی دەزانی لەگەڵی دەگوت، کەسی نەدیتبوو بەم تەرزە عیشق و خۆشەویستی و خەم و سووتانەوە گۆرانی بچڕێ و لە هەمان کاتیشدا خۆشی بخاتە دڵ و شادی بەخشبێ چوار دەوری ژەنەراڵ لەبەر سەختگیری و وشکی قانوونەکان زۆر غەماوی دەهاتە بەرچاوان. ئاندرس و فرناندۆ کە لە قوتابخانەیەکی سەربازی جۆرج تاون هاوقووتابی بوون، لەگەڵ ئاگوستین سێکوچکەیەکیان لەم ناوەدا دروست دەکرد کە شنەبای شادی و جەوانی لێوەی هەڵدەکرد.

تا ئەو کاتەی کە گیاندارو ئاژەڵەکانی جەنگەڵ بەرمبوهۆرو مرەمرەوە رژانە ناو رووبارەکەو شڵپەشڵپیان لەناو ئاوەکەدا کرد و خشۆکە خەواڵووەکانی رۆخ ئاوەکەیان رەواندەوە، ئاگۆستین و ژەنەراڵ گۆرانییان دەوت. ژەنەراڵ تا ئەو دەمەی کە خەتێکی نارنجی لە ئاسۆدا بەدەرکەوت و هەوا رووناك بۆوە، هەر بەو شێوەی لەسەر زەوی دانیشتبوو و بەسەر سامیەوە تەماشای بێداربوونەوەی سروشتی دەکرد. ئەوجا دەستی بە شانی ئایتوربیدەگرت و راستبۆوە. پێی گوت: "کاپیتان زۆر سوپاستان دەکەم، بە دەکەسێ کە بتوانن وەك تۆ گۆرانیان بڵێن دەمانتوانی جیهان رزگارکەین."

ئایتۆر پیدە ئاهێکی هەڵکێشاو وتی: "ژەنەراڵ ئامادەم هەر چیم هەیە ببەخشم تەنیا بۆ ئەوەی دایکم گوێی لە قسەکەی ئێوە بێ."لەرۆژی دووەمی سەفەرەکەیان کێڵگەی پڕ لە بەروبوومی باشیان دیت کە ئەسپانێکی جوان جوان لەنێو بەربەستە ئاویەکانیاندا بە ئازادی دەخولانەوە، بەڵام دوای چەند وەختێك گەیشتنە جەنگەڵ و هەموو شتێك رێك و یەك نەوا بوو، کەمێك پێش ئەوە چەند کەلەکێکی گەورەی کە لە قەدە درەختی ئەستوور دروستکرابوون دیتبوو و یەك بە دوای یەکدا رێزیان کردبوون. دارشکێنەکان ئەوانەیان بۆ فرۆشتن بەرەو کارتاخناد ئایندیاس دەبرد. ئەوها لەسەرەخۆیی دەرۆیشتن دەتگوت لە جێگای خۆیاندا وەستاون. ئەوان خاوخێزانیان بە منداڵ و ئاژەڵەوە سوارکردبوو. کە تەنیا کەپرێکی لە لق و چلی درەختانیان بۆ کرابوو کە لە تیشکی هەتاو دەیپاراستن. لاتێکی جەنگەلەکە بەهۆی کارکەرانی کەشتیە هەڵمەکان بۆ سوتەمەنی کەشتیەکان وێرانکرابوو.

ژەنەراڵ گوتی: "ماسیەکان دەبێ فێربن لە وشکانی برۆن ، چونکە سەرەنجام ئەم ئاوانە وشك دەکەن."

گەرمای رۆژێکی لە توانا بەدەرو دەنگی مەیموونان و فرەی پەلەوەران مرۆڤی شێت دەکرد بەڵام شەوان هێمن و نهێنی ئامێزو هەوای فێنك دەبوو تیمساحەکان چەند سعاتان لە رۆخ ئاوەکە بە بێجووڵە دەمانەوە و بەدەمی کراوەوە رادەکشان تا ڕاوی فرندان بکەن، لە رۆخ ماڵە چۆڵ و هۆڵەکان، کێڵگەی گەنماشامی هەبوو، سەگی سیرمەو لەڕ لەگەڵ تێپەڕینی بەلەم و گەمیان دەستیان بە حەپە حەپ و وەڕە وەڕ دەکرد. تەلەکان راوەبەرازو تۆرەکانی ماسیگرتن کە بۆ وشك بوونەوە لەبەرهەتاو پانکردبۆوە، بەرچاو دەکەوت، بەڵام تاکە مرۆڤێکیش لەو دەوروبەرانە بەرچاو نەدەکەوت، دوای ئەمە هەموو ساڵانی جەنگ و فەرمانڕەوایی دڵداری بێکاری و تەنیاییەکی پڕ لە دەرد بوو.

تەمەنێکی کەمیشی کە لەبەر ژەنەراڵ مابۆوە، بەدانیشتن لەناو جۆلانەکەو لەفکران راچونی زۆر بەسەردەبرد. بە وەڵامدانەوەی نامەیەکی سەرۆك کۆمار کایسدۆ نامەونامەکاریەکانی تەواو بوون و کۆتاییان پێهات، تا لە زەمانێکی پێشتریشەوە بوو کە بۆ سەرگەرمی چەندین نامەی نووسیبوو، لە

هەمان ڕۆژانی یەکەمدا فرناندۆ داستانهایەکی لە لیما تەواوکرد، بەڵام لەوەدا سەرنەکەت سەرنجی ژەنەراڵ بۆ بابەتێکی دیکە راکێشێ تا سەرگەرمی بکا واز لەم بیرکردنەوە قووڵانەی بێنێ[1].

دوا کتێبێك بوو کە هەر هەمووی خوێندەوە کاتێك کە خاڵی دەبوو لە جەنگ و دڵداری دەبووە خوێنەرێکی دوو ئاتەشە و پڕ لە ئارەزوو ئەو هیچ شێوازو ڕێك و پێکیەکی تایبەتی بۆ خوێندنەوە نەبوو.

لەهەر کات و دەمێکدا کتێبێکی دەخوێندەوە بە پیاسە لەژێر سێبەری داران، بە سواری ئەسپەوە لە ژێر قرچەی هەتاودا، لە ناو گالیسکە کاتێك کە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە دەچوو و تا دەگاتە ئەو کاتەی لەناو جۆلانەکەیدا رادەکشا، نامەیەکی دەنووسی یا کتێبێکی دەخوێندەوە. کتێبفرۆشێکی لیما لە ژمارەو جۆری کتێبەکانی کە ژەنەراڵ لە پێڕستێکی گشتی هەڵیبژاردبوو و کڕیبووی، واقی وڕمابوو. لەنێویاندا کتێب لە بارەی فەلسەفەی یۆنانی تاکتێبانێکی لەمەڕ فالگریەوە بەرچاو دەکەوتن. لە کاتی لاویدا لە ژێر کاریگەری مامۆستاکەی سیمۆن رودریگز، رۆمانی عیشق و ئەڤینداری زۆری خوێندبۆوە. ئەم کتێبانە کاریگەریان لەسەر ژینی ئەو بەجێهێشت.

وایلێهات هەر کتێبێکی کە بە دەستی دەگەیشت دەیخوێندەوە هیچ نووسەرێکی بەسەر یەکێکی دیکەدا پەسند نەدەکرد، لە هەر سەردەم و زەمانێك حەزی لە نووسەرێك دەکرد و کارەکانی ئەوی پتر دەخوێندەوە. سەرتاق و ژێر تاقی هەر ماڵێکی کە تێیدا دەژیا. هەمیشە پڕ لە کتێب بوو و وایلێهات تا ژووری نووستن و ساڵۆنەکانیش بوونە عەمباری کتێب، هەندێ کتێب هەبوون تەواونەدەکران بەسەلامەتی لەناو دەلاقەکاندا دەمانەوە و هیچ کاتێکیش هەموویان نەدەخوێندرانەوە هەر کاتێك کە شارێکی بەجێدەهێشت. کتێب و بەڵگەنامەکانی بە ئامانەت بە یەکێك لە نزیکترین دۆستەکانی دەسپاردو ئیدی قەت جارێکی دیکە لێی نەدەپێچانەوە. ژیان ناچاریکرد کە شوێنەوارێکی بەدرێژایی چوارسەد لەگوا لە پۆلیڤیاوە تا ڤەنزویلا لە کتێب و بەڵگەنامەکانی جێبهێڵێ.

تابەر لەوەش چاوەکانی کز بێن. زۆرترین کاتان مونشی و نووسەرەکانی کتێبیان بۆ دەخوێندەوە. لەوە بەدواوە لەبەرئەوەی چاوێلکە زۆر نارەحەتی دەکرد. ئیدی هەمیشە هەر ئەوان کتێبان بۆ دەخوێنەوە.

ئەگەر چی بەرەبەرە ئارەزووی بۆ کتێب خوێندنەوە کەم بۆوە و وەك هەمیشە بیانوێکی بۆ راکردن لە دەست ئەمە دەدۆزیەوە.

---

١ واز لەم بیرکردنەوە قووڵانە بێنی. لە رۆمانەکەدا ئەم چەند وشە نییە، من بۆ روونکردنەوەی دوو دێرەکەی پێشەوە بەکارم هێنا

جارێکیان دەیگوت: "راستیەکەی ئەمەیە کە کتێبی باش کەمبۆتەوە."خۆزەپالاسێوس تەنیا کەسێك بوو کە سەختی سەفەرو گەرما هیچ کارێکی لە رەفتارو شێوەی جل لەبەرکردنی نەکردبوو. ئەو لە هاوسەرینی کەنیزەیەکی ئەفریقایی لەگەڵ پیاوێکی ئیسپانی لە ماڵی ژەنەراڵ هاتە دنیا، شەش ساڵ لەو بچووکتر بوو، قژی قاوەیی و دەست روخسارە جنجرەکەی و چاوە شینەکانی لە باوکیەوە وەرگرتبوو. بە پێچەوانەی بەهێزی و میانرەوی کەسایەتیەکەی لە نێو هەموو هاورێگاکانی ژەنەراڵ دا جلوبەرگی جۆراو جۆر گرانبەهای لەبەردابوو، هەموو ژیانی لەگەڵ ژەنەراڵ بەسەر بردبوو، لە هەموو تێکۆشان و زۆرانبازیە سیاسیەکاندا، لە هەموو دوورخستنەوەو جەنگەکاندا هەمیشە بەبەرگی خۆیەوە لەگەڵ ژەنەراڵ و لە هێڵی پێشەوەی بەرەی چەنگ بووەو هیچ کاتێك قبووڵی نەکرد جلوبەرگی سەرباز لەبەربکا.

بەدترین شتێك لەم سەفەرەدا جمان و رۆیشتنی ئیجباری وبە زۆر بوو، رۆژێك دوای نیوەڕۆ، ژەنەراڵ ئەوەندە لە پیاسەی ناو ژوورە بچووکەکەیدا بەتەنگ هات کە فەرمانبدا بەلەمەکە راگرن تا بتوانێ بێتە خوارێ و نەختێ بەپێیان بڕوا. لەیەکێك لە ئاوەزێیکانی ئەو ناوەدا کە ئاوەکەی وشکی کردبوو شوێنپێ ی پەلەوەرێکی زەبەلاح وەك وشتر مریشك ، بەلاّم وەبگرە بە سەنگی شوێن سمی یەك گا بەرچاوکەوت. هەموو سەیریان لێهات هەموو حەپەسان جگە لەو ژنانەی کە دەیانگێڕاوە کە لەم ناوچەیە مرۆڤگەلێکی بەپەیکەری خشۆکێك و قاچ و پۆپیتەی کەلەشێرێك دەژین. ژەنەراڵ گاڵتەی پێیان هات وەك چۆن هەمیشە گاڵتەی بە هەموو شتێکی ناسروشتی دەکرد لەگەڵ ئەوەشدا کە بەلەمەوان و راوێژکارانی سەربازی بەم دابەزین و هەڵدان لەم شوێنە نارازی بوون ئەو سەرزەوی و ناوچەیان بە ترسناك و نادروست دەزانی ، بەلاّم ژەنەراڵ ئەوەندە درێژەی بە رۆیشتندا کە ناچاربوون شەو لەویّ بحەوێنەوە. گەرماکە زۆر ترسناك بوو، دەتگوت پێشولەکان لە کوللە[1] وەش دێنە ناوەوە، زیرەی پلینگێکیش هات، هەموو ئەو بارە بێزارکەرانە بوونە هۆی ئەوەی ژەنەراڵ تابەیانی خەوی لێبزڕێ نزیکەی سعات دووی دوای نیوەشەو هەڵساو چووە کن ئەو کەسانەی کە بە دەوری ئاگرێکەوە دانیشتبوون و پاسەوانیان دەکرد، تاقسەیان لەگەڵ بکا.

تاریك و رۆناکان لە حاڵێکدا تەماشای رووبارو ئاوەزێکانی دەوروبەری دەکرد بەیەکەمین تیشکەکانی خۆر رەنگێکی زێرینی پێدابوون لەو خەون و دالغانەی کە هەموو شەوەکە

---

١ کوللە: ئەو پارچەیەی بەدەوری شوێنی نووستندا دەگیرێتەوە، بەتایبەتی بەشەوانی هاویندا.

نەیهێشت چاوی لێکبنێ، بەخەبەر هات سەرئەنجام گوتی: "زۆر چاکە، وا دیارە بەبێ ئەوەی دۆستە قاچ و مەچەك کەڵەشێریەکانمان ببینین دەبێ لێرە بارکەین و بڕۆین."

بەتەواوی لەو کاتەی کە دەیانویست بجمێن سەگێکی رووتەڵە و لاواز و ناشیرین و گەڕ بە لینگەشەلە خۆی کوتایە ناو بەلەمەکە. سەگەکانی ژەنەراڵ پەلاماریاندا، بەڵام سەگە شەلە زۆر ئازایانە بەرگری لە خۆیکردو تا بە لاملی بریندارو گیانی خوێناویشی دەستی نەداو داینەهێنا. ژەنەراڵ فرمانیدا کە ئاگایان لێی بێ و دەرینەکەن خۆزەپالاسیۆس هەر بەو جۆرەی کە زۆر جاریدیکە سەگی دیکەی راگرتبوو و سەرپەرشتی و بەخێوی کردبوون، چاودێری کردنی ئەم سەگەیشی گرتە ئەستۆ.

هەر هەمان رۆژ ئەڵمانێکیشیان سواری بەلەمەکەیان کرد، دوای ئەوەی کە ئەڵمانەکە یەکێك لە سەوڵ لێدەرەکانی بەرقامچی دابوو ئەویان لە دوورگەیەك فڕێدابوو هەر لەیەکەم چرکەسات خۆی وەك گیاو گۆڵناس و ئەستێرەناس ناساند ، بەڵام لە کاتی قسەکردندا بەدیارکەوت کە فڕی بەسەر ئەم دوو زانستەوە نییە. لە باتی ئەمە وتی کە مرۆڤی پێکەڵەشێرانی دیتوەو وانیازە یەکێکیان لێ ڕاوبکاو بەزیندوویی لەقەفەزێکدا بۆ نیشاندانی بە خەڵکی بۆ ئەوروپای ببا.

ژەنەراڵ پێی گوت: "من لەگەڵ خۆتداببە، دڵنیات دەکەمەوە کە ئەگەر من بخەیتە ناو قەفەزێکەوە و وەك گەمژەترین پیاوی مێژوو نیشانی خەڵك و خوام بدەی، پارەیەکی زۆرترم پێپەیدا دەکەی."

لەسەرەتادا ژەنەراڵ وەك کەسێکی فیشاڵچی ، بەڵام سافیلکەو میهرەبان تەماشای ئەوی دەکرد، بەڵام کە لە بارەی بارۆن ئەلکساندەر فۆن هامبولت سوعبەتی ناشیرینی کرد و بەدرۆ وەك هاورەگەز باز ناویهێنا، ژەنەراڵ لێی پەشیمان بۆوە، بەخۆزەپالاسیۆسی ووت: "دەبێ دووبارە لە کەنارێك بەجێی بهێڵین."هەر هەمان پاشنیوەڕۆ تووشی بەلەمی پۆست بوون کە بەرەو سەرەوەی رووبارەکە دەچوو و ژەنەراڵ زۆر لێهاتوانە مەئموری پۆستی رازی کرد کە سەری تورەگەی نامەکان بکاتەوەو نامەکانی خۆی بداتێ.

لەدوایشدا تکای لێکرد کە ئەو ئەڵمانە بگەیەنێتە بەندەری نارە، لەگەڵ ئەوەشدا کە توانای بارهەڵگرتنی بەلەمەکە تەواو بوو، بەڵام فەرمانبەری پۆستەکە رازی بوو، ئەو شەوە لە کاتێکدا کە فەرناندۆ نامەکانی بۆ دەخوێندەوە ژەنەراڵ بەتووڕەییەوە وتی: "ئەم دایك وانێکە یەك تەڵەموی هامبولتی تێینابێ."

پێشی ئەوەی ئەو ئەڵمانە لەگەڵ خۆیاندا سواری بەلەمەکە بکەن، لەبیری هامبولت دابوو، ژەنەراڵ لەسەردەمی دوورخرانەوەی بۆ پاریس، کاتێك کە هامبولت لە سەفەر بۆ وڵاتانی گەرم و ئیستبوایی دەگەڕاوە، ئەوی ناسیبوو، سەرەڕای وریایی و زیرەکی، قۆزی و جوانیەکەی ئەو

ژەنەراڵی زۆر حەپەساندبوو، جوانیەکەی بەڕادەیەك بوو کە هیچ ژنێکی وا جوانی نەدیتبوو. بەڵام شتێکی کە چاوەڕێی نەدەکرد، باسکردنی ئەم خاڵە بوو کە وڵاتە کۆلۆنیەکانی ئیسپانیا لە ئەمریکا ئامادەن بۆ وەدەستهێنانی سەربەخۆیی، لە حاڵێکدا کە بابەتێکی وا بۆ ژەنەراڵ لە خەونێکی بەدینەهاتوو زێتر نەبوو.

هامبولت پێی وتبوو: "تاکە گرفتێك لە کارەکەدا نەبوونی مرۆڤێکە."

ژەنەراڵ ساڵانێك دواتر لە کۆزکۆ[1] وەختێ کە لەو پەڕی هێزو دەسەڵاتدا بوو، ئەم چیرۆکەی بۆ خۆزەپالاسیۆس گێڕاوە، لەو سەر وەختەدا مێژوو نیشانی دابوو کە ئەو کەسە گونجاوە خودی ئەو بوو. ژەنەراڵ چیدیکە ئەمەی بۆ کەس نەگێڕاوە، بەڵام هەر کاتێك کە قسە دەهاتە سەر بارۆن، هەڵی بەکاردەهێنا تا پێشبینی و پێشگۆییەکانی هامبولت بهێنێتە نێوان و بە چاکە باسیان بکا. هەمیشە دەیوت: "هامبولت چاوەکانی منی کردەوە."

ئەمەیان چوارەمین جار بوو کە بە ناو ڕووباری ماگدالنا سەفەری دەکردو وا دەهاتە بەرچاو کە لەسەر رێگای چارەنووسی خۆیدا هەنگاو دەنێ یەکەمینجار کە بەوێدا تێپەڕی، ساڵی ۱۸۱۳ بوو، لەو وەختەدا سەرهەنگێکی شکستخواردو بوو کە لە تاراوگەکەی لە کورازائو بەرەو کارتاختادا یندیاس دەگەڕاوە تا درێژە بە جەنگەکەی بدا. وڵاتی نوئباگرانادا بۆ چەند بەشێك دابەشبوو، گەیشتنە سەربەخۆیی و سەرکەوتنی یەکجارەکی لەبەرانبەری هێرشەکان و پاڵەپەستۆکانی ئیسپانیەکاندا هەموو دەم دوورتر دەهاتە بەرچاو. لە سێیەمین سەفەریدا بەسەر ئەو رووبارەدا چالاکییەکانی ئازادیبسازی وەك ئەو ناوی لێنابوو کۆتایی پێهاتبوو ، بەڵام خەونی شێتانەی یەکێتی کیشوەرێك لەیەکدا هەڵدەوەشاوە، لەو سەفەرەدا کەدواسەفەری بوو بەناو ئەو رووبارەدا ئەو خەونە بە تەواوی لە باریەك چووبوو، بەڵام هێشتا رستەیەك مابوو کە ژەنەراڵ بەبێ ماندووبوون دووبارەی دەکردەوە: "تا ئەو وەختەی ئەمریکا یەکنەگرێ، دوژمنان لە هەلێکی باش سوود وەردەگرن."

لەو هەموو یادەوەریە هاوبەشانەی کە لەگەڵ خۆزەپالاسیۆس هەیانبوو، پڕ لە ورووژان و بەجۆشترینی ئەو یادەوەریانە یەکەمین سەفەریان بوو بە ناو ئەو ڕووبارەدا ، رووبارێك کە لە پێناو ئازادکردنیدا لەگەڵ دووسەد پیاوی تەیار بەهەر جۆرە چەکێکی کە بەرچنگیان کەوتبوو دەجەنگین تا بیست رۆژ بۆ دەرمانیش یەك هەواداری پاشایان لە کەنارەکانی ماگدالنا نەهێشت. خۆزەپالاسیۆس لە رۆژی چوارەمدا بەدیتنی دەستەیەك ژن و ژاری کە لە گوندەکانی ئەو ناوە بەرەو کەنار رووبار دەهاتن و چاوەڕێی پەڕینەوەی

---

۱ کۆزکۆ: شارێکە لە پیرۆ.

بەلەمەکانبوون، ئاگای لە گۆڕانی حاڵ و بارەکە بوو هاواری کرد: "بێوەژنەکان لێرەن."ژەنەراڵ خۆی کوورِ کردەوە تا بیانبینێ هەر هەمووی رەشی پۆشیبوو و وەك قەلەرەشکەی سەر لەبەرخۆیان لە ژێر قرچەی هەتاو لە رۆخی رووبارەکە بەرێز چاوەڕێی سلاوێك بوون، هەتا سەلامێك ئەگەر بە سیلەی رەحمێیدا هاتنەوە شبووبێ، ژەنەراڵ دی یە گۆئیبارای برای ئاندرسی هەمیشە دەیگوت کە ژەنەراڵ لەگەڵ ئەوەشدا منداڵێکی نەبوو وەجاغی کوێر بوو ، بەلام دایك و باوکی هەر هەموو بێوەژنانی ئەم وولاتە بوو، لە هەموو جێگایەکدا بەدواوەبیوون و ئەو بەو وشە جوانەکانی ژیانی پێدەبەخشین بە وشەیەك کە بەراستی دلێدەدانەوە بەلام لەگەڵ ئەمەشدا لەو چرکەساتەی کە ژنە رەشپۆشەکانی دیت. زیاتر کەوتە ناو بیرکردنەوەی ژەنەڕاڵ وتی: "ئێستا ئێمە خۆشمان بێوەین، هەتیوین، بریندارو ئاوارەی دەستی ئەم سەربەخۆییەین."

پێش گەیشتنیان بە مومپوکس[1] لە پوئرتورئال بترازی کە رێگای دەرچوونی رووباری مادالنا بوو بۆ ئاوکانیا لە هیچ جێگایەکی دیکە نەوەستان. لەوێ ژەنەرالی ڤەنزویلایی خۆزەلارنسیوسیلبایاندیت کە فەرمانبەرێتی سەربازانی ئاژاوەچی کردبوو، تا سنووری وولاتەکەیانی بردبۆوەو دەگەڕاوە تا خۆی بگەیەنێتە ژەنەراڵ.

ژەنەراڵ تا شەو خەوتنان لەبەلەمەکەیدا ماوەو هەموو بێوەژنەکان، پیرو پەککەوتەو نەخۆش و ئاوارەکانی جەنگەلان کە دەیانویست ببینن لە حزوریاندا دانیشت. ئەو وەبگرە هەر هەموویانی لەبیرمابوو. ئەوانەی کە مابوون لە هەژاری و بێچارەییدا دەژیان. هەندێکیشیان بۆ گوزەران و ژیان، هەروەکو ژمارەیەکی زۆری دیکەشیان لەسەر بازە ئازادیخوازەکان، چوبوونە جەنگە تازەکان و یان لە رێگاو بانەکان کەوتبوونە جەردەیی و رێگری یەکێك لەوان بەڕستەیەك هەستی هەموانی چڕوپرکردەوە: "ژەنەراڵ ئێستا کە سەربەخۆییمان هەیە پێمان بلێن چی لێبکەین: "ژەنەراڵ فێریکردبوون کە هەمیشە هەر بەو شێوە قسەبکەن و راستیان لە بەردەمدابێ، بەلام هەنووکە خاوەنی راستی گۆڕابوو.

ژەنەراڵ بەوانی وت: "سەربەخۆیی تەنیا قۆناغێکی ساکاری بردنەوەیە لە جەنگدا، فیداکاریە مەزنەکان لەدوای ئەوەدادێت تا بتوانین میللەتێکی یەکگرتوو دروستبکەین."

ئەوان وەلامیانداوە: "ژەنەراڵ تەنیا کارێکی کردوومانە، فیداکاری بووە."بەلام ئەو خۆی نەدا بەدەستەوە ووتی: "فیداکاری پتری پێویستە بۆ یەکێتی ناتوانرێ نرخێك دیاربکرێ."جۆلانەکەیان لە هەیوانێکی گەورەدا بۆهەڵواسیبوو تا بنوێ، ژەنەراڵ خەوینەدەهات و لە هەیوانەکەدا دەهات و دەچوو کە لە

---

١ مومپوکس: شارێکە لە کۆلۆمبیا

پڕتاوێك ژنێكی دیت بەدەم ڕێكردنەوە وەستا تا تەماشای ژەنەراڵ بكا. ژەنەراڵ لەمەی كە ژنەكە سەری لە رووتیەكەی نەسوڕمابوو، زۆر واقی وڕما. تا گوێی لەو وشانەبوو كە بە گۆرانی دەیگوتن، "پێم بڵێ كە مردن لە پێناوی ئەڤیندا، هیچ كاتێك درەنگ نییە."پاسەوان كە لە ژووری تەك دەرگاوە دەژیا، بە ئاگابوو.

ژەنەراڵ لێی پرسی: "ئێرە ژنیشی لێیە؟"

پاسەوانەكە وتی: "قوربان، ژنێك لە ئێوە بوەشێتەوەو شایەنی ئێوە بێ، لێرە پەیدانابێ."

ژەنەراڵ پرسی: "مەبەستت لەوەی شایانی من بێ چییە؟"

پاسەوان وەڵامی داوە: "ئەوەشیان نا، تا مەودای یەك لەگوا لەم ناوە هیچ ژنێك نییە."ژەنەراڵ بەدیتنی ئەو ژنە ئەوەندە دڵنیابوو كە درەنگ وەختانێك لەماڵەوە بەدوایدا گەڕا. فرمانیدا یارمەتیدەرەكانی بەدوایدا بگەڕێن و بۆ رۆژی دوایی سعاتێك سەفەرەكەی دواخست تا ئەوەی كە وەڵامی پاسەوانەكە هێنایە سەرقەناعەت: "هیچ ژنێك لەوێ نەبوو."

ئیدی باسی ئەو ڕووداوە نەكراوە، بەڵام بەدرێژایی سەفەرەكە هەرجارێك كە ئەو شەوەی بەبیردەهاتەوە دووبارە پێی لەسەر گەڕان بەدوای ئەو ژنە دادەگرت. خۆزەپالاسیۆس ساڵانێك لەدوای مەرگی ژەنەراڵ ژیاو كاتی زۆری هەبوو تا هەموو یادەوەریەكانی ژیانی لەگەڵ ژەنەراڵدا بەبیر خۆی بهێنێتەوە. ئەو یەك خاڵی بچووكیشی لەبیرنەچوو بۆوەو تابەسەری پازدا، تەنیا بابەتێكی كە هیچ وەختێك بۆی رۆشن نەبوو ئەوەبوو كە ئایا دیتنی ئەو ژنە لەو شەوەدا لە پوئرتورئال راستی هەبوو، خەونێك بوو یا لە تاو نەخۆشی و وڕێنەوە هاتبوو؟

سەگە تازەكەی كاتی جمانیان خۆی كوتابووە ناو بەلەمەكە. بەرەو چاكبوونەوە دەچوو ، بەڵام كەس باسینەدەكرد تا ئەوەی كە چێشلێنەرەكە لەوە بەئاگاهات و سەرنجی دا هیچ ناوێكیان لێنەنابوو سەگەیان بە دەرمانان شووشت و بە بۆدرەی بۆنخۆشی تایبەت بە منداڵان بۆدرەیان كرد. بەڵام نەیانتوانی ئەو بۆنەی كە لەبەر گەڕی لێیدەهات لەناوببەن. ژەنەراڵ لەسەر عەرەشەی بەلەمەكەدا پشویدەدا و چێژی لە هەوای تازە وەردەگرت كە خۆزەپالاسیۆس سەگەكەی بەراكێش راكێش بۆ بەردەمی ئەو بردو پرسی: "چ ناوێكی لێبنێن؟"

ژەنەراڵ بەبێ ئەوەی یەك چركە دوا بكەوێ وەڵامیداوە "بولیوار".

# (٤)

هەر لەگەڵ گەیشتنی هەواڵی نزیك بوونەوە چەند بەلەمێك کەشتیەکی سەربازی کە لە بەندەرەکە لەنگەریان گرتبوو، بەرەو پیری ئەوان جووڵان، خۆزە پالاسیۆس لە پەنجەرەی ژووری ژەنەراڵەوە، ئەو کەشتیەی دیت و بەسەر جۆلانەکەی ژەنەراڵ بە چاوی قوچاوەوە لەناویدا راکشابوو داهاتەوە و وتی: "قوربان وا گەیشتینە مومپوکس"

ژەنەڕاڵ بەبێ ئەوەی پێڵووەکانی بکاتەوە وتی: "وولاتی خوا."هەرچەندەی لە ڕووبار دادەکشانە خوارێ ئەوا ڕووبارەکە پانترو ئارامتر دەبوو، هەروەك ئەو دوورگەو کەنداوانەی کە کەنارەکانیان نەدەدیترا. گەرماکەی ئەوەندە قورس بوو کە دەکرا بەدەست بگیرێ لەسەرەتای سەفەرەکەدا بەرەبەیان و سەر لە ئێواران ژەنەڕاڵ لەسەر عەرەشەی بەلەمەکەدا دەوەستا و لە دیمەنەکانی گزنگی خۆرو رۆژئاوابوونی دەڕوانی، بەڵام ئێستا ئیدی وازی لەمکارە هێنابوو، فرمانی نەدەدا مونشیو نووسەرەکانی نامەی بۆ بنووسن یانەخۆ کتێبی بۆبخوێننەوە و لە کەسیشی نەدەپرسی تا نیشانی ئەوەبدا کە هێشتا ئومێدی بە ژیان ماوە. تا لە پاشنیوەڕۆ زۆر گەرمەکانیشدا کە لەناو جۆلانەکەیدا دەنووست. پەتۆیێکی بەخۆیدادەدا خۆزەپالاسیۆس وای گومانکرد کە ژەنەراڵ گوێی لە قسەکانی نەبووەو دووبارەی کردەوە. ژەنەراڵ بێ ئەوەی چاوی بکاتەوە وەڵامیداوە "شتێك نییە بەناوی مۆمپۆکس. هەندێ جاران لە خەوندا دەیبینم بەڵام بوونیشی نییە."

خۆزەپالاسیۆس وتی: "بەلانی کەمەوە دەتوانین بڵێین کە بورجی سانتابار بارا هەیە، چونکە لێرەوە ڕا خەریکە دەیبینم."

ژەنەراڵ بە شڵەژاویەوە چاوەکانی کردەوە لەناو جۆلانەکەی دانیشت و لەنێوان بریسکەی زیوینی نیوەڕۆدا سەری یەکەمین خانووەکانی کۆنەشارو و ئازارخواردوی دەستکەنەکراوی مومپوکسی دیت. شاری جەنگزەدە و وێران و هەژار کە نەخۆشی و دەردیش لە ڕیشەوەی دەرکێشابوو، لەو سەردەمەدا

چارەنووسی شار ڕێچکەیەکی لە گۆڕان نەهاتووی وەرگرتبوو، ڕێچکەیەك کە پێش دوایی هاتنی سەدە دانیشتوانەکەی هەر هەموو شارەکەیان جێهێشت. داگیرکارانی ئیسپانیایی بۆ بەرگرتن لە هاتنە پێشەوەی ئاو، دیوارێکی بەردینیان هەڵنابوو و هەر کە لافاو تێکیدەدا. زۆر بەپەلە و تۆکمەتر جارێکی دیکە هەڵیاندە ناوە بەڵام نهۆ تەنیا لایەکی دیوارەکە بە پێوە مابۆوە.

کەشتیەکی سەربازی لێیان نزیکبۆوە لە کاتێکدا کە ئەفسەرێکی قولەڕەشی کە هێشتا بەرگی پۆلیس حکومەتی پێشوی هەر لەبەردابوو بە تۆپ سێرەی لێدەگرتن. کاپیتان کاسیلدۆ سنتوس نەڕاندی: "قولەڕەشەی نەفرەتی هێندە بێمێشك مەبە."سەوڵ لێدەرەکان سەوڵەکانیان وەلانا و بەلەمەکان کەوتنە بەر تەوژمی شەپۆلان، سەربازەکانی ناو بەلەمەکان تفگەکانیان لەسەر پێداناو ئامادەیانکردن و چاوەڕێیی فرمانبوون، ئەفسەرە رەشپێستەکە لە هەمانکاتدا هاواری کرد: "بەناوی قانوونەوە، گوزەر نامەکانتان دەرکەن."

تەنیا لەو دەمەدابوو دیتی کەسێك لە ژێر چادرۆکەیەکدا هاتەدەرێ و بەماندوویی ، بەڵام پڕ لە زەبرو دەسەڵات فرمانی بەسەربازەکاندا کە چەکەکانیان بێننەخوارێ، دوایی بە دەنگێکی گەورە بە ئەفسەرە رەشپێستەکەی وت: "هەر چەندە ئێوە باوەڕ ناکەن. بەڵام پسولەی تێپەڕینم پێنیە."

ئەفسەرە رەشپێستەکە ژەنەراڵی نەناسی، بەڵام کاتێك فرناندۆ گوتی کە ئەو کێیە هەر بە چەکەوە خۆی بە ئاوێدادا و تیژبەرەو ڕۆخ ئاوەکە بە مەلەم پەڕیەوە تا ئەم هەواڵە خۆشە بە هەموان بدا بەلەمە جەنگیەکە بەهۆڕن لێدان، تا بەندەر پێشوازی لەبەلەمەکانی ئەوانکرد، بەرلەوەی کە دواپێچی رووبارەکە ببڕن و بتوانن بە تەواوی شار ببینن دەنگی زەنگوڵەکانی هەر هەشت کڵێسەی شار گەیشتەگوێ.

سانتاکروز دمومپوکس لەسەردەمی ئیسانیەکاندا پردێکی بازرگانی نێوان کەنارەکانی کاریبی و ناوەوەی وڵاتبوو و هەر ئەم هۆیەش ببووە هۆی کەڵەکە بوونی سامانێکی زۆر لەوێدا هەر کە شنەبای سەربەخۆیی هەڵیکرد ئەم شارە بچووك و دەوڵەمەندە. یەکەمین شارێك بوو کە بانگی سەربەخۆیی خۆی راهێشت. دوای ئەمە هەر کە دووبارە کەوتەوە ژێر دەسەڵاتی ئیسپانیەکان جارێکی دیکە ژەنەراڵ خۆی ئازادی کردەوە. شارەکە تەنیا لە سێ شەقامی هاوتەریب، پان و پڕ لە تۆزو خۆڵ لەگەڵ خانووی گەورە گەورەی یەك نهۆمی پەنجەرە گەورەوە پێکهاتبوو. لەو شارەدا دوو کۆنت و سێ مارکیز[١] دەژیان ، بەڵام لەگەڵ ئەو هەموو

١ مارکیز: نازناوی هەندێ خێزانە خانەوادانەکانە لە ئیسپانیا

گۆڕانکاریەی کە لەسەردەمی کۆماری و دەوڵەتەکانیدا پەیدابوو، هونەری هەڵکەندن لەسەر زێڕو زیودا کە تایبەت بوو بە مومپوکس لە جێگای خۆیدا ماوە.

ئەمجارەیان ژەنەڕاڵ ئەوەندە بەدبین هەتا بەدبین بەسەرکەوتنەکانی خۆیشی دەهاتەوە ئێرە، کە وەختێك پۆلێك خەڵکی لە چاوەڕوانی گەیشتنی دیت، زۆر حەپەسا، پانتۆڵە مەخمەلی و چەکمەدرێژەکانی لەبەرو لەگەڵ ئەو هەموو گەرمایەش پەتۆیێکی بەسەر شانیدادابوو و لەباتی کڵاوی خەوەکەی کڵاوێکی دەورپانی کە هەربەم کڵاوە بوو لە ئاوندا خوا حافیزکردبوو، لەسەر نابوو.

لەکڵێسای لاکان سپسیۆن ڕێو ڕەسمی بەرێکردنی تەرمێك بەرێوەدەچوو. خەڵکی ئاسایی و ئاینی و خەڵکی ناسراوی شار هەر هەمووی بەبەرگی ڕەسمی ورەشەوە لەڕێورەسمەکە بەشداریانکردبوو.

دەنگی زەنگی کڵێسا حەواسی خەڵکەکەی وا پەرتکرد وایانزانی لێدانی زەنگەکان لەبەرئاگر کەوتنەوەیەکی گەورەیە. بەڵام هەمان پاسەوانی بەدەستەپاچەیی و ورووژانێکی زۆرەوە هاتبووە ناوەوە و بەگوێی شەهرداری چرپەیەکی کرد، لە پڕ هاواری کرد: "جەنابی سەرۆك کۆمار تەشریفی لە شارە."

خەڵکێکی زۆر هێشتا نەیاندەزانی کە ئەو ئیدی سەرۆك کۆمار نییە. ڕۆژی دووشەممە پۆستەبەرێك بێرەدا ڕابردبوو دەنگۆی ئاوندا لە تێکڕای شارو گوندەکانی ئەو ناوەی دەوروبەری ڕووبار بڵاوبۆوە، بەڵام هیچ هەواڵێکی واینەدابوو جێگای بڕوابێ بەمجۆرە ئەم بەهەڵەداچونە بووە هۆی ئەوەی خەڵکی پێشوازی گەرمتر لە میوانەکەیان بکەین هەتا دەرفەتی خانەوادە پرسەدارەکانیشی دا کە زۆربەی ئامادەبووانی کڵێسە بەجێبهێڵن و بەرەو بەندەر بەرێکەون.

بەهۆی کەمبارانیەوە لە مایسدا، بەشێکی لەنگەرەگاکانی بەندەرەکە هێشتا پڕ لە ئاو نەببوون و ناچار بوون لەنێوان خۆڵ و خاشاکی گوفەکەکان[1] تێپەڕن تا بگەنە بەندەرەکە، ژەنەڕاڵ هەموو پێشنیارەکانی بۆ کۆمەککردنی ڕەتکردەوە، هەر بە هەمان شێوەی کە کاپیتان ئیباران بە بازووی خۆی رایگرتبوو بەهانکە هانك و ڕەنج و ئازارکێشانەوە دەڕۆیشت، بەڵام سەرەنجام توانی بەسەر بڵندی و باغربوونێکەوە بگاتە بەندەرەکە.

لە بە ندەرەکە یەکە یەکە سەلامی لە فەرمانبەرانی دەولەتکرد و بە

---

١ گوفەك: زبالە ، شوێنی فرێدانی خۆڵ و خاشاك.

به توانایەك كە لەو لەشە دەردەدار و دەستە بچووكانە بە دوور دەزانرا، تۆقەی لەگەڵ کردن. کەسانێکی کە لە دواجار ئەویان لەوێ دیتبوو، گومانیان لە مێشك و بیری خۆیانکرد، ژەنەراڵ ئەوەندە پیرو داکەوتووبوو کە وەك باوکی دەهاتە بەرچاوان، ژەنەراڵ قبووڵی نەکرد لەسەر ئەو کورسیە تەختەی کە بۆیان ئامادەکردبوو دانیشێ، بەڵام ئامادەبوو تا کلێسای لاکان سپسیون بە پێیان بڕوا. کە شاردار حاڵی خراپی ژەنەراڵی دیت ئەویش لە کاتی دابەزینی بوو لە بەلەمەکە، وڵاغەکەی ئامادەکرد، سەرەنجام ناچار بوو سواربێ.

خۆزەپالاسیۆس چەهرەو دەموچاوێکی زۆری دیت کە ئاوڵەداربوون و جێی برینە ئاوڵەکانیان بە ئاوکێکی [1] رەنگ بنەوشەیی گوڵی جنتیانا رەنگ کردبوو، ئاوڵە لەناوچەکانی دامەنی رووباری ماگدالنا بە نەخۆشیەکی ترسناك دەژمێردراو ئازادیخوازەکان ترسێکی زیاتریان لەم نەخۆشیە ترسناکە هەبوو تا ئیسپانیەکان، بەتایبەتی لەو کاتەوە کە ببووە هۆی قڕکردنێکی زۆر بێئەندازە لە سوپاکەیاندا، لەوێوە کە ئاوڵە بۆناو هەموو دانیشتوان دزەی کردبوو، ژەنەراڵ لە پزیشکێکی فەرەنسی کە بەو ناوەدا تێدەپەڕێ، داوایکردبوو کە بمێنێتەوە و بەرێگەی کوتان خەڵکی لەم نەخۆشیە رزگاربکا. بەڵام مەرگ و مردن ئەوەندە زۆربوو کە سەرئەنجام ئیدی کەس سوودی لەو کوتانە نەدیت و زۆر لە دایکان لە ترسی گرتنەوەی کوڕەکانیان بە باشتریا نزانی بەم لوقاحە کە بۆ بەرگرتن لە بڵاوبوونەوەی نەخۆشیەکە بەکاردەهێنرا، بکوترێت، بەڵام لەگەڵ ئەم راستیەشدا، ئاگاداری ژەنەراڵیان دەکردەوە کە ئاوڵە لەناوبراوە، لەم بارەوە وەختێ خۆزەپالاسیۆس سەرنجی ئەوی بۆ ئەو هەموو دەم وچاوە رەنگکراوە راکێشا، کاردانەوەی ژەنەراڵ پتر نارحەتی و تووڕەبوونبوو و تارادەی سەر سوڕمان.

ژەنەراڵ گوتی: "تا ئەو کاتەی کە فەرمانبەران بۆ دڵخۆشکردنی ئێمە درۆ بکەن. هەر بەمجۆرە دەبێ."بەڵام نەیهێشت هیچ کەسێك لە بەندەر بەنارحەتیەکەی بزانێ، بەدرێژایی لەمەڕ دەست لەکارکێشانەوەکەی و ئاژاوەی سانتافەوە، قسەی بۆ کردن ، هەروەها گوتی کە دەوڵەتی نوێ لەلایەن خەڵکەوە پشتگیری لێنەکراوە.

ژەنەراڵ وتی: "یان یەکگرتن یان قسەی قۆڕ."وە هەروەها خەریکە دەڕوا و ئیدی ناگەڕێتەوە و رۆیشتنی تەنیا لەبەر نەخۆشی و دەرداری نییە. کە زۆر روون و ئاشکرا بوو

---

١ ئاوك: لە دەشتی هەولێر ئەم وشە بەباتی ، گۆشتاو ، چەلاو ، سوپە، بەکاردەهێنرێ ، بەڵام من بۆ ئاوی گیراویەك بەکارمهێناوە.

هەموو کەسێك دەیتوانی بیبینێ، بەڵکە لەبەرمەسەلەی دیکەو ماندووبوونی دەروونییە. بەڵام لەمەڕ ئەوەی کە کەی و بۆ کوێ دەڕوا. هیچی نەوت و بەبێ ئەوەی پەیوەندی بە باتەکەیەوە بێ، باسی ئەوەی کرد کە هێشتا دەوڵەتی نوێ گوزەرنامەی نەداوەتێ تا بتوانێ لە وڵات بچێتە دەرێ. لەبەر خاتری بیست ساڵ شکۆ و مەزنی کەمومپوکس بەوی بەخشیوو. سوپاسی هەمووانی کردو تکای لێکردن کە ئەو وەك یەك هاوڵاتی ئاسایی دانێن.

لە کلێسەی لاکان سپیون هێشتا نیشانەی پرسەداری دەدیتراو بۆنی بخور و گوڵان و تەلەداری سووتاو بۆ مەراسیمەکانی تازیە دەگەیشتە بەرکوونە لووتان کە ناگەهان ئاپۆراێیکی زۆر بۆ ڕێوڕەسمێکی پێشبینی نەکراوی فاتیحە دادان خۆیان بە ناو کلێسا داکرد. خۆزەپالاسێوس هەستی کرد کە جێگای ژەنەراڵ رحەت نییە. لەباتی شاردار بە ئارامی و سەررحەتیەوە بە دڵخۆشی لە تەنیشت ژەنەراڵ دانیشتبوو. فرناندا، بێوەژنی بنخومەئا کە جوانیەکەی ببووە هۆی ئاشوب و کوشتار لە ناو پەرلەمانی مەدرید. باوەشێنەکەی دا ژەنەراڵ تا گەرماکەی خۆی پێبڕەوێنێتەوە. ژەنەراڵ باوەشێنەکەی بە بێئومێدی و تەنیا لەبەر بۆنە خۆشەکەی بەبێ وەستان بەملاو ئەولادا دەهێناو دەبرد، تا ئەو کاتەی کە جارێکی دیکە گەرماکە هەناسەی سوارکردەوە. ئەو کاتە بەبن گوێی شارداردا چرپاندی وتی:

"باوەڕ بکەن کە موستەحەقی ئەم جەزرە بەدانەنیم."

شاردار وتی: "قوربان ئەمە پاداشتی عیشقی خەڵکە بۆ ئێوە."

ژەنەراڵ وەڵامیداوە: "بەداخەوە ئەمە عیشق نییە، تەنیا کنجکاویو لەشت خەفتنە."

لەکۆتایی ڕێوڕەسمی دوعا خوێندن، سوپاسی بێوەژنەکەی بن خومەی کردو باوەشێنەکەیداوە، بەڵام ئەو موکڕ بوو لەسەر ئەوەی کە دەبێ ژەنەراڵ لەگەڵ خۆیدا بیبا. بە ژەنەراڵی وت: "ئەم سەربەرزیەم پێببەخشن و ئەم باوەشێنە وەك یادگاریەك لە کەسێکی کە زۆر عاشقە، قبوڵبکەن."

ژەنەراڵ گوتی: "بەڵام بەداخەوە خانمەکە من هێندەم کات لەبەردەمدا نەماوە تا بتوانم یادگاری تێدا هەڵگرم."

کەشیش پێی لەسەر ئەوە داگرت کە بۆ پاراستنی ژەنەراڵ لە گەرما ئەوا دەبێ ئەو مەودایەی نێوان کلێسەی لاکا سپسیۆن و قوتابخانەی پیدرۆ ئاپوستول لە ژێر ئەو پارچە قوماشەدا ببڕێ کە بۆ ڕێوڕەسمی هەفتەی پیرۆز هەڵدرابوو.

ئەمە قوتابخانەیەکی گەورە و کۆنە ماڵێکی دوو نۆهمی بوو لەگەڵ حەوشەیەکی پڕ لە گوڵ و گوڵەمێخەك بوو کە لە دواوەیدا باغی مێوەی هەبوو، ساڵۆنەکانی خانووەکە کە تاقیان تێدابوو لەو مانگانەدا لەبەر بای بەهێز کە لە بەری رووبارەوە هەڵیدەکرد، هی لێدانیشتن نەبوو، بەڵام ژوورەکانی تەنیشتیان دیواری ئەستووری لەبەرد هەڵنراویان هەبوو کە ئەوانی لەو بایە دەپاراست.

خۆزەپالاسیۆس زووتر رۆیشتبوو تا هەموو شتێك ئامادەبکا، دیوارەکانی ژووری نووستنەکەی ژەنەراڵ ئەستوربوون ، تازە گەچکاری کرابوون و تەنیا پەنجەرەیەکی تێدابوو کە بەسەر باغەکەیدا دەنواڕی و کەمێك ژوورەکەی رووناك دەکردەوە خۆزەپالاسیۆس باری تەختەکەی بە شێوەیەك گۆڕی کە پەنجەرەکە بکەوێتە خوار قاچەکانی ژەنەراڵەوە و نەوەك لای سەری تا ژەنەراڵ بە ئیسراحەت بتوانێ تەماشای باغی مێوەهاتەکە بکاو لە بۆنو بەرامەی خۆشی میوەی گوئاجابا چێژ وەرگرێ.

ژەنەراڵ دەست لەناو دەستی فرناندۆ و بە هاوڕێیەتی کەشیش کە بەرێوەبەری قوتابخانە بوو، گەیشتنە ئەوێ، هەر لەگەڵ ژەنەراڵ گەیشتە ژووری نووستنی لەتاو شەکەتی پشتی بە دیوارەکەداو لە هەمان کاتدا سەرنجی میوەکانی گوئاجابا[1] ی دا کە لەناو قاپ و لەگەنی لە کوولەکەزەردە دروستکراو دانرابوون و لە هەیوانێ لە پێش پەنجەرە دانرابوون. بۆنو بەرامەی میوەکە ناو ژوورەکەی پونگاندبۆوە و ئەوی سەرسام کرد. هەر بەو جۆرە بە چاوی چوقاوەوە وەستاو هەوای یادگارییەکانی رابردوی هەڵدەمژی. ئەو یادگاریانەی کە گیانی لەلەشی جیادەکردەوە ئەوساکە بە وردی تەماشای ژوورەکەی کرد، هەروەکو بڵێی کە هەریەکێك لە شتەکانی رازونیازێکیان بۆ ئەو دەگێڕاوە. جگە لە تەختێکی گەورە و کۆمەدیەك کە لە داری کاژ دروستکرابوو لەگەڵ پاتەختیەك کە لە هەمان جۆرە دار دروستکرابوو و تاتە بەردێکی مەڕمەڕیان لەسەردانابوو و لەگەڵ کورسییەکی رحەت کە مەخمەڵێکی سووری لێدروا بوو ، لە ژوورەکەدا هەبوون. بەسەر دیوارەکەوە بە تەنیشت پەنجەرەکەوە سعاتێکی هەشت گۆشەیی بە ژمارەی رۆمی سعات یەك و حەوت دەقەی نیشاندەدا. ژەنەراڵ گوتی: "هیچی تێدا نەگۆڕاوە."

کەشیشەکە زۆر سەری سورماو وتی: "داوای بوردن دەکەم قوربان، بەڵام ئەوەندەی من لەبیرمە ئێوە پێشتر تەشریفتان بۆ ئێرە نەهێناوە."

---

[1] گوئاجابا: میوەیەك بە ئەندازەو شێوەی هەرمێ رەنگی جیاجیاو تامی شیرینی هەیە.

خۆزەپالاسیۆسیش زۆر سەری سوڕما و وتی: "چونکە هەرگیز ئەو خانووەکەی نەدیتبوو، بەڵام ژەنەراڵ ئەوەندە نیشانی خانووەکەی هەڵداو یادگاری وردوردی لەمەڕ ئەم خانووەوە گێڕاوە کە سەری هەموویانی سوڕماند دواجار هەوڵیدا بە حاڵەتێکی توانجاویە هەمیشەییەکەی دڵی ئەوان رحەتبکا. گوتی: "رەنگە لە ژینێکی دیکەدا بووبێ، بەهەرحاڵ لە شارێکی چکۆلەدا کە دوورخراوەیەك لە ژێر پارچە قوماشێکی پیرۆزدا دەڕوا هەموو شتێك لە توانادایە."کەمێك دواتر هەورەتریشقەو بارانێکی وا بەرێژنە دەستیپێکرد کە لەناو شار لافاو هەڵسا. ژەنەراڵ سوودی لەمە دیت، سەردان و چاوپێکەوتنەکانی رەتکردنەوە و بەهەمان شێوە بە جلو بەرگەوە لەسەر تەختی ژوورەکە راکشا تا چێژ لە بۆن و بەرامەی گوئاجا وەرگرێ. دوایی بەهۆی ئارامی دوای نیشتنەوەی لافاوەکە بە تەواوی خەوبردیەوە. ژەنەراڵ لە خەودا بە تواناو لەرەی دەنگی سەردەمی لاوی قسەی دەکرد، لەمەوە خۆزەپالاسیۆس زانی کە بەراستی خەوی لێکەوتووە، ژەنەراڵ ئەم حاڵەت و لەرەی دەنگەی تەنیا لەخەودا دەبینی، لەبارەی کاراکاسەوە دەیگوت، وێرانە شار کە ئیدی پەیوەندی بەوەوە نییە بەدیوارە داپۆشراو پڕ لە دروشمەکانی دژی ئەو و شەقامە پڕ لە گومیزەکانی. خۆزەپالاسیۆس لە قوژبنێکی ژوورەکە لەسەر کورسیەکی رحەت دانیشتبوو و پاسەوانی لەوەدەکرد. کە کەس نەیەتە ژوورەکە جگە لە هاوڕێ و دەستە براکانی ژەنەراڵ نەوەکا گوێیان لە قسەکانی بێ، لە کەلێنی دەرگا نیوەکراوەکەوە ئاماژەیەکی بۆ سەرهەنگ ویلسۆنکرد و ئەویش ئەو سەربازانەی کە لەوێ پیاسەیان دەکردو دووریخستنەوە.

ژەنەراڵ لەخەودا گوتی: "لێرەکانە کەس ئێمەی ناوێ و لە کاراکاس هیچ کەسێك ئێمە ناخوێنێتەوە."

لەدوای ئەمە کەوتە سکاڵاو پەشیمانی: ئەم هەموو خۆڵەمێشی شکۆو گەورەییەی بەربادرابوو کە بای مەرگ تیژ لەگەڵ خۆیدا دەیبرد. وەبگرە دوای سعاتێك وڕێنە دەنگێکی تووڕەو ئاسنین کە لە سالۆکەنەوە هات، ئەوی بێدارکردەوە. پڕماندی و بێ ئەوەی کە چاوەکانی لێکبکاتەوە بە دەنگێکی گیراوەوە پرسی:

"چی روویداوە هەی بەرنەفرتکەون؟"

رووداوەکە بەمجۆرە بوو کە ژەنەراڵ لۆرنزوکارکامۆ، لە کۆنەکارەکانی جەنگ کە خولق و خوێیکی توندی هەبوو و زۆر زۆریش ئازابوو، دەیویست بەر لە کات و ساتی دیارکراو بۆ چاوپێکەوتن، بچێتە ژووری ژەنەراڵەوە، دوای زامدارکردنی یەکێك لە سەربازە پاسەوانەکان، لەبەربەستی پشکنینی

سەرهەنگ ویلسۆنیش تێپەریبوو تەنیا توانای لە ئەندازە بەدەری کەشیش بوو کە رێگای لەم کارە گرت و بە لوتفکێکی شیرین ئەوی بۆ ژوورەکەی لاتەنیشتیێ برد.

ژەنەراڵ کە بەهۆی ویلسۆنەوە لە رووداوەکە ئاگادارکراوە. بە تووڕەییەوە هاواری کرد: "بەکارکامۆ بڵێن کە من مردووم. ئەوەندەو بەس، مردوم."

هەر کە ویلسۆن بۆ ژوورەکەی تەنیشتیێ چوو تا کارکامورا ببینیێ، ئەوی دیت کە بۆ ئەو سەردانەی جلی رەسمی سەربازی لەبەرکردبوو و میدالیا جەنگیەکانی بەزی[1] و بەرۆکی خۆیەوە کردبوو. بە چاوانی پڕ لە فرمێسکەوە سەری دەبەرخۆینابوو.

گوتی: "ناویلسون، پەیام بە من مەدە، من خۆم ئەوەم بیست."وەختیێ ژەنەراڵ چاوەکانی کردەوە، دیتی کە بە سعاتی سەردیوار هێشتا سعات یەك و حەوت دەقەیە. خۆزەپالاسیۆس ئەوی لە مێشکی خۆیدا تۆمارکرد و لەبەری کرد، دوایی تەماشای دوو سعاتەکەی بەر باخەڵێی کردو دوای کەمێك فرناندا باریگا هاتە ژووریێ و هەولێدا ژەنەراڵ ناچاربکا قاپێك خواردەمەنی دەرخواردبدا کە بەتایبەتی بۆ ئەوی دروستکردبوو. لەگەڵ ئەوەشدا کە لە رۆژی پێشوەوە هیچی نەخواردبوو، بەڵام خواردنەکەی نەنا سەر زاری. لەگەڵ ئەمەشدا قبووڵی کرد کەقاپەکەی لەو نووسینگە دانێن کە تێیدا چاوی بە میوانان دەکەویێ و تا لە هەمان شوێن خواردنەکەش بخوا. لەم کاتەدا غایلەی بە مێشکدا هات و گوئاجابایەکی ناو قاپێکی بەرپەنجەرەکەی هەڵگرت، یەکەمجار زۆر باش بۆنیکرد، دوایی گازێکی لێگرت و بە خۆشحاڵی و حاڵەتێکی منداڵانەوە باش جویی و کەم کەم قوتی دا. پاشدان چۆوە ناو جێگاکەی دانیشت: قاپە پڕ لە گوئاجاکەی لەنێوان لینگی خۆی یەکە یەکە ئەوەندە بەخێرایی خواردنی کە وەبگرە دەرفەتی هەناسەدانیشی نەبوو. بەر لە خواردنی دواگوئاجا خۆزەپالاسیۆس بە حەپەساویەوە گوتی: "ئێستا دەمری."

ژەنەراڵ پێکەنی و وەڵامیداوە: "ئیدی هەرلەوە خراپتر نابیێ."

بەپێی بڕیارێك کە پێشتر درابوو سەر لە سعات سیێ

ونیو کەسانێکی کە دەیانویست چاویان پێی کەویێ، دوو دوو هاتنە ناو نووسینگەکەیەوە. لەگەڵ هەریەکەیاندا بە کورتی قسەی کردو تێیگەیاندن کە دەبیێ چاوی بە خەڵکی دیکەش بکەویێ. دکتۆر نیگاسیودل واجە لەیەکەمین کەسانێك بوو کە چووە ژوورەوە. ژەنەراڵی لە بارێکدا دیت کە پشت لە پەنجەرەو روو لە باغەکە دانیشتبوو ئەو قاپە خواردنەی کە فرناندا

---

[1] زی : بەریاخەی کراس ، یان بەرۆك.

باریگا بۆی بردبوو. لەناو دەستدابوو و هێشتا دەمی لێنەدابوو، چونکە بە خواردنی گواجابا سکی بایکردبوو. لە پاشدا دکتۆر نیکاسیۆدل واجە بیرورای خۆی لە رستەیەکدا زۆر راشکاوو بێباکانە دەربڕی: "ئەم پیاوە تەنیا بە کەڵکی ژێر خاك دێ."

خەڵکەکەی کە لەگەڵ ئەودا لە چاوپێکەوتندا بوون، بەیەك شێوە بیرورای خۆیان دەربڕی ، بەڵام هەموو قسەکانی لەگەڵ یەکدا کۆك بوون. لەگەڵ ئەوەی هەتا کەسانێکی کە زۆر لە ژێر کاریگەرێتی حاڵەتی زەبوونی و بێچارەیی ژەنەراڵدا بوون. تەنیا دەیانوت کە دەبێ بڕواتە لادێ و بە باری خەڵکی و هەژاری ئەوان ڕابگا ویادکردنەوەی رێو رەسم و شوێنە گشتیەکان بگرێتە ئەستۆ، یا جۆرە کارێکی لەم بابەتە بکا.

ژەنەراڵ هەرچەندە حەزی دەکرد هەموو ئەو کەسانە ببینێ کە لە بەیانیەوە چاوەڕێ ی چاوپێکەوتنی ژەنەراڵ بوون. بەڵام لەبەر سەرگێژەو دڵ تێکهەلاتنێکی کە بەهۆی خواردنی گوئاجابا وەتووشیبوو. ناچار بوو هەموو دیدارەکانی دیکە وازلێبێنێ. حەوشەکە پڕ لە گوێرەکەبوو پڕ لە بزن، مریشك و کەڵەباب و ئاژەڵی دیکەی کە خەڵکی بەدیاری هێنابوویانن سەربازان ناچاربوون بێنە ناوەوە تا بەری قەرەباڵغی بگرن ، بەڵام دەمێك دواتر بەهۆی رێژنە بارانێکی توندەوە هەموو شتێك گەڕاوە سەرباری ئاسایی و بێدەنگی باڵی بەسەر ئەو ناوەدا کێشایەوە.

لەگەڵ ئەمەشدا ژەنەراڵ رەزای لەسەر نەبوو. بەڵام بۆ سعات چوار لە ماڵێك میوانداریەکیان بۆ رێکخستبوو. بەڵام میوانداریەکە بەبێ ئەو بەرێوەچوو لەبەرئەوەی گوئاجابایەکان رەوان[1] بوون تا دوای سعات یانزە لە حاڵێکی زۆر ناخۆشدا بوو. لەناو نوێنەکەی لێی راکشابوو، دەردەدڵی وە تەنگی هێنابوو. بای بۆنداری لێبەردەبوو. وایدەزانی کە خەریکە گیانی لەلەشی جیادەبێتەوە. کەشیش کە دەرمانێکی لەلای دەرمانگرەوەیەك هێنابوو، بۆ ژەنەراڵی برد. ژەنەراڵ وەرینەگرت و گوتی: "ئەگەر شتێکی رەوان وایکرد کە توانای خۆمان لە دەستبدەین ئەوا ئەو دەرمانە دەبێتە هۆی لە دەستدانی گیانم."خۆی بەدەستی چارەنووس سپارد، لەناو ئارەقەی ساردا هەموو گیانی هەڵدەلەرزی و هیچ شتێك نەبوو دڵیبداتەوە و ئارامی بێنێتەوە بەرێ جگە لە مۆسیقایەکی پچڕ پچڕ کە لەنێو میوانەکانی کە ئەو لە نێوانیاندا ئامادەنەبوو، دەهاتە بەرگوێ، کەم کەم دەردەکەی سکی ئارامی گرت، ژانەدڵ و مۆسیقاش تەواو بوو ئەو لەناو فەزادا لە باڵەفڕێ و مەلەمەلدا ماوە.

---

١ رەوان: ملین ، موسوهیل.

جاری پێشوو کە هاتبووە مومپوکس، هێندەی نەمابوو کە دواجارییبێ دوای ئاشتبوونەوەو یەگرتن لەگەڵ ژەنەراڵ خۆزە ئانتۆنیوپایز، کە هەڵبەتە هێشتا بە تەواوی خەونەکانی جیاخوازی لە کەللەی دەرنەکردبوو، لە کاراکاس دەگەڕاوە. لەو کاتەدا دوژمنایەتی ئەو لەگەڵ سانتاندر ئاشکرابوو و کەوتە دەمی هەموو خەڵکی تا بەوە گەیشت، کە چیدی وەڵامی نامەکانیشی نەداوە، چونکە متمانەی لەو وەرگرتبۆوە. بۆ سانتاندەری نووسی: "زەحمەت مەدەنە بەرخۆتان و خۆتان بە دۆستی من لە قەڵەم مەدەن."یەکەمین بیانووی لایەنگرانی سانتاندر ئەمە بوو کە ژەنەراڵ بەبێ قووڵبوونەوە لەمەڕ خەڵکی کاراکاسەوە وتبووی من هەرکارێکی دەیکەم لە پێناو سەربەخۆیی و شکۆی کاراکاسە.

لە گەڕانەوەی بۆ نوئباگرانادا هەوڵیدابوو کە لەگەڵ نواندنی رێز بۆ کارتاخناد مومپوکس باری قسەکەی پێشووی خۆی هەڵگرێ و وتبووی: "ئەگەر کاراکاس ژیانی پێبەخشیم، ئەوا ئێوە گەورەیی و شکۆتان بە من بەخشی، بەڵام ئەم رستە تەشریفاتی و کەم بایەخ دەهاتە بەرچاو و نەیتوانی سانتاندریها رازی بکا.

ژەنەراڵ بۆ بەرگرتن لە کارەساتی زێتر لەگەڵ گوردانێك بۆ سانتافە گەڕاوە. بڕیاروابوو کە لە رێگادا گوردانێکی دیکەشیان دەگەڵ کەوێ و ئەو دەچووتا جارێکی دیکەیشی یەکێتی کیشوەرەکە دروستبکاتەوە. هەروەك سەردەمێك کە مەبەستی بوو بەر لە جیابوونەوەی ڤەنزویلا بگرێ. ئەم جارەشیان گوتی ئێستا حەساسترین چرکەکانی ژیان بەسەردەبا ، بەڵام بە زێتر بیرکردنەوە لە رابردوو دەیتوانی ئەوەی بۆ دەرکەوێ کە هەر چرکەساتێکی ژیانی لەبیست ساڵ لەمەوبەر حەساتر بووە. دوایی بەیادی ئەو رۆژانە نووسیبووی: "تەواوی کلێساکان، سوپاو زۆرینەی خەڵکی پشتیوانی من بوون."بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا زۆر کایان تاقیکردبۆوە کە هەر جارێکی لە خوار و بەرەو ژووردەچوو ، یان بە پێچەوانەوە. ئەو وڵاتەی کە بە جێدەهێشت و لەبەریەك هەڵدەوەشاوەو چەند جەنگێکی ناوەخۆی تازە لە رەگەوەی هەڵدەکێشا. ئەمەش چارەنووسی بوو.

دەزگاکانی راگەیاندنی سانتاندریەکان هیچ هەڵێکیان لە کیس خۆیان نەدەدا بەتایبەتی بۆ ئەوەی وا بنوێنن کەشکستە سەربازیەکانیان لەبەر خۆش رابواردنی شەوانەی ئەوە.

پڕووپاگەندەیەکی زۆریان بۆ بەد ناوکردنی دەکرد، ئەو رۆژانە لە سانتافە وایان بڵاوکردبۆوە کە ژەنەراڵ سانتاندر فەرماندەیی جەنگی بوجاکای کردوە، جەنگێك کە لە رۆژی حەفتەمی

ئابی ١٨١٩ لە سعات حەوتدا مۆری سەربەخۆیی پێوەنرا لە هەمان کاتدا کە ژەنەراڵ لە تونجا خەریکی رابواردن بووە لەگەڵ ژنێك.

بەهەر حاڵ تەنیا دەزگا پرۆپاگەندەچیەکانی سانتاندریەکان نەبوو کە لە کردەوەکانی شەوانەی ژەنەراڵ بۆ پروپاگەندەو بەدناوکردنی سوودیان دەبینی. لە پێشدا باسی سەرکەوتن دەکرا. کەوا ژەنەراڵ لانیکەم لەسێ جەنگ لە جەنگەکانی سەربەخۆیی شکستی هێناوە. لەبەرئەوە لە باتی ئەو جێگایەی کە دەبێ تێیدا تۆتکە بگرێ، لەناو نوێنی ژنێکدا نوستبوو، لە یەکێك لەسەردانەکانی دیکەی شاری مومپوکسی دا کاروانێك لە ژن و ژاری تەمەن جیاجیا بە شەقامی سەرەکی شاردا رابورودن و ئەو ناوەیان پڕ لە بۆن و بەرامەی خۆیان کردبوو. کڵاوی رەنگاوڕەنگیان لەسەرو کراس و جلکی ئاوریشمیان لەبەردابوو. بەر لەوە مومپوکس، ژنی لەو بابەتەو جلوبەرگی لەو تەرزەی بە خۆوە نەدیتبوو، هەموو لەو باوەڕە دابوون کە ئەمە حەرەمسەرای ژەنەراڵەو پێش خۆی سەفەردەکەن. بەڵام ئەمەش وەك زۆر وێنای دیکە ناراستبوو، چونکە حەرەمسەرای جەنگی ژەنەراڵ یەکێك لە دڵخۆشییەکانی بوو کە لە پاش مەرگیشیدا هەر بە دواوەی بوو. شێواندنی هەواڵ و دەنگ و باسیك کەشتێکی تازە نەبوو، خودی ژەنەراڵیش لە رووبەڕوو وەستانەوەی لەگەڵ ئیسپانیەکان سوودی لەم شێوازە دیت و فرمانی بە سانتاندر دابووکە بۆ سەرلێتێکدانی فەرماندە ئیسپانیەکان پڕۆپاگەندەی درۆ هەڵبەستن. بەم پێیە دوای سەربەخۆیی و دروستبوونی کۆمار، کاتێك کە ژەنەراڵ بەهۆی دەنگ و باسی درۆوە لێکۆڵینەوە لەگەڵ سانتاندەر دەکا، سانتاندەر وەڵامێکی توانجاوی ، بەڵام شیرین دەداتەوە."قوربان، مامۆستانێکی زۆر باشمان هەبوو."

ژەنەراڵ وەڵامیدەداتەوە: "مامۆستایەکی خراپ بووە، لەبەر ئەوەی هەروەك لە بیرتانە ئەو هەواڵەی تەزویرمانکردبوو، دژی خۆمان بەکارهێندراوە."ژەنەراڵ لەسەر هەر شتێکی کە لە بارەیەوە دەگوترا، راست یان درۆ زۆر بەهەست بوو و هیچ کاتێك نەیتوانی لەم پرۆپاگەندە هەڵبەستراوانە خۆشبێ و تا دوا هەناسە بۆ بەدرۆ خستنەوەیان هەوڵیدەدا.

بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا هیچ کاتێك پارێزی وەرنەدەگرت، لەسەفەری پێشوشیدا بۆمپوکس لەبەرخاتری ژنێك یاری بەناوبانگی خۆی کرد. ناوی ئەو ژنە خۆزفاسگرا یۆ و لە ژنە رەسەنەکانی موکپوس بوو.

دەمو چاوی خۆی داپۆشیبوو تەنیا کونی چاوەکانی دیاربوون. بەوشەیێکی نهێنی کە خۆزەپالاسیۆس فێری ئەویکردبوو لە هەر حەوت بازگەی پاسەوانان تێپەڕی و لەشی ئەوەندە

سپی بوو کە لە تاریکی شەودا دەدرەوشاوە. ئەو شەوە بە گەردەنلغێکی گەورەی زێڕەوە، دەستکاری مومپوکس بوو، جوانیەکەی ئەوی چەند قاتکردبوو، ئەم گەردەنبەندە ئەوەندە سەنگین بوو کە ژەنەراڵ نەیتوانی بەرزبیکاتەوە، بەرە بەیانیانێك دوای شەوێکی هەرگیز فەرامۆش نەکراو، کە خێرا کۆتایی هاتنی ئەو شەوە لە دڵی خۆزفا گرانهات، و بەتکاوە داخوازی لە ژەنەراڵ کرد تا شەوێکی دیکەش لەوێ بمێنێتەوە.

ترسێکی گەورە لە گۆڕێدا بوو، چونکە دام و دەزگاکانی هەواڵگری ژەنەراڵ هەواڵیان هێنابوو کە سانتادر نیازی هەیە دەسەڵات بگرێتە دەست و کۆلۆمبیا جیابکاتەوە. بەڵام ژەنەراڵ لەوێ ماوە نەك هەر شەوێك بەڵکە دە شەوان ماوە. شەوانێکی ئەوەندە پڕ خۆشی و شادی بوون کە هەردووکیان وایاندەزانی بەراستی عەشقی یەکدی لێیداون خۆزا گەردەنلغە زێڕەکەی پێشکەشی ئەو کرد و ووتی: "بۆ جەنگەکانت"بەڵام ژەنەراڵ ویژدانی هەڵینەگرت کە ئەو زێرە خەرج بکا. چونکە سامانێك بوو لە ژنێکەوە هاتبووە دەستی، لەبەرئەوە بە ئامانەت لە کن یەکێك لە دۆستەکانی دانا، خۆزافای لەبیرکرد، لەم دواسەفەرەیدا بۆ مومپوکس دوای خۆ مڕکردن لە خواردنی گوئاجابا فرمانیدا کە سندووق بکەنەوە تا بزانێ چیتێدایە و تەنیا ئەو حەلە بوو کە ناوی ئەو و ئەو شەوەشی لەناو یادەوەریەکانیدا بەبیرهاتەوە.

دیمەنێکی تا بڵێی سەیر بوو، گەردەنلغە زێرەکەی لەمەڕ خوزافا سگرایۆ کە جۆرەها شێوەی وەستاکاری تێداکرابوو، کێشی پانزەکیلۆبوو لەناو ئەو سندووقەدابوو. ئەمە وێڕای بیست و سێ چەنگاڵ، بیست و چوار دانە کەوچکی بچکۆلەی شەکر، هەموویان لە زێر دروستکرابوون و تەواوێك کەلوپەلی بەنرخی ناو ماڵ کە لە ناو ئەو سندووقەدا لەبیرچووبوونەوە. بەهۆی باری هەمیشە پەریشانی ژەنەراڵ ئەم شتە بەنرخانە لە شوێنێکدا کە کەس بیری بۆی نەدەچوو، سەرسامیەکی زۆری لێنەکەوتەوە، ژەنەراڵ فرمانیدا کەلوپەلەکانی ناوماڵ، بە کەوچك و چەقۆ و چەنگاڵەکانەوە رەگەڵ بارەکەیان بخەن و گەردەنلغە زێرەکە بدەنەوە خاوەنەکەی. بەڵام کەشیش ئاگاداریکردەوە کە خۆزە سگرایۆ بەهۆی نانەوەی ئاژاوەوە لە دژی ئاسایشی وڵات لە تاروگەکەیدا لە ئیتالیا دەژی. ئەمەش زۆر بە سەختی ژەنەراڵی حەپەساند.

ژەنەراڵ گوتی: "بەدڵنیاییەوە کاری سانتاندەر بووە."کەشیش وەڵامیداوە: "نا ژەنەراڵ. ئێوە خۆتان لە بارێکی شێواوی ساڵی بیست و هەشت بەبێ ئەوەی سەرحاڵ بیت، ئەوت دوورخستەوە."

سەندوق و گەردەنلغە زێرەکەی هەر لە شوێنی خۆی بەجێهێشت، هەروەك بیری دەکردەوە، هەموو شتێکی بۆ ڕووندەبۆوە، بەڵام بایەخی دیکەی پێنەدا، هەر بەو جۆرەی کە بە خۆزە پالاسیۆسی وتبوو دڵنیابوو هەر لەگەڵ دوورکەوتنەوەی لە کەنارەکانی کارتاخنا، خوزفاو دوژمنەکانی دیکەی تاراوگەی دەگەڕێنەوە.

ژەنەراڵ وتی: "ئێستا کارساندۆ خەریکی بەستنی سەندوقەکانیەتی."لە ڕاستیدا زۆر لە دوورخراوەکانی دوای ئەوەی کە ئاگادارکرانەوە ژەنەراڵ نیازی وایە بۆ ئەوروپا سەفەربکا، بەبێ خۆ وەخراندن دەستیان بە گەڕانەوەکرد.

بەڵام ژەنەراڵ سانتدر، پیاوێکی زۆر بە پارێزو قایم بوو کە هیچ کاتێك نەدەکرا پەی بە مەبەستەکانی ببرێ. لەدوا دوای ئەو کەسانە بوو کە بۆ وولات گەڕاوە، هەواڵی دەستکێشانەوەی سانتدری بەناچاری هەڵبەستبوو، بەڵام هیچ نیشانێکی گەڕانەوەی ئەو نەدیترا، لە ئۆکتۆبەری ساڵی ڕابردوودا کە لە هامبۆرك دەژیا. دەستی بە سەفەری تۆژینەوە و تۆژینەوە کاریکردبوو، ئەم بەرنامە هیچ گۆڕانکاریەکی بەسەردانەهات، ڕۆژگارێك کە لە فلۆرەنسا دەژیا، لە ڕۆژنامەی ژۆرنال دوکوموس دا لەڕێکەوتی دووی مارسی ساڵی ١٨٣١ هەواڵی مەرگی خوێندبۆوە. لەگەڵ ئەمەشدا تا شەش مانگ دواتر کە دەوڵەتی نوێ هەموو نیشانەکان و سەرقاڵیە سەربازیەکانی بۆ ئەو گەڕاندنەوەو لە غیابیدا ئەوی وەك سەرۆك کۆمار هەڵبژاردو نەگەڕاوە وولات.

بەر لە بەجێهێشتنی مومپوکس، ژەنەراڵ چووە سەردانی هاوسەنگەرو دۆستی دێرینی لورتروکارمو، تەنیا ئەوساکە بوو کە پێیزانی ئەو زۆر نەخۆشە و ڕۆژی ڕابردوو تەنیا لەبەر سەردانی ئەو لە جێگای خۆی ڕاستبۆتەوە، ژەنەراڵ بەزەحمەت دیتوانی تەحەمولی توانای ئەو بکا: کە وەك هەورە بروسکە قسەی دەکرد و بە سەرینەکانی ڕێچکەی فرمێسکی سەرەو ژێری چاوەکانی کە هیچ پەیوەندیان بە هەست و حاڵ و باریەوە نەبوو، وشکدەکردەوە، لە تەنیشتیەکەوە دانیشتبوون و سکاڵایان لە دەست نەخۆشی و ناسوپاسی خەڵك و خۆڕانەگرتنی سەرکەوتنەکانیان دەکرد. سەرەنجام بە ناچاری قسەو باسیان هاتەسەر بابەتێك کە بە خراپە باسکردنی سانتاندەر بوو. لە کەم کاتاندا ژەنەراڵ بەمجۆرە ڕاشکاوی و بێپەردەییەوە قسەیکردبوو. لە جەنگی ساڵی ١٨١٣ لورنوسو کارکارمۆ شایەتی دەمەقاڵەی توندی نێوان ژەنەراڵ و سانتاندربوو. لەو سەروەختەدا سانتاندەر لە پەڕینەوەی لە سنوورو ئازادکردنی ڤەنزویلا بۆ دووەمینجار سەرپێچیکرد. ژەنەراڵ کارکامۆ بیری دەکردەوە کە ئەم بابەتە ڕیشە و سەرچاوەی جیاوازیەك بوو کە دوای ئەوە بە دەستی چارەنووس و مێژوو قووڵتربۆوە.

بەڵام ژەنەراڵ لەسەر ئەم باوەڕە دابوو کە ئەم ڕووداوە نەوەك تەنیا کۆتاییەك نەبوو، بەڵکە ئەوەی بەسەرەتای دۆستایەتیەکی گەورە دەزانی نە ئەو ئیمتیازانەی بە ژەنەراڵ ئائزی دابوو نە ئەو گرفتانەی کە لە قانوونی بنچینەیی پۆلیڤیا هاتە پێشێ، نەپلەو پایەی شاهانەکە لە پیرۆ بەدەستی هێنا، نە سەرۆکایەتی کۆماری کۆلۆمبیا و نە ئەو دەسەڵاتە ڕەهایەی کە دوای پەیمانی ئۆکانیا هاتە دەستی. لەبڕوای ژەنەراڵ هیچ یەکێکیان نەببووە هۆی ناکۆکی. نا...نە ئەوانەو نە زۆر هۆکاری دیکەش هیچ یەکیان هۆی ناکۆکی نەبوون کە بەدرێژایی ساڵەکانی دوایی زێتر ڕەگ و ڕیشەی داکوتا تا گەیشتە دڵی کوشتنەکەی ٢٥ ی سێبتێمبەر، ژەنەراڵ گوتی: "هۆی سەرەکی ئەمەبوو کە سانتاندەر هیچ کاتێك بیرۆکەی یەکێتی ئەم کیشوەرەی قبووڵنەکرد. یەکێتی ئەمریکا بۆ ئەو زۆر گەورەی دەنواند. تەماشایەکی لورنزو کارکامۆی کرد کە لەسەر تەختەکە ڕاکشابوو و وەك ئەوە بوو کە لە گۆڕەپانی جەنگ شکستی هێنابێ. لێرەکانە بوو کە دیدارەکە کۆتایی پێهات.

لەدوا چرکەدا گوتی: "بەهەر حاڵ تێکڕای ئەمانە مەسەلە هایەکن کە ڕابردوون و لەدەست چون و ئیدی سودێکیان نیە."

هەر بەم شێوە کە ژەنەڕاڵ غەمگین نارِحەت ڕاستدەبۆوە، لۆرەنزۆ کارکامۆ تەماشایەکی ئەویکرد و بۆیدەرکەوت کە باری یادەوەریەکانی ڕابردوو لەسەر ژەنەراڵیش سەنگینە کاتێك کە بۆ خواحافیزی دەستەکانی گرت. زانی کە هەردووکیان تایان لێیە لەخۆی پرسی مەرگی کامە لە ئێمە دەبێتە هۆی ئەوەی کە نەتوانین ئەویدیکەمان ببینینەوە؟

لۆرەنسۆ کارکامۆ وتی: "سیمۆنی پیر، دنیامان لە دەستدا."

ژەنەراڵ گوتی: "ناچاریانکردین لە دەستیبدەین . تەنیا کارێکی کە لە دەستماندێ ئەمەیەکە جارێکی دیکە تیهەڵچینەوە."

لورەنسو کارکامۆ وەڵامیداوە: "هەر ئەوهاشدەکەین."

ژەنەراڵ ووتی: "بۆ من ڕابردوەو من تەنیا بە کەڵکی ناو تەنەکەی خۆڵ دێم."

لۆرەنسۆ کارکامۆ جووتە تفەنگێکی کە لە پارچە قوماشێکی ئاوریشمی سووری تێوەر پێچرابوو پێشکەێشی ژەنەراڵی کرد. دەیزانی کە ژەنەراڵ حەز لە چەکی گەرم ناکاو جارجارێ کە بەرگری لە خۆی کردوە پەنای بۆ شمشێر بردوە. بەڵام ئەم تفەنگانە نرخێکی مەعنەویان هەبوو، لەبەرئەوەی بەسەرکەوتوویی لە موبارەزەیەکدا کە لەسەر عیشقێك کرابوو،

بەکارهێنرابوو. ژەنەراڵ بە ورووژان و هەڵچوونێکەوە وەریگرتن. چەند رۆژێك دواتر لە توورباکۆ[1] هەواڵیان پێگەیاند کە ژەنەراڵ کارکامۆ مردوە.

سەفەرەکەیان بەسەرەتایەکی خۆش لە پاشنیوەڕۆی رۆژی بیست و یەکی مانگی مایس دەست پێ کرد. تەوژمی ئاو خێرانز لە سەوڵ لێدان ئەوانی لە کەنار ئاوەکە دوور دەخستەوە. بەلەمێکی زۆری کە لە قەدو کاریتەی دار دروستکرابوون، دەبینران ئەم جارە لەبەرچاوان خێراتر بوون. بە پێچەوانەی ئەو بەلەمانەی کە لە رۆژەکانی یەکەمدا، ژوورۆکەیان لەسەر دروستکردبوون کە لە کەنار پەنجەرەکانیانەوە مەرکان و جلوبەرگێکی کە بۆ وشك بوونەوە هەڵخسترابوون، بەرچاو دەکەوت. قەفەزی پڕ لە مریشك و کەڵەشێرو چێل و ولاخیش لەم بەلەمانەدا بارکرابوون. منداڵی بێدارو بارو لاوازۆکە لەسەر بەلەماندا وەستابوون و تا ونبوونی بەلەمەکانی ئەوان بۆ خوا حافیزی دەستیان بۆیان رادەتەکاند. تەواوی شەوەکە لە ژێر ئاسمانێکی ئەستێرەباراندا سەوڵیان لێدەدا. هەتاو کەوتبوو، لەناو رووناکایی و درەوشانەوەی تیشکی خۆردا، شاری بچکۆلەی سمبرانۆ[2] دەدیترا. دۆن کاستولۆ کامپیجۆ کە بە ئال نینیێ بە ناوبانگ بوو، لەژێر دارێکی گەورەدا لە بەندەر چاوەڕێی ئەوانیدەکردو لە ماڵەوە بۆ نانی نیوەڕۆیان سانکوچو[3]یان لێنابوو. ئەم میوانداریە لەسەر بنچینەی چیرۆکێك بوو کە دەیانگوت ژەنەراڵ لە یەکەمین سەردانی سمبرانویدا لە چێشتخانەیەکی ناچیزو چکۆلانە نانی نیوەڕۆی خواردبوو و لەبەرخاتری سانکوچوی بەلەزەتی ئەم چێشتخانە ژەنەراڵ گوتبووی کە ئەگەر لەبەر ئەم خواردنەش بووبێ ساڵی جارێك دێتە سمبرانۆ. بەڵام ژەنەراڵ چیدی شتە وردەکانی ئەو سەفەرەی لەبیرنەمابوو. ئەویش و خۆزەپالاسیۆسیش گومانیان دەکرد کە ئایا سانکۆچۆ هەمان گۆشتاوی ڤەنزویلاییە یان نا. ژەنەراڵ کارنیۆ گومانی دەکرد کە هەردووکیان یەك شتن و دڵنیابوو کە ئەو خواردنەیان لە هەمان چێشتخانەی بەندەر خواردبوو. نەك لە سەفەری شارو گوندەکانی کەناری رووبار. بەڵکە سێ ساڵ پێشتر وەختێ کە بەبەلەمێکی هەڵمی بەسەفەر دەچوون. ژەنەراڵ کە هەر کایەکی لەبەر لەبیرچوونەوەکانی پتر نیگەراندەبوو. قسەکەی ژەنەراڵ کانیۆی بە سادەیی و تەوازعیکەوە قبووڵ کرد.

---

١ توورباکۆ : شارێکە لە کۆلۆمبیا

٢ سمبرانۆ: شارێکی بچوکی کۆلۆمبیایە .

٣ خواردنێکە لە گۆشت و مۆزو جوکا کە جۆرە میوەیەکە و چەند میوەیەکی دیکە ئامادە دەکرێ.

سەربازەکان فراوینی خۆیان لەسەر مێزی گەورە گەورەی لە تەختەدروستکراو کە لە ژێر درەختە چوالەکانی حەوشەکەی ماڵی جەنابی کامپیچۆ دانرابوون ، خوارد، لە حاڵێك کە لە باتی پەردە سەرمێزەکان گەڵای دارمۆزیان لەسەر ڕاخرابوو. لەبەر هەیوانەکە کە دەیڕوانییە سەر حەوشەکە. مێزێکی پڕ لە کەش و فشیان بۆ ژەنەراڵ و ئەفسەران و میوانێکی کە بانگ کرابوون بەشێوەیەکی ئینگلیزیانە ڕازاندبۆوە کەیبانوی ماڵ بۆی ڕوونکردنەوە کە هەواڵی دەرچوونیان لە مومپوکس تازە سعات چواری بەیانی پێگەیشتووەو هێندەی بلێی بەدەمێك و بە پەلە تەنیا توانیویانە لە قەدەر کاتەکە باشترین ئاژەڵی ماڵەکە بکوژنەوە و خواردنێکیان لە گوڵم و پشکەگۆشتان کە لە ئاوێکی زۆرو جۆرەها میوەدا لەسەر ئاگرێکی کزدا کوڵاندبوو، بۆ ئامادەکردبوون. ژەنەراڵ لەوە نارحەت بوو کە بەبێ ئاگاداربوونی پێشوەخت ئاهەنگێکیان بۆ سازدابوون. خۆزەپالاسێوس ناچار بوو کە هەموو توانای خۆی بەکاربێنێ تا ژەنەراڵ بەوە ڕازی بکا تا بەشداری لەو میوانداریەدابکا. کەش و هەوای دۆستانەی ئاهەنگەکە نەختێ ژەنەراڵی هێناوە سەرخۆ. کەوتە پێداهەڵگوتنی چۆنێتی خواردن و شیرینی کچیژگە جحێڵەکانی کە میوانداریان دەکرد، بەر لە هەموو شتێك لەسەر نرخی کەوچك و چەنگاڵە پاك لەزیوەکانی گوتی کە نیشانەی تایبەتی کۆنەخانەدانێك بەسەریانەوە دیارە کە بەتێپەڕینی زەمان لەنێو چوبوون. بەڵام لە هەمانکاتدا بە کەوچك و چەنگاڵی تایبەتی خۆی نانی خوارد.

تەنیا ناخۆشیەکی کە ڕوویدا لەلایەن کەسێکی فەرەنساییەوە بوو کە لەگەڵ خاوو خێزانی کامپیجۆدا دەژیا. ئەم فەرەنساییەش کە لەسەر مێزی نانخواردن دانیشتبوو، لەبەرانبەر ئەم میوانە بەناوبانگانە بەو پەڕی بێشەرمیەوە لەبارەی مەسەلەکانی ئەم جیهانەو جیهانەکەی دیکەوە چاکەو پیاوەتی خۆی نیشاندەدا. ئەم پیاوە لە ڕووداوێکی دەریایی هەرچی دارو نەداری هەبوو لە دەستیدابوو. لە چاوەڕوانی یارمەتیەکی کە دەبوو لە نوئبا ئورلئانز[1] پێی بگا، ساڵەوەختێك بوو کە نیوەیەکی ماڵی جەنابی کامپیجۆی بەخۆوە خەریککردبوو، و بەخۆو و خزمەتکارەکانیەوە لێرە دەژیا. خۆزەپالاسێوس بۆیدەرکەوت کە ناوی دوگلاس ئەتلەنتیکە، بەڵام نەیتوانی لە کارو تایبەتمەندی بگا کەچییەو بەتەواوی لە نوئباگرانادا چیدەکا، بەلەشی ڕووت و نێزەیەکی سێ سەریەوە کە بەدەستەوەیدەگرت کتومت لە نپتۆن پاشا دەچوو. لە گوندەکە بە زۆروەڕو بەدفەساڵ و ئێسکگران بەناوبانگ بوو. بەڵام نانخواردنی لەگەڵ ژەنەراڵدا

١ ئوئیائور لئانز: ولایەتێکی ئەمریکایە.

بەجۆرێك كاریتێكرد كە حەمامێك بكاو نینۆكەكانیشی بكا، چاكەتێكی شینی قۆپچە زەڕین و پانتۆڵێكی خەتخەتی لەبەركرد.

هەر لەگەڵ سەلامی كرد، بە زمانی ئیسپانی لەمەڕ ئەوەوە دەستی بە قسانكرد كە، یەكێك لە هاوپۆلەكانی لە قوتابخانەی گرنوبل[1] دوای چواردە ساڵ شەونخوونی نهێنی خەت و نیشانەكانی نووسینی میسری كۆنی ئاشكراكرد.

گەنمەشامی لە بنەچەدا دەگەڕێتەوە ناوچەی نێوان دوو رووبارەكە نەك مەكسیك ئاشووریەكان نیشانگەلێكیان دیتبۆوە كە لەمەڕ رێنومایی كاریگەری ئەستێران لەسەر نەخۆشانەوە بوو. بە پێچەوانەی ئەو شتەی كە لە ئینسكلۆپیدیایەكی نوێدا نووسراوە یۆنانیان تا چوارسەد ساڵ بەر لە زایین پشیلەیان نەدیتبوو. بەبێ وەستان لەسەر بابەتی جۆراو جۆر قسەیدەكردو تەنیا كاتێك رستی قسەكانی دەپچڕاند تا لەمەڕ خەوش و كەموكوڕیەكانی چێشلێنەرەكەی ئەوێ شتێك بڵێ.

ژەنەراڵ كە رووبەڕووی دانیشتبوو، هیچ بایەخی بەو نەدەداو وای نیشاندەدا كە زۆر سەرقاڵی نانخواردنەكەیە. بەجۆرێكی وا چاوی لە قاپەكەی بەردەمی هەڵنەدەگرت. رێوكلس هەوڵیدا بە زمانی فەرەنسی قسە لەگەڵ ژەنەراڵ بكا و ژەنەراڵ لە رووی ئەدەبەوە وەڵامیدەداوە بەڵام بەخێرایی دووبارە دەكەوتەوە قسەكردن بە ئیسپانی. دانبەخۆداگرتنو بیندرێژی ئەو رۆژەی ژەنەراڵ زۆر سەری خۆزەلارنسیو سیلیای سوڕماند و دەیزانی خۆپەرستی ئەوروپاییەكان تاچ ئەندازەیەك ژەنەراڵ نارحەت دەكا. دیوكلس بە دەنگێكی بەرز هەتا وایكرد هەموو ئەوانەی كە لە دووریش دانیشتبوون گوێیان لێبێ، بەڵام ئاشكرا بوو كە تەنیا مەبەستی بوو سەرنجی ژەنەراڵ راكێشێ. لە پڕ باسەكەی گۆڕیو لە ژەنەراڵی پرسی بە بۆچوونی ئێوە باشترین سیستەمی حوكدارێتی بۆ وڵات كامەیە. بەبێ ئەوەی ژەنەراڵ چاوی لەسەر خواردنەكەی بەردەمی وەرگێڕێ پرسی: "بۆچوونی ئێوە لەمبارەوە چییە؟"دێوكلس وتی: "بەبۆچوونی من بۆناپارت نمونەیەكی زۆر باشە. نەك هەر تەنیا بۆ ئێوە بەڵكە بۆ هەموو جیهان."

ژەنەراڵ بەبێ ئەوەی ئاوازی دەنگەتوانجاویەكەی بشارێتەوە گوتی: "دوودڵنیم لەوەی كە ئێوە بۆچوونێكی واتان هەیە. ئەوروپاییەكان وادەزانن كە هەرچییەكی دایهێنن بۆ هەموو جیهان باشەو هەر شتێكی دیكەی جیاوازی لەگەڵیدا هەبێ دەبێ وەلانرێ."

دێوكلس وتی: "من وامدەزانی كە ئێوە لایەنگری پاشایەتین."

---

١ گرنوبل: شارێكی فەرەنسایە.

ژەنەراڵ بۆ یەکەمجار چاوی لەسەر قاپە خواردنەکەی هەڵگرت و وتی: "لەمەودوا بەهیچ جۆرێك ئەوها بیرمەکەوە، سەرو کەللەی من هیچ کات توانای هەڵگرتنی تاجێکی نابێ."ئەو کاتە بە پەنجەی ئاماژەیەکی بۆ یارمەتیدەرەکانی کرد و گوتی: "ئایتۆربیدەش لە کەناری خۆم شك دەبەم تا ئەمەم بەبیر بێنێتەوە."

دیوکلس وتی: "لە راستیدا ووتەکەی ئێوە لە کاتی گوللەبارانکردنی ئیمپراتۆردا خەیاڵی سەڵتەنەتخوازانی ئەوروپای رحەت کرد."

ژەنەراڵ گوتی: "تەنیا یەك پیتیش لەوەی کە ئەوسا کە گوتم ناقرتێنم. بۆمن جێگای ستایشکردنە کە مرۆڤێکی ئاسایی وەك ئایتوربیدە بتوانێ کاری ئەوها جێی سەرسوڕمان بکا. بەڵام لە خوا داواکارم من لە پاشایەتی و بوونی چارەنووسێکی وەك ئەو بە دووربگرێ. ئەگەر چی دەزانم کە هەرگیز تووشم بە تووشی بەختێکی ئەوهاوە نابێ."

ژەنەراڵ ویستی شێوەی قسەکانی خۆی نەرم تر بکاو روونیکردەوە کە هەبوونی رژێمێکی پاشایەتی بۆچونی خۆزەئانتۆنیۆ بووە ، کۆمەڵی حسابات و لێکدانەوەی هەڵەبووە هۆی بەهێزکردنی ئەم بۆچوونەو منیش خۆم وامدەزانی کە رێگاچارەیەکی باشە تا بتوانم بە هەر نرخێکی کە بووە یەکێتی ئەمریکا بپارێزم. بەڵام لە پڕ هەستی بەوەکرد لەنێو قسەکانیدا ناکۆکی هەیە. سەرەنجام کورتی کردەوە: "بۆچوونم لەبارەی دەوڵەتێکی فیدرال بە پێچەوانەوەیە. بەبڕوای من ئەمە بۆ وولاتانێکی لە رادەبەدەر پێشکەوتووە لەبەرئەوە ئاوەزو هۆشێکی لەوە زۆرتری دەوێ کە ئێمە هەمانە.

دیوکلس وتی: "بەهەر حاڵ ئەمە رژێمەکان نین ، بەڵکە کەسانێکن کە ناوی مێژوو پیسدەکەن."

ژەنەراڵ وتی: "هەمووومان ئەم چیرۆکە بە باشی دەزانیین. لە راستیدا ئەمە لە گەمژەیی و بێئاگایی جەنانی بنیامێن کنستان بوو. کە گەورەترین حەلّواچی ئەوروپا بوو کە جارێك لەگەڵ شۆڕشدا بوو جارێك دژی دەوەستا. وەختێك لەگەڵ ناپلیۆن لە جەنگدا بوو و پاشان بوو بە یەکێك لە کەسەکانی دەرباری ئەو، زۆر شەوان وەك کۆماریخوازێك دەنووست و بەیانیش سەڵتەنەتخواز لە خەو هەڵدەستاو یان بە پێچەوانەوە، ئێستا ئەمە بەشێکە لە راستیەکی بێچەندو چوونی ژیانی ئێمە. چونکە ئەوروپا ئەوهای ویستوە."

دێوکلس وتی: "بابەتەکانی کۆنستان لەسەر دیکتاتۆری و زۆرداری زۆر روونو ئاشکران."ژەنەراڵ وەڵامیداوە: "جەنابی کۆنستان، وەك نموونەی فەرەنساییەك لەبارەی

بەرژەوەندی موتلەق پێشداوەرن[1] بە پێچەوانە کەشیش پرادت وەختێ کە لە پەیوەندی سیاسەت بە شوێن و کاتی بڕیاردانەوە قسەیکرد. تاکە ڕووی راستی و رۆشنی مەسەلەکەی دیارکرد. لەسەردەمی جەنگدا من خۆم لە تاکەیەك رۆژدا فرمانی گوللەبارانکردنی هەشتسەد دیلی ئیسپانیم دەرکرد ئەمە بە نەخۆش و بریندارانی جەنگیشەوە کە لە نەخۆشخانەی گوئایرا بوون. ئیمرۆ لە هەمان هەلو مەرجدا دەنگم نالەرزێ و دیسانەوە هەمان فرمان دەردەکەم و ئەوروپاییەکان مافی نارەزاییان نابێ، لەبەرئەوە ئەگەر مێژوویەکی خوێناوی نادادپەروەر و ریسوایی هەبێ، ئەوە مێژووی ئەوروپایە."هەرچەندەی پتر سەری ئەم باسەی دەکردەوە. رق و کینەیشی پتر دەبوو. دێوکلس کە زۆر کەوەڕێ ببوو، هەولێدا کە قسەکەی پێ ببڕێ بەلاّم ژەنەراڵ بە ئاماژەیەکی دەستی لە جێگای خۆی بێدەنگی کرد. ژەنەراڵ هەندێ شتی لەسەر کوشتارو رەشەکوژیەکانی ئەوروپا گێڕاوە. شەوی سان بارتولومی [2] ژمارەی کوژراوانی ماوەی دەستانی بە پتر لە دە هەزار کەس گەیشت. لە گەرمەی رێنسانسدا دوازدە هەزار مرۆڤ کوژ و سەرانەستێن شاری رۆمایان کاولکرد و هەشت هەزار کەسیشیان کوشت سەرنجام رووداوی ترسناکی: ئیڤانی چوارەم، چاری روسیاو ناوبانگ بە ئیڤانی ترسناك، هەر هەموو خەڵکی شارەکانی نێوان مۆسکۆ و نوڤاگرادی قڕکردو لە نوڤاگراد تەنیا لەبەر ئەگەری ئاژاوە لە دژی خۆی لەیەك کوشتاری بە کۆمەڵدا بیست هەزار کەسی لە خوێن گەوزاند.

سەرئەنجام گوتی: "لەبەرئەمە لوتف بکەن و بە ئێمە نەڵێن کە چیبکەین و چینکەین. هەوڵ نەدەن فێری ئەوەمانبکەن چۆنبین داوامان لێمەکەن وەك ئێوەبین. چاوەڕێمەکەن کە کارهایەکی ئێوە لە ماوەی دووهەزار ساڵدا بە تەرزێکی کارەساتاوی ئەنجامتانداوە ئێمە لە بیست ساڵ بتوانین بە هەمان توانا ئەنجامی بدەین."

کەوچك و جنگاڵەکەی بەشێوەی پێداکوتانێك فڕێداوە ناوقاپەکە و بۆ یەکەمین جار بە دووچاوی داگیرساوەوە چاوی لە چاوی فەرەنسیەکە بڕی و ووتی: "لوتفەن بەرحەتی وازمان لێبێنە تا سەردەمی سەدەکانی ناوەڕاستی خۆمان تەی بکەین."

---

١ پێشداوەری : تعصب ، پێشداوەر: متعصب.

٢کوشتاری پرۆتستانتەکان لە ئابی ١٥٧٢ لە فەرەنسا، یەکێك لە خوێناویترین لاپەرەکانی مێژووی توندرەوی ئاینیە کە بەدەم زەنگی کلێساوە بەرپابوو.

هەناسەی بڕی و کەوتە کۆخە کۆخ، کاتێ توانی بەسەر کۆخەکەیدا زاڵبێ ئیدی هیچ شونەوارێکی تووڕەی تێدا نەدەدیترا. رووی لە دایکە کەمپێچۆکرد و بە پێکەنینێکی ڕێزدارانەوە ووتی:

"دۆستی ئازیز داوای لێبووردن دەکەم. ئەم قسە نا بە جێیانە لەگەڵ ئەم نیوەڕۆ خوانەدا نەدەگونجان."

سەرهەنگ ویلسۆن ئەم چیرۆکەی بۆ یەکێك لە نووسەرەکانی سەردەمی خۆی . کە ڕووداوەکەی لەبیرچوبۆوە گێڕاوە و گوتی: "کاری ژەنەراڵی کلۆل تەواو بووە."لە ڕاستیدا ئەمە بیرکردنەوەیەکی باوی نێوان تێکڕای کەسانێك بوو کە لەدوا سەفەریدا دیتبوویان و ڕەنگە لەبەر ئەم هۆیە بۆهیچ کەسێك هیچ بەڵگەیەکی نووسراوی بەجێنەدەهێشت. تا بەڕای هەندێ لە هاوڕێکاکانی ژەنەراڵ نەدەچووە ناو مێژووەوە.

لەدوای سمبرانۆ جەنگەلەکان چڕتربوون و گوندەکان شادو گەشاوەتر بوون. لەنێو هەندێك لەو دێیانەدا بەبێ هیچ بۆنەیەك دەنگی مۆسیقا بەرزدەبۆوە. ژەنەراڵ خۆی لەناو جۆلانەکەی ئاویتبوو بە ئیسراحەتەوە هەوڵیدەدا وشە ناخۆشەکانی فەرەنسایییەکە هەرس بکا ، بەڵام کارێکی بەگیروگرفت و زۆرزەحمەت بوو. هەروەك بیری لەوە دەکردەوەو پەشیمانی بە خۆزەپالاسیۆس نیشاندەدا کە بۆچی لە هەمان کاتدا ڕستە و قسەو باسی مێخکوتی و قەناعەتهێنەرتری بەبیردا نەهاتبوو و ئێستاکە دوژمنەکە دوورە دەستەو ئەم باسانەی بە مێشکدا دێ. لەگەڵ ئەمەی دانی پاشنیوەڕۆ حاڵی باشتر بوو و فرمانی بە ژەنەراڵ کانیۆدا تا دەوڵەت زۆرتر بە بارو وەزعی ئەم فەرەنسیە بەد بەختە ڕابگا.

زۆربەی ئەفسەران بەر لە نزیکبوونەوەیان لە دەریا ورەیەکی تازەو شادیان پەیداکردبوو. جارێك یارمەتی سەوڵ لێدەرەکانیاندەدا و جارێکیش بە سەرە نێزەکانیان ماسیان ڕاودەکرد و لەبەر ئەوەی هێزوتوانایەکی زۆریان بەکاردەهێنا ، لەهەر کارێکدا گرفتێکیان بۆ خۆیان دروست دەکرد. خۆزەلارانسیو سیلبا لەکۆنە ترسێکی ئەگەری کوێری بەهۆی گلێنەیەوە ،وەك نەخۆشییەك کە لە چەند کەسێکی خێزانی دایکی روویدابوو، لە باتیان بەرۆژ دەنوست و شەوان کاری دەکرد، لەتاریکی و تەمدا ڕاستدەبۆوە و کاریدەکرد تا فێربێ نابینایییەکی بەکەڵك بێ.

ژەنەراڵ لە کاتەکانی بێخەویدا زۆرجاران دەنگی وەرگێڕ و داگێڕانی ئامرازان، بڕینەوەی ئەو دارانەی کە خۆی کۆیکردبوونەوە و بارکردنی شەپکەدارانی گوێ لێببوو، خۆزەلارنسیو هەوڵیدەدا دەنگی چەکوچەکەی خەڵکی دیکە لەخەو نەکا، ڕۆژی دوایی زەحمەتبوو باوەڕبکرێ کە کاری دەستی لەو جۆرە لەتاریکیدا کرابێ، شەوێك لەبەندەری ئال هێندەی نەمابوو

پاسەوانێك تەقەی لێبکا، چونکە وایزانیبوو کەسێك دەیەوێ هێرشی بکاتە سەر ئەو نوێن و جێگایەی کە ژەنەراڵ تێیدا نووستبوو. بەختی ئەو یارببوو کە پاسەوانەکە توانیبووی سەروەخت بیناسێتەوە بەلەمەکان بەخێرایی زۆرترو زۆرتر دەچونە پێشەوە تەنیا ترسێکی کە هاتە پێشەوە بەهۆی کەشتیەکی هەڵمی سەر بە دەریاوان ئەلبرس بوو کە زۆر بە تیژی بە پێچەوانەی ئەواندا تێپەڕی و ئەو شەپۆلانەی دروستیکرد، هەموو بەلەمۆکەکانی خستە مەترسیەوەو قەیاغەکەی خواردەمەنی و پێداویستی خۆراکیان لێبارکردبوو قلْپ بۆوە. لەسەر کەشتیەکەدا بەپیتی درشت ووشەی ئازادیخواز نووسرابوو.

ژەنەراڵ بەدەم بیرکردنەوەوە هەر تەماشایکرد تا کەشتیەکەدوورکەوتەوەو ترسی نەما، لەژێر لێوەوە بەخۆیگوت: "ئازادیبەخش: لە پاش ئەوە وەك کەسێك کە لاپەڕەیەکی دیکەی کتێبێك دەستپێبکا وتی:

"بەو خەیاڵەوە کە منم."

ئەو شەوە لەناو جێگاکەی درێژببوو و بە ئاگابوو. گوێی بۆ قسەو باسی نێوان سەوڵ لێدەرەکان شلکردبوو، کەسەوڵ لێدەرەکان هەوڵیان دەدا دەنگەکانی ناو جەنگەڵ وەك مەیموون، توتی، مار بناسنەوە، لەپڕ یەکێکیان بەبێ ئەوەی پەیوەندی بە باسەکەوە هەبێ گوتی خانەوادەی کەمپێچۆ، تەواوی کەوچك و چەنگاڵە ئینگلیزی و قاپ و فەخفوریە کریستال و دەسماڵە هۆڵەندیەکانیان لە ترسی نەخۆشی سیل لەناو حەوشەی ماڵەکەیان لە چاڵناوە.

بۆ یەکەمینجار بوو کە ژەنەراڵ ئەم جۆرە تاریفکردنەی لە خەڵکی عەوام دەبیست ئەگەر چی بەدرێژایی ئاوەرۆی رووبارەکە ئەمە شتێکی ئاسایی بوو و بەخێرایی لە هەموو ناوچەکانی دەوروبەریشدا ئەم تاریفکردنە کارێکی ئاسایی بوو.

خۆزەپالاسیۆس سەرنجی دا کە ئەو لەو قسە زۆر سەری سوڕماوە دوای بیرکردنەوەیەکی دوورودرێژ وتی: "من بە کەوچك و چەنگاڵی خۆم نانمخوارد."رۆژی دواتر لە بەندەری شاری تەنریف لەنگەریانگرت تا بتوانن هەندێ پێداویستی خواردەمەنی ئامادەبکەن. ژەنەراڵ لەناو بەلەمەکەدا ماوە ، بەڵام فرمانیدا بە ویلْسۆن کە بەدوای بازرگانێکی فەرەنساییدا بەناوی لنوا یان لنوار کە کچێکی بیست ساڵەی بەناوی ئەنیتای هەیە بگەڕێ وەختێك کە گەڕان و سوڕان بەدوای تەنریف هیچی لێ شین نەبوو، ژەنەراڵ فرمانیدا کە گوندەکانی دەوروبەر یەعنی کوئائیتارۆ سالامینا و ئال پێنیۆنیشی بەدوادا بگەڕێن. لە دواییدا باوەڕی هات کە ئەمە لە ئەفسانەیەك بەو لاوە شتێکی دیکە نەبووە و هیچ بنەچەو بنچینەیەکی نییە.

ئەو حەزەی ئەو جێگای سەرنج و پێزانین بوو، لەبەرئەوە سالآنێکی دوورودرێژ بوو کە دەنگۆی ئەڤینی ناقانوونی و ئاگرینی ئەو لەگەڵ ئانیتالنوا لە کاراکاسەوە تالیما بەدوای ژەنەراڵەوە بوو. ئەم دەنگۆیە ئەوی نیگەرانکردبوو بەڵام بۆ بەدرۆ خستنەوەی هیچ کارێکی لە دەست نەدەهات، هەروەها سەرهەنگ خوان بیسنتەی بولیواری باوکیشی چەندین جار دەستدرێژی بۆ ژنان و کچۆڵەی هێشتا منداڵ و ناپێگەیشتوو کردبوو و پەیوەندی لەگەڵ زۆر ژنی دیکە هەببوو زۆر جاران ناچار ببوو لەبەردەمی کەشیشی شاری سنمائتۆ ئامادەبێ. جگە لەمانەش، ژەنەراڵ لەسەفەرەکانی بۆ گوندو شارەکانی کەنار رووبارەکە تەنیاو دوو رۆژ لە تەنریف[1] مابۆوەو دەرفەتی بۆ بەدەرخستنی عشقێکی ئاورینی ئەوهانەبوو. لەگەڵ هەموو ئەمانە، ئەم ئەفسانە ئەوەندە تەشەنەیکردبوو کە لە قەبرستانی تەنریفدا قەبرێکیان بەناوی خاتوو ئانیتالنوا هەڵنابوو کە تا ئاخرو ئۆخری ئەم سەدەش ببووە جێنەزەرگەی عاشقان.

هاوڕێگاکانی ژەنەراڵ بۆ گەپ و گاڵتەی دۆستانەو بەڕاستییەکانی نێوان خۆیان لەبارەی بازوی براوی خۆزە ماریا کارنیۆوە. کە هێشتاش هەستی بەنا ئارامی دەکرد، زۆر هەنجەتیان هەبوو. بزووتنەوەی دەستی گرتنی شتومەکان بەدەستەکانی و دەردو ژانی نێو ئەو ئێسقانانەی کە هەر نەیمابوو، هەست پێدەکرد.

هێشتا سوعبەتچیەتی و قسە قوڕەکانی خۆی لەدەستنەدابوو و پێکەنینی بەمکارانە دەهات، بەڵام خۆی وەڵامدانەوەی پرسیارەکان لە کاتی نووستندا ئەوی زۆر نیگەرانکردبوو، لە خەودا لەگەڵ خۆی دەگوت و چشتی وایدەگوت کە بە دڵنیاییەوە لە بێداریدا لەم جۆرە قسانە دەسڵەمیەوە جارێکیشیان تۆمەتێکیان دایە پاڵ کە لە خەونیدا خیانەتێکی سەربازیکردوە لەو شەوەدا لە کاتێك کە خۆزەپالاسیۆس لە کەناری جێگاکەی ئەودا رادەبورد دەنگی کارنیۆی لەسەر عەرەشەکە گوێ لێبوو دەیگوت: "حەوت هەزار و هەشتسەدو هەشتاو دوو."

خۆزەپالاسیۆس پرسی: "لەبارەی چییەوە قسەدەکەی ؟"

کارنیۆ وەڵامیداوە: "لە بارەی ئەستێرانەوە."

ژەنەراڵ دڵنیابوو کە کارنیۆ لەخەوێدا قسە لەگەڵ خۆی دەکا. لەناو نوێنەکەی هەڵساو بە قونەوە دانیشت و لە پەنجەرەوە تەماشای ئاسمانی کرد. ئاسمان دەدرەوشاوەو جێگای یەك ئەستێرەی دیکەی تێدا نەدەبۆوە.

---

١تەنریف: شارێکی بچوکی کۆلۆمبیا.

ژەنەراڵ گوتی: "بەلانی کەمەوە دە جاران زیاترن."

کارنیۆ گوتی: "هەر هەندن کە گوتم لەگەڵ دوو دانەی دیکەش کە لە کاتی ژماردنیاندا بەبەرچامدا تێپەڕین."

لەو دەمەدا ژەنەراڵ لەناو نوێنەکەی هاتە دەرێ و ئەوی دیت لەسەر عەرەشەی بەلەمەکە رووبەڕووی ئاسمان درێژببوو و لە هەموو وەختێك بە ئاگاترە. بە بازووی بڕاوی ئەستێرەکانی دەژمارد و لەشە پڕ لە برینەکەی لە ژێر تریفەی مانگدا دەدیترا. هەر بەو حاڵەتەوە بوو کە ئەویان لە جەنگی سەریتۆس بلنکۆس لە ڤەنزویلا دیتبۆوە، شەلاڵی خوێن بە برینێکی زۆرەوە، چواردە برینی شمشێری بەلەشەوە بوو کە چەند برینێکیان بووە هۆی ئەوەی دەستی ببڕنەوە. ئەویان هەر بەو بارەوە لە هەمان شوێن بەجێهێشت. لەبەرئەوەی وایاندەزانی کە مردووە. دواتریش لە جەنگەکانی دیکە برینی دیکەشی تێبوو، بەڵام ورەی بەرنەداو هەموو کارەکانی بەدەستی چەپ زۆرباش ئەنجام دەدا وەك ئەوەبوو بەدەستی راستی ئەنجامیدابێ، بەتایبەتیش خەتێکی زۆر جوانی هەبوو.

کارنیۆ وتی: "ئەستێرەکان نەلە دەست مەرگ رادەکەن و نە لەناو دەچن، بەڵام ژمارەیان لە ژمارەی هەژدەساڵ لەوەو بەریان کەمتر بووتەوە."

ژەنەراڵ پرسی: "شێت بووی."

کارنیۆ وتی: "نا پیر بووم بەڵام نامەوێ باوەڕ بکەم."

ژەنەراڵ وەڵامیداوە: "من هەشت ساڵ لە تۆ پیرترم."

کارنیۆ وەڵامیداوە: "من بۆ هەر برینێك دوو ساڵ دادەنێم. لەبەرئەوە لە هەمووتان پیرترم."

ژەنەراڵ گوتی: "بەو شێوە بێ خۆزەلارنسیۆ لە هەمووان پیرترە. بە خۆی و شەش برینی گوللەوە و حەوت برینی سەرە نێزەو دوو برینی تیرو کەوان."

کارنیۆ هەلی بەکارهێناو بەدەنگێکی توانجاوی ژەهراویەوە وەڵامیداوە: " لە هەمووان گەنجتر ئێوەن. بەبێ ئەوەی یەك جێتان داروشابێ."

ژەنەراڵ یەکەمجاری نەبوو کە ئەم راستیەی بەناوی گاڵتە یان توانجەوە دەبیست: بەڵام لەلەرەی دەنگی کارنیۆ وەکە زۆرجاران دۆستایەتیەکەی تاقیکردبۆوە، ناڕەحەت نەبوو. لە تەنیشتی دانیشت و بە تەماشاکردنی تریسکانەوەی ئەستێرەکانی ناو ئاوی رووبارەکەوە خەریك بوون. کاتێك دوای بێدەنگییەکی درێژ کە کانیۆ سەری قسانیکردەوە ئەو لە خەوێکی قووڵداڕاچووبوو.

له خەودا ووتی: "من ناتوانم قبوولّی ئەوە بکەم کە ژیانمان بەم سەفەرە کۆتایی بێت."

ژەنەرالّ درێژەی بە قسەکانیدا: "ژیان تەنیا بە مردن کۆتایی پێنایە، بەلّکە رێگای دیکەش هەن کە هەندێك لەوانە رەنگە زۆر باشترو بەرێزانەتربن."

کارنیۆ قبوولّی نەدەکرد. گوتی: "دەبێ کارێك بکەین. هەتا ئەگەر حەمامکردنێکیش بێ بە کاریاکیتۆ[1]. وە ئەمەش نەگ تەنیا هەر بۆ خۆمان بەلّکە بۆ هەموو سوپای ئازادیخواز."

ژەنەرالّ لە دووەمین سەفەری بۆ پاریس هێشتا لە حەمامدا لەمەڕ کاریاکیتۆ کە لە وولأتەکەیدا بۆ دەرکردنی بەدبەختی و ناوچەوانڕەشی بەکاردەهات. هیچی گوێ لێنەببوو.

لەو سەردەمەدا ئەم دکتۆر ئائیمە بنلپند، هاوکاری هومبولت بوو لەبارەی ترسی ئەم گیایە ژەنەرالّی ئاگادارکردەوە هەر لەو سەردەمەدا لەگەلّ قازیەکیشدا ئاشنایەتی پەیداکرد کە گەنجێتی خۆی لە کاراکاس بەسەربردبوو و ردێنە جوانەکەی بەکاریاکیتو وەنەوەشەیی کردبوو. ئەوەیان پێکەنینی بە هەموو ئەفسانەیەك دەهات و هەر شتێك کە بە پێچەوانەی مەنتیقی مامۆستاکەی سیمۆن رودریکز بوو گالّتەی پێدەهات. ئەو کات تەمەنی بیست سالّ بوو و تازە ژنەکەی لە دەستدابوو. بە هاتنە سەرکاری ناپلیۆن بۆناپارت زۆر دلّخۆشبوو و ئەو لاپەڕانەی کە لە کتێبەکانی ئەمیل و نوول هلویز کارەکانی رۆسۆ حەزیلێدەکردن، هەر بە لەبەر دەیخۆێندەوە. بەهاوڕێیەتی مامۆستاکەی خۆی وەبگرە هەموو کون و قوژبنی ئەورووپای کردبوو. لەیەکێك لەو تەپۆلکانەی دەیروانیە سەر رۆما. سیمۆن رودریکز یەکێك لە پێشبینەکانی خۆی لەسەر ئەمریکا پێوتبوو:

"کارێکی کە دەبێ بەو ئیسپانیە لەعنەتیانەبکرێ ئەمەیە کە دەبێ بە شەق و پێلەقە وەدەرنرێن و سوێندیش دەخۆم کە ئەم کارە دەکەم."

بیست و چوار سالّ پاشتر، بێئومێدو شکست خواردو لە خۆی دەپرسی: "ئایا وا باشتر نییە کە هەر هەموو جاترە و گیاو گۆلّ و نارنجە تالّەکانی کە خۆزەپالاسیۆس لە حەمامێکی ئارامبەخشی ئەوی دەرێژتن تورِ هەلّدەی و پەند لە کارنیۆ وەرگرین و هەموو سوپا بەسەرکەوتنە بێ سەمەرەکانی و هەلّە مێژووییەکانی و تەواوی وولأت لە ئۆقیانوسێك لە کاریاکیتۆدا بشۆیەوە؟!.

---

١ کاریاکیتۆ : گیایەکە لە خانەوادەی شاپەسند هی ئەمریکای خواروو ، گولّ بنەوشەیی و تۆخ و بۆندارە

شەوێکی هێمن و بێدەنگ بوو، تا ئەگەر دوو کەس لە دوور قسەیانکردبا دەبیسترا. کریستۆف کۆلۆمبزیش چرکەساتی وای لە ژیانیدا بەسەرهاتوەو لە پەڕاوی یاداشتەکانیدا نووسیبووی:

"بەدرێژایی شەوەکە فڕکە فرکی مەلەکانم هەست پیێ دەکرد."لە کۆتاییدا دوای شەست و نۆ رۆژ بەلەمەوانی و هاژۆتنی گەیشتنە نزیك وشکانی.

ژەنەراڵیش هەستی بەمەکرد. کارنیۆ نوستبوو لە دەوروبەری سعات هەشتدا بوو کە چەند مەلێك بەرچاوکەوتن. سعاتێك دواتر ژمارەی مەلەکان ئەوەندە زۆر بوون کە لەبەر فڕکەی باڵیان تەوژمی بایەکی بەهێز هەڵیدەکرد. دوای چرکەساتێك چەند ماسیەکی گەورە بە ژێر قەیاغەکەیاندا تێپەڕین. بۆی گەنیوی دەریای باکوور دەهاتەبەر کونە لووتان.

بۆ باوەڕکردن پێویستی بە دیتنی هیچ شتێك نەدەکرد، هەموویان هەستێکی عەجایبی ئازادیان هەبوو. ژەنەراڵ ئاهێکی هەڵکێشاو گوتی: "خوای گەورە وا خەریکە دەگەینەجیێ."هەر ئەوهاش بوو. دەریا دەست پیێ دەکردو لەو بەریش جیهانێکی دیکە بوو.

## (٥)

بەم پێیە جارێکی دیکە خۆی لە توورباکۆ دیتەوە. لە هەمان خانووی پڕ لە ژووری تاریك و تاق و بنتاقی چەماوەو گەورەگەورە، پەنجەرەیەکی زۆری کە دەیانڕوانیە سەر گۆڕەپانی دەستفرۆشان و حەوشەیەکی فەراحی کە تارمایی دۆن ئەنتۆنیۆ کاباجر وای گۆنگورای قەشەو فەرمانڕەوای کۆنی نوئباگراناداا کە شەوانە بۆ رزگاربوون لە بیروغایلە و بەدکاریەکانی خۆی لەنێو دار نارنجەکاندا پیاسەی دەکرد، دەدیترا، لەوێ تۆباکو لە رووی ئاستی دەریا بەرزتر بوو، بە پێچەوانەی ئاوو هەوای ئاسایی کەنارەکان ئاووهەوایەکی فێنك و خۆشی هەبوو. لە ڕۆخ رووبارەکان درەختی گەڵا بۆندار ڕوابوون و سەربازان لە ژێر سێبەری ئەو دارانە دەحەوانەوە.

دوو شەو پێشتر گەیشتبوونە بارانکانوئبا و ناچار بوون کە لە عەمباری بۆن خنك و گەنیو لەنێو گونیە برنج و پێستەی خۆشنەکراودا بنوون، لەبەرئەوەی جێگایەکیان بۆ ئامادەنەکرابوو وەك ئەوەی چەند قاترێکی کە رایانسپاردبوو بەم پێیە ژەنەراڵ ماندوو مردوو گەیشتە توورباکۆ.

زۆری حەزدەکرد چاوێك لەسەریەکدانێ، بەڵام هەیهو خەو لە کوێ بوو. هێشتا بارەکانیان نەخستبوو کە هەواڵی گەیشتنیان بە هەموو کون و کاژێرێکدا بڵاوبۆوە و تا هەواڵەکە گەیشتبووە کارتاخناد ئیندیاسیش کە تەنیا شەش لگۆش لەوێ دووربوو، لەو شوێنەدا ژەنەراڵ ماریا نومونتیجای فەرمانداری سەربازی ناوچەکە نیازی هەبوو رۆژی دواترێ ئاهەنگێکی جەماوەری بۆ هەمووان رێکبخا. بەڵام ژەنەراڵ حەوسەڵەی ئەم هەموو ئاهەنگە یەك بەدوای یەکانەی نەبوو. لەگەڵ کەسانێکی کە لە رۆخی جادە لەژێر ریژنەی باراندا هاتبوونە پێشوازی وەك دۆستی بووبن سڵاو ئەحواڵپرسی لێکردن ، بەڵام راشکاوانە داوایلێکردن کە لێیگەڕێن کەمێك پشوبدا لە راستیدا حاڵی لەوەی کە بە چاو دەدیترا زۆر خراپتر بوو، بەڵام هەوڵیدەدا ئەوە بشێرێتەوە. هاوڕێگاکانیشی شایەدی ئەم بارو خراپتر بوونەی حاڵی بوون. ئیدی ئۆقرەی لەبەربڕابوو. رەنگی پێستی لەسەوزێکی کاڵ بۆ زەردێکی تاریك گۆڕابوو. تای لێبوو و ژانە

سەریشی تا دەهات توندتر و بەردەوام دەبوو. کەشیش پێشنیازی کرد پزیشکێك ببینیّ، بەڵام ئەو نەیهێشت و وتی: "ئەگەر گوێم دابا دکتۆرەکانم چەندین ساڵ لەمەوبەر لە ژێر خاك بووم."ئامادەبوو کە بۆ رۆژی دوایی بەرەو کارتاختادبڕواو ، بەڵام بەیانی هەمانرۆژ ئاگادارکرا کە تاکەکەشتیەکیش بەرەو ئەوروپا ناڕواو مۆڵەتی رۆیشتنەکەیشی لەگەڵ دوا پۆستدا نەگەیشتووە، بەمجۆرە بڕیاریدا سیّ رۆژان لەویّ ئیسراحەت بکا. ئەفسەران خۆشیان لەم بڕیارە لهات، لەلایەك لەبەر حاڵ و باری ژەنەراڵ خۆی و لەلایەکی دیکەوە لەبەرئەوە بوو کە هەواڵ و دەنگ و باسی باری ناخۆشی ڤەنزویلایان پێگەیشتبوو.

بەڵام دیسانەوە نەیتوانی رێگا لە خەڵکی بگریّ و تا ئەو وەختەی کە تۆنتەرەقەو فشفشە ئاگریەکانیان تەواوبوو تەق و تۆق هەر درێژەی کێشا. بە پێچەوانەی ئارەزووی ئەو دەستەیەك لە گۆرانبێژان لەو دەروبەرە تا شەو درەنگانیّ بە گۆرانی گوتن و مۆسیقا لێدانەوە خەریك بوون. سەرەڕای ئەمە لە یەکێك لە گوندەکانی نزیکەوە کەناوی ماریال ئاباخۆ بوو، ژمارەیەك لە ژن و پیاوی رەشپێستیان بۆ نومایشێك بیّ حزووری ئەواهێنابوو، هەر هەموویان جلوبەرگی دەربارەی سەدەی شانزیەمی ئەوروپایان پۆشیبوو و بەجۆرێکی گاڵتە ئامێزەوە لاسایی سەمایەکانی خانەواندانی ئیسپانیان دەکردەوە.

ئەم کارەیان لەبەرئەوە بوو کە ژەنەراڵ لەسەفەری پێشوویدا بەجۆرێك چێژی لەم نومایشە وەرگرتبوو کە زۆرجاران داوای ئەوی کردبوو ئەوسەمایەبکەنەوە:

بەڵام ئەمجارەیان تەماشایەکیشی نەکردن. ژەنەڕاڵ گوتی: "ئەو وڵاغانە لەم ناوە دورخەنەوە."

کاباجرو ئای گونگورای فەرمانڕەوا کە ئەم خانووەی دروستکردبوو بەر لەسی ساڵان تێیدا دەژیا. بەهۆی دەنگدانەوەی دەنگێکی ترسناکەوە کە لە ژۆرەکانیدا دەبیسترا. ئەم خانووەی بە تەلسماوی دەزانی ژەنەراڵ نەچووە ئەو ژوورەی کە سەفەری پێشوی تێیدا دەنووست. چونکە هەموو شەوێك لەم ژوورە خەونی جرِنی و فرِنی دەدیت. لە خەونێیدا دەیدیت کە کچێکی گەندەمولیهاتوو داوێکی سوور لە ملی ئەو دەکاو ئەوەندەی رادەکێشی تا بێداری بکاتەوە و تا بەری بەیانی هەر جارێك خەوی لێدەکەوت خەونی پێوە دەدیتەوە. لەبەر ئەمەبوو فرمانیدا جۆلانەکەی لەنێوان دوو ئەستوندەگەی ناو سالۆنەکە بۆ هەڵواسن و بەبیّ ئەوەی خەو بیباتەوە یەکەمجار کەمێك راکشا. باران وەك کوندەی سەر بەرەو ژێر دایکردبوو ڕەوە منداڵێك لە پەنجەرەوە سەیری نووستنی ژەنەراڵیان دەکرد، یەکێکیان بە دەنگێکی سەیرەوە لە خەوی

راپەراندا: بولیوار.. بولیوار. ژەنەراڵ لەنێوان تا و ژانەسەردا چاوی بە دوای دەنگەکەدا گێڕا. مندالّە لێپرسی: "منت خۆشدەوێ."

ژەنەراڵ بە زەردەخەنەیەکی لەرزۆکەوە بە ئا وەڵامیداوە. بەڵام دوای کەمۆکەیەك فرمانیدا منداڵەکان لەو ئاقارە دوورخەنەوە، و پەنجەرەکان گاڵەدەن و مریشك و کەلەشێرێکی کە لەو ماڵە دەخولانەوە و گارەگاریان بوو، لەقەفەسان قایمکەنەوە. ئەوجا دووبارە نووستەوە. هەر کە بێدار بۆوە هێشتاش باران هەر دەباری و خۆزەپالاسێوس بەدەم دادانەوەی پەشمەکەوە لە دەوری جۆلانەکەی ژەنەراڵەوە بوو.

ژەنەراڵ وتی: "خەونم بەوەوە دەدیت منداڵێك لەو دیوی پەنجەرەکانەوە پرسیاری سەیر سەیری لێدەکردم."

قبووڵی کرد فنجانێك جۆشاو بخواتەوە. لەدوای ٢٤ سعاتدا یەکەمین فنجانی بوو ، بەڵام نەیتوانی تەواویبکا لەتاو لاوازی و بێهێزی خۆی دووبارە لەناو جۆلانەکەی دانیشتەوەو هەر تەماشای ریزێك شەمشەمەکوێرەی دەکرد کە خۆیان بە کاریتەکانی بنمیچەوە هەڵواسیبوو کەوتە بیرکردنەوەیەکی قووڵ. سەرەنجام ئاهێکی هەڵکێشاو گوتی: "تەنیا بۆ ژێر خاك باشم."لەگەڵ ئەفسەرو سەربازە ئاساییەکانی هاورێگای ئەوەندە گیانی بە گیانی بوو کە ئەوان بە درێژایی سەفەری ناو رووبارەکەیان هەموو جۆرە قسەو باسێکیان لەگەڵدا دەهێنا نێوانەوە، لەم قسانەشدا ئەوەیان بۆ ئاشکراکرد کە تا توورباکۆ چواریەکی خەرجی سەفەرەکەیان خواردوە. هێشتا دیارنەبوو کە ئایا لە ناو خەزێنەی دەوڵەتی کاتیدا پارەو پولێك بۆ خەرجی ئەم سەفەرە هەیە یان دەکرێ لە کەسێك قەرز بکرێ یان نا. بۆ ژیانی خۆی لە ئەورووپا زۆری حساب بۆ ئینگلیزەکان دەکرد، چونکە زۆری یارمەتیدابوون و هەمیشە دەیگوت کە ئینگلیزەکان منیان خۆشدەوێ.

بۆ ژیانێکی خۆشی بۆ خۆی و بەلانی کەمەوە هەبوونی خزمەتکارو پیاو و نۆکەر لە خەونی فرۆشتنی کانزاکانی ئاروئادا دەژیا. لەگەڵ ئەم لێکدانەوانە ئەگەر بەراستی مەبەستی سەفەربوو بۆ ئەورووپا، دەبوو بیر لە شتێکی بنەڕەتی بکاتەوە. چونکە ئەو برە پارەی کە پێیان مابوو نەیدەگەیاندە هیچ جێگایەك. لەم بارەدا تەنیا شتێکی کە کەڵکی ئەوی دەگرت چۆنێتی خەیالانە بێکۆتاییەکانی بوو . بەڵام لە هەمان کاتدا کە لە بەرتای گەرم و ژانەسەر لە هەموو شوێنێکەوە کرمی شەوگەڕو جانەوەری دیکەی دەدیت، توانی بەسەر خەو و نەخۆشیدا زاڵ بێ و سێ نامە بۆ فرناندۆ بنووسێ.

نامەی یەکەم وەڵامی نامەیەکی سوکرەی دەریا سالار بوو کە تێیدا بە پێچەوانەی خۆی هەمیشەیی باسی نەخۆشی و نارِحەتیەکانی نەکرد. نامەی دووەم بۆ خوان دیٚ دیۆس ئامادۆری خەزنە داری کارتاخنادبوو. داوای لە دۆن ئامادۆ کردبوو کە هەشت هەزار پەز و لە خەزێنەی دەوڵەت بەو ببەخشن، لە نامەکەدا نوسیبووی: "لە هەژاریدا دەژیم و بۆ سەفەر پێویستیم بەو پارەیە."ئەم داواکاریە قبووڵ کرا، چونکە بەر لە چوار رۆژان وەڵامەکە گەیشت و فرناندۆ بۆ پەیداکردنی پارە چووە کارتاخناد. نامەی سێیەم بۆ بالیۆزی کۆلۆمبیا بوو لە لەندەن. کە شاعیری ناسراو خۆزە فرناندۆ مادرید بوو. کە تێیدا داوایلێکردبوو دانەوەی دوو سەفتەی یەکێکیان بە ناو سێرِ رابرت ویلسۆن و ئەویدیکەشی بەناوی مامۆستای ئینگلیزی جۆرج لانگاستر، کە بیست هەزار پزوی بەناوی دروستکردنی سیستەمی گۆرِینەوەی فەرهەنگیەوە قەرزاربوون، قبووڵ بکا.

لە نامەکەدا نووسرابوو: "ئابرِومەندی من بەم مەسەلەوە بەستراوە."ژەنەراڵ لەسەر ئەو باوەرِەدابوو کە تا ئەو حەلەی داواکاریە قانوونیەکانی کۆتاییان پێدیٚ و دەتوانیٚ کانزاکانی بفرۆشیٚ. بەڵام ئەم نامە کەڵکی نەگرت: لەبەرئەوە هەر کە گەیشتە لەندەن، فرناندز مادرید، قوربانی حازریان ببوو. خۆزەپالاسیۆس ئاماژەی بۆ ئەفسەرو سەربازەکانی کرد، کە لە ناو سالۆنەکەدا بە جەنجاڵی و هات و هاوارەوە یاری کاغەزیان دەکرد، کە بێدەنگبن. بەڵام ئەوان تا کلێسای ناوچەکە زەنگی سعات پێنجی لێدا، لەسەر پسکەپسکو هات وهاواری خۆیان بەردەوامبوون. کەمێك دواتر دەنگی تەپڵ و فلوتی تیپی مۆسیقاش خامۆشبۆوە شنەبایەکی لە دەریاوە هەڵی دەکرد هەورێکی رەشی کە دوای باران دووبارە تێکدەئەنگژان لەگەڵ خۆی رِادا و مانگی پرِ لە نێو دار نارنجەکانی حەوشێدا بەدەرکەوت.

خۆزەپالاسیۆس بۆ یەك چرکەش لە ژەنەراڵ بێئاگا نەبوو. ژەنەراڵ لە پاشنیوەرِۆوە تایەکی گەرمی لێبوو و خۆزەپالاسیۆس وەك هەمیشە جۆشاوێکی ئامادەکردبوو شتێکیشی بۆ رِەوانی ئامادەکردبوو و چاوەرِێی ئەوەبوو کەسێکی لەو بەدەسەڵاتتر پێشنیازی هاتنی پزیشك بۆ ژەنەراڵ بکا. بەڵام کەس ئەمکارەی نەکرد، ژەنەراڵ نزیکی بەیانی بە زەحمەت سعاتێك نوست.

ئەو رۆژە ژەنەراڵ ماریا مونتیجا و دەستەیەك لە دۆستەکانی لەکارتاخناد بۆ دیدەنی ئەو چوون. لەنێو دەستەکەیدا سیٚ پیاوی نازناو خوئان و سەر بە حیزبی بۆلیوار یان لەناودابوو. خوان گارسیا دلریۆ، خوان دفرانسیسکۆ مارتین و خوان ددیوس ئامادۆر، هەر سیٚ زەلام لە بەرانبەر ئەو پەیکەرە بارێك و لاوازە کە بەهەزار حاڵ لەناو جۆلانەکەیدا هاتەدەریٚ و هەناسەی

تەواوی بۆ لەباوشگرتن و سەلامکردن لە هەمووان.. لەبەردانەبوو، سەریان سوڕما. ئەویان لە کۆنگرەی ئەدمیرایلە دیتبوو و هیچ باوەڕیان نەدەکرد کە لەم ماوە کورتەدا بەم حاڵ و ڕۆژە گەیشتبێ. ئێسکەکانی دەرپەڕیبوون و نەیدەتوانی چاوەکانی لە جێگایەك ببڕێ.. دەبووایە ئاگای لە بۆنی ناخۆش و گەرمی دەمی خۆیبێ لەبەرئەوە هەوڵێدەدا بە پچڕ پچڕی و لاونیو قسەبکا. بەڵام ئەو شتەی زیاتر لە هەموو شتێك ئەوانی سەرسام کرد، ئەمەبوو کە بالآشی کورتتر ببۆوە. بەرادیەك وا دەهاتە بەرچاوی ژەنەراڵ مۆنتیجا کە ئەوی لە باوەشێ گرتبوو، کە ژەنەراڵ تەنیا دەگاتە ناو قەدی.

لەو دەمەدا کێشی چل کیلۆ بوو و کاتی مردنی پێنج کیلۆی کەمکردبوو. بەژن و باڵای ئەو کە بە رەسمی تۆمارکرابوو. مەترێك و شێست و پێنج سانتیمەتر بوو، بەڵام بەڵگەنامە و راپۆرتی پزیشکەکان شتێکی دیکەی نیشاندەدا و لەسەر تەختەی تەشریحکردنیشدا چوار سانتیمەترکەمتر بوو. دەست و قاچەکانی لەچاو لەشی زۆر وردیلە بوون. خۆزەپالاسێوس سەرنجی دابوو کە پانتۆڵەکانی تا سەر سینگی هەڵدەکێشا و سەردەستی کراسەکانی هەڵدەکرد. ژەنەراڵ بەسەرسامی میوانەکانی زانی و ددانی پێدا ناکە پێڵاوە ژمارە سی و پێنجەکانی لە مانگی کانونی دووەمەوە بەپێی گەورەبوون. ژەنەراڵ مونتیجا کە لە ناخۆشترین کاتەکانیشدا مامۆستای سوعبەتبوو. سەرەنجام ئەم بارە خەماوییەی لە کورتی بڕیەوە و گوتی: " قوربان لە هەمووی گرنگتر ئەمەیە کە ئێوە لە ناوەوە بچووك نەبنەوە."

وەك هەموو جارێکی بۆ پاڵپشتی کردنی سوعبەتەکەی خۆی لە قاقای پێکەنینی دا، ژەنەراڵ وەڵامی پێکەنینەکەی بەزەردەخەنەیەکداوە و باسەکەی بۆ شتێکی دیکە گۆڕی. هەواکەی زۆر خۆشتر کردبوو و هەوای ئازادیش بۆ قسەکردن گونجاوتر بوو ، بەڵام ئەو بەباشتری زانی لە ناو سالۆنەکە وە لەناو جۆلانەکەی خۆیدا لەگەڵ میوانەکاندا قسەبکا.

بابەتی سەرەکی گوتوبێژەکەیان باری وڵات بوو لایەنگرانی بۆلیوار لە **کارتاخناء** قانوونی بنەڕەتی و دەوڵەتی نوێ قبوولناکەن و بەڵگەیان دەهێناوە کە لایەنگرانی سانتاندەر پاڵپەستۆی زۆریان لەسەر کۆنگرە هەبووە. لە باتیان نیزامیە وەفادارەکان بە فرمانی ژەنەراڵ خۆیان کەنار گرتبوو و پیاوە ئایینیەکانی پارێزگاریان لێدەکرد، هەڵیان بۆ کاردانەوە نەدیتبوو. ژەنەراڵ فرانسیسکۆ کارمونا فەرماندەی سەربازگەی کارتاخناد هێندەی نەمابوو ئاژاوەیەك بنێتەوە و هێشتاش هەر هەڕەشەی دەکرد.

ژەنەراڵ داوای لە مونتیجا کرد کە کارمۆنا هێور بکاتەوە. دوایی رووی لە هەمووان کرد بەبێ ئەوەی روو لە کەسێکی تایبەتی بکا بە رەقیەوە لەبارەی دەوڵەتی نوێوە قسەی کرد: "موسکرا لە ترسنۆکێکی گەمژەو کایسدۆ لە حەلواچیەك بترازێ شتێکی دیکە نین، لە ترسی منداڵە وردەکەی قوتابخانەی بارتولەمە بوون بە هەردوو هێلکەی گونی پاییون[١]."

ئەوەی کە دەیویست بە زاراوە کارییەکەی خۆی بیڵێ ئەمەبوو کە سەرۆك کۆمار مرۆڤێکی زۆر لاوازە و یاریدەدەری سەرۆك کۆمار زۆر هەڵپەرستە و با لەکوێوە هەڵکا روو لەوێدەکا.

ئەو حەلە شێوەی قسەکانی خۆی توندترکرد و گوتی هیچ جێی سەرسورمان نییە کە هەریەکەیان برای قەشەیەکن. لە جیاتی ئەوەی لەم کاتەدا کە ترسی شکستهێنان لە هەڵبژاردندا نەبوو. بەڵکە ترسی جەنگێکی ناوەخۆ بە تەحریکی سانتاندرۆ لە ئارادابوو. بەبۆچوونی ئەو قانوونی بنەڕەتی لەوەی چاوەڕواندەکرا باشتربوو. سەرۆك کۆماری هەڵبژێردراو لە پوپاجان لەبارەی پاراستنی هێمنی و یاساو یەکێتیەوە ووتاریدابوو ، بەڵام هێشتاکەش بەرەسمی نەیگوتبوو کە ئایا سەرۆك کۆماری قبوڵدەکا یان نا.

ژەنەراڵ گوتی: "چاوەڕوانە کە کاسیدۆ کارە بنەڕەتیەکان بکا."

مۆنتیجا گوتی: "دەبێ موسکرا ئێستا لە سانتافەبێ. دووشەممە لە (پویاجان) وە دەرکەوتوە."

ژەنەراڵ بەمەی نەدەزانی، بەڵام نەحەپەساو گوتی: "دەبینن لە کاتی کارەکەدا وەك یەك کدووەزەردە بایەکەی خاڵی دەبێ تا بەدەردی دەرگەوانیش نایە."بۆماوەیەکی درێژ وەستاو لەناو خەمەکانی خۆیدا رۆچوو. گوتی: "حەیف بوو سوکرە پیاوێکی گونجاو بوو."

"فرانسیسکۆ زەردەخەنەیەکی گرت و گوتی: "باشترینی ژەنەراڵەکان."

لەگەڵ ئەمەدا کە ژەنەراڵ هەموو هەوڵی خۆیدا بوو کە ئەم رستە نەکەوێتە دەم و زارانەوە بەڵام ئەلحان لەسەر هەموو دەم و زارێکدابوو.

مۆنتیجا بە گاڵتەوە گوتی: "رستەیەکی لەبیرنەکراوی ئوردانتا."

ژەنەراڵ گوێی بەم قسەنەداو لەسەر بارودۆخەکە و سیاسەتی ناوچەکە پرسیاریکرد، بەڵام مۆنتیجا دووبارە باسەکەی گۆری و گوتی: "ببەخشن قوربان، بەرێزتان لەمەڕ حورمەت و

---

١ پاییون : دەبێ مەبەست (پاپا) بێ وەرگێڕ.

بیرکردنەوەی من لەبارەی دەریا سالارەوە بەباشی ئاگادارن ، بەڵام ئەو پیاوی ئەم کارە نییە."
راستی مەبەستەکەی خۆی گوت: "کەسێك کە بە کەڵکی ئەمکارە بێ هەر ئێوەن."

ژەنەراڵ قسەکەی پێبڕی و وتی: "من ئیدی لە دەرەوە بوونم نییە."

بەدوای باسەکەدا چوو، شیکردەوە کە بەچ شێوەیەك دەریا سالار سوکرە لەبەرانبەر داخوازیەکانی ئەودا بۆ قبوولکردنی سەرۆکایەتی کۆماری کۆلۆمبیا بەرهەڵستی کردبوو پاشان گوتی: "ئەو گونجاوترین کەسە بۆ رزگارکردنمان لەم ئاژاوە، بەڵام مەخابن قبوولێنەکرد."بە بۆچوونی گارسیادلریۆ راستی مەسەلەکە ئەمەیە کە سوکرە بۆ دەسەلاَت نەخولَقاوە، بەڵام ژەنەراڵ ئەمەی بەڕاستی مەسەلەکە نەدەزانی و گوتی: "بەدرێژایی مێژووی مرۆڤایەتی سەلمێنراوە پێویستی باشترین مامۆستای مرۆڤە."

ژەنەراڵ چاکیدەزانی کە پەژیوانی هیچ کەڵکێك ناداو سوکرە ڕەگەڵ خێڵی عاشقان کەوتووە و چیدی لە زومرەی لایەنگرانی ئەودا نییە، ژەنەراڵ قسەکەی خۆی تەواوکردو وتی: "هێزو دەسەلاَت لە عیشقدا نوستووە ئەمە قسەی سوکرە خۆیەتی."لەهەمان زەمانی کە ژەنەراڵ لە توورباکۆ بە سوکرەی هەڵدەدا ئەو تەنیاو دڵتەنگ ، بەڵام لەوپەڕی سەلامەتی لەش و لار و دەروونیدا لە سانتافەوە بۆکیتۆبەڕێکەوت. بەرلەوەی لە سانتافە دەرچێتە دەرێ. چووە دیدەنی ژنە پێشبینکەرێکی ئاشنای لە گەڕەکی میسریەکان. ئەم ژنە زۆر جاران لە کاتی جەنگدا یارمەتی ئەویدا بوو لەو بارەشێواو ئاڵۆزەدا پێی گوتبوو کە ئێستا گونجاوترین رێگا بۆ ئەو رێگەی دەریایە. بە بۆچوونی گەورە دەریا سالار ئاگاکوجۆ بۆ گەیشتن بە عیشقەکەی رێگای دەریا زۆر لەسەرخۆ و دوورو درێژ بوو بە پێچەوانەی پێشبینی بەختگرەوە لەرێگای وشکانیەوە بەرەو عیشقەکەی خۆی جما.

ژەنەراڵ گەیشتە ئەنجام و گوتی: "بەمجۆرە هیچ کارێك ناکرێ ، بارەکەمان بە جۆرێکی ئەوتۆ خراپە کە باشترین دەوڵەتمان لەباری زۆر خراپدایە."

ژەنەراڵ هەموو لایەنگرەکانی ئەو ناوچەی بە باشی دەناسی. مرۆڤی بە کەسایەتی بوون ، بەڵام بۆ کاری سیاسی گرنگ زیاد لە خۆیان بوێریان نیشان نەدەداو هەتا جارێك لەگەڵ مۆنتیجا. لە دژی ژەنەراڵ هاوکاری یەکیان کردبوو. ژەنەراڵ وەك ئەوانیدیکە مووچەی نەدان و ئەوەندەی قسەبۆ کردن تا قەناعەتیان هات. بەم پێیە داوایلێکردن کە هەتا ئەگەر بە پێچەوانەی بەرژەوەندی خۆشیان بووبێ دەوڵەت بپارێزن. نموونە هێنانەوەکانی وەك هەمیشە قەناعەتهێن بوو و حاڵەتێکی پێشبینی و پێشگۆیانەی هەبوو: "سبەی رۆژێ من نەمێنم.

هەمان دەوڵەت سانتاندرا دەگەڕێنێتەوە و ئەو لەو پەڕی دەسەڵاتدا پاشماوەی بینین و خەونەکانم نابووت دەکا و ئەو وولاتە پان و بەرینە کە لە دوای ئەم هەموو شەڕو شۆڕو قوربانیەدا یەکێتی خۆی بەدەستهێناوە دووبارە لەتو پەت دەبێتەوە. جەنگ و پێکدادان دەستپێدەکاتەوە بەخراپە باسمەدەکرێ و جوێنم پێدەدرێ و تا ئەو کارانەی کە کردومن. لە یادی کەس نامێنن . بەڵام لەو کاتەدا گرنگترین پرسێك بۆ ئەو بەرگرتن بوو لە خوێنرێژی ژەنەراڵ گوتی: "ئاژاوەکان هەروەکو شەپۆلی دەریان یەك بەدوای یەکدا دێن و لەبەر ئەم هۆیە هەرگیز من دڵم پێخۆش نەبووە."لەبەرانبەری سەرسامی میوانەکانیدا بەجۆرە قسەکانی خۆی کۆتایی پێهێنا."من نازانم چیڕوویداوە کە بۆچی ئەم رۆژانە هەتا سەرزەنشتی کارێك دەکەین کەوا خۆمان لەگەڵ ئیسپانیادا کردومانە."ژەنەراڵ مونتیجا و دۆستەکانی هەستیانکرد کە ئیتر ئەمە کۆتایی چیرۆکەکەیە. بەرلەوەی کە ئەو جێیە جێبهێڵن، ژەنەراڵ مەدالیا زێڕیەکەی کە وێنەی خۆی لەسەر هەڵکەنرابوو، کردە دیاری بۆ ئەوان کاتێ کە بەرەو دەرگا دەڕۆیشتن، گارسیادلرێۆ بەدەنگێکی کزەوە وتی: "چرۆچاوی هەر لە مردوو دەچوو."

تا شەو داهات ژەنەراڵ هەر لەبیری ئەم رستەدابوو کە دیوارەکانی خانووەکە دەنگدانەوەیەکیان هەیەو دەنگدانەوەکەش دووبارە دەبۆوە لەگەڵ ئەمەشدا رۆژی دوایی ژەنەراڵ فرانسیسکۆ کارمونا لە باری شادی و باشی ژەنەراڵ زۆر حەپەسا، ئەوی لەناو ئەو جۆلانە تازەی دادیت کە ژنانی گوندی سن خسینتۆ بۆیان دروستکردبوو و ناوی ئەویشیان بەداوە دەزووی ئاوریشمی لەسەر چنیبوو، خۆزەپالاسیۆس جۆلانەکەی لە حەوشە لەنێوان دار نارنجەکاندا هەڵواسیبوو.

تازە حەمامی کردبوو، قژی بۆ دواوە داهێنابوو رۆبێکی شینی لەبەردابوو شادو زیت خۆیدەنواند. هەرکە لەناو جۆلانەکەی لاکەلەکەی گۆڕی، نامەیەکی بە برازاکەی بۆ سەرۆك کۆمار کایسدۆ نووسی، بەبۆچوونی ژەنەراڵ کارمونا بەو جۆرەی کە وتبوویان نەخۆش و مردۆخ نەبوو، و رەنگە لەبەرئەم هۆیە زۆر تووڕە بوو.

کارمۆنا لەوە ئەندام درشتر بوو کە بەبێ ڕاکێشانی سەرنجی کەسانی دیکە بتوانێ لە جێگایەکەوە بچێتە جێگایەکی دیکە ، بەڵام ژەنەراڵ خۆی وا پیشاندا کە ئەوی نەدیتوە و لە نووسینی نامە بۆ ئەو دەمشڕو پیسە ناپاکانە بەردەوامبوو، تەنیا لە دواییدا کە لێبۆوە رووی بۆ لای ئەو ژەنەراڵە تێکسمڕا و بە قەڵافەتە وەرگێڕا، کە لە بەرانبەری جۆلانەکەیدا بەبێ

چاوترووکاندن وەستابوو و بەبێ سڵاوکردن لێی پرسی: "ئایا ئێوەش وابیردەکەنەوە کە من لە تەحریکچیانی ئەم ئاژاوانەم؟"

ژەنەراڵ کرامۆنا کە چاوەڕێی چاوپێکەوتنێکی ناخۆشبوو، بەدەنگێکی بەرزو بیستراوەوە پرسی:

"قوربان ئەم ئەنجامگیریە لە کوێ و چون بەدەست هێناوە؟"

ژەنەراڵ وەڵامیداوە: "لەو جێگایەی کە ئەوان ئەم ئەنجامگیریەی لێوە بەدەست دەهێنن."

ژەنەراڵ تەواوێك پارچە رۆژنامەی بڕاوی کە تازە لە سانتافەوە پێگەیشتبوو نیشانی کارمۆنادا ، لەم رۆژنامانەدا ژەنەراڵیان بەوە تاوانبارکردبوو کە لە ژێرەوە سەربازەکانی بۆ ئاژاوەنانەوە هانداوە تا بتوانێ بە پێچەوانەی بڕیاری ئەنجوومەن بگەڕێتەوە دەسەڵات. ژەنەراڵ وتی: "قسەی پڕو پوچ و بێبنجو بنەوان، من لێرەکانە خەریکم هەموویان بۆ یەکێتی هاندەدەم، و ئەم لاوە بێئەزموونانە من بە ئاژاوەگێڕو ناپاکی تۆمەتبار دەکەن."

ژەنەراڵ کارمۆنا بە خوێندنەوەی پارچە رۆژنامەکان گەڵێ نائومێدبوو گوتی: "منیش نەك هەر ئەوهام بیردەکردەوە ، بەڵکە بەم بابەتەش زۆر خۆشحاڵ بووم."ژەنەراڵ وتی: "باوەڕ دەکەم."

ئەوی ئیزن نەدا: بەڵکە داوای لێ کرد تا تەواوبوونی نامەکە، کە جارێکی دیکەش تێیدا داخوازی مۆڵەتیکردبوو بۆ ئەوەی لە وڵات بچێتەدەرێ، سەبر بگرێ. کاتێك کە نامەکە تەواوبوو بەتەواوی ئارام ببۆوە. بەبێ کۆمەککردن لە جێگای خۆی بڵندبوو، دەستی ژەنەراڵ کارمۆنای گرت و ئەوی بۆ پرسیارلێکردن بۆ حەوشەکە بردە دەرێ دوای سێ رۆژان بارانبارین باران کژی دایە. تیشکی زێڕینی خۆر لە کەلێن چڵی دارنارنجەکاندا زەوی رووناك دەکردەوەو مەلەکان لەم چڵەوە بۆ ئەو چڵ دەفڕین و دەیانخوێند. ژەنەراڵ بۆ چرکەیەك هەموو هەستی خۆی لەمەلەکان راگرت و لە کرۆکی گیانیەوە هەست پێ دەکردن و وتی: "چەند شیرین و خۆشە کە لەم کاتەدا تەیرو توار دەخوێنن."لەدواییدا ئەمەی روونکردەوە کە بۆچی مەلەکانی ئەم دەڤەرە لە نیسان باشتر لە تەمموز دەخوێنن و لە هیکڕا و بێ پێشەکی هاتەوە سەر مەسەلەی دەوڵەت ماوەی دە دەقەی زیاتر نەخایاند تا توانی ژەنەراڵ کارمۆنا بێنێتە سەر ئەو رایەی کە دەوڵەتی نوێ قبوڵبکا. دوای تا ناو دەرگا بەرێیکردو ئەوساکە چۆوە ژووری نووستنەکەی بە خەتی خۆی نامەیەکی بۆ مانوێلا سێز نووسی، کە ئەو ئێستا ئازاری بەدەست دەوڵەتی نوێوە دەدیت.

فرناندا بریگا قاپێیك گەنمەشامی بۆ برد تا بەدەم نامە نووسینەوە بیخوا، بەڵام بەزەحمەت تەواوی کرد دوای نانخواردنی نیوەڕۆ وەختی سەرخەو شکاندنێ داوای لە فرناندۆ کرد کە کتێبی گیاناسی چینی کە شەوی پێشوو دەستیانپێکردبوو بێنێ و درێژە بە خوێندنەوەی بدا. دوای

چەند چرکەیەك خۆزەپالاسیۆس بە ئاو و جاترەوە بۆ حەمامی ژەنەراڵ هاتە ژووریّ و دیتی کە فرناندۆ لەسەر کورسی بەلاداهاتوەو خەوبردویەتیەوە و کتێبەکەشی کەوتۆتە سەر قاچەکانی. ژەنەراڵ کە لە ناو جۆلانەکەیدا بە ئاگابوو. ئاماژەی بۆ خۆزەپالاسیۆس کرد کە دەنگ نەکا، دوای دوو حەفتە یەکەمجار بوو کە ژەنەراڵ تای لێنەبیّ.

بەمجۆرە لە چاوەڕییّ پۆستدا بیستو نۆ رۆژی لە توورباکۆ راکێشا. پێشی ئەوە دووجاریدەکەش لە تۆرباکۆ بووە ، بەڵام جاری دووەم. کە بۆ رووبەڕووبوونەوەی پلان و نەخشە جیاخوازیەکانی سانتاندەر لە کاراکاسەوە بەرەو سانتافە دەگەڕاوە بەراستی پەی بە خاسیەتەکانی دەرمانی ئەو گوندە بردو لە باتی ئەوەی دوو رۆژان وەك پێشبینی دەکرا، بمێنێتەوە، دە رۆژان لەویّ چەقی و لە هەر دە رۆژەکەدا هەر ئاهەنگوشایی و لۆغان بوو. سەرەنجام پێشبڕکێیەکی گابازی کراو خودی ژەنەراڵیش کەوتە بەرانبەر گاییکی بچکۆلانە، بەڵام گاکە پارچە سوورەکەی گابازی لە دەستی ڕفاند و ژەنەراڵ هاوارێکی وایکرد کە سەرپاکی خەڵکەکە گەشکەگرتنی ئێستا لەو سەردانەی سێیەمیدا. رۆژانی رابردوو شایەدی چارەنووسی غەمگینی ئەو بوون. زۆربەی رۆژان باران دەباری و هەر دەباری و مووچەی نەدەدا و بەتاو دایدەکرد. ژیان لەوە چنگهێنانی هەواڵی نوێدا چڕ دەبۆوە.

شەوێك خۆزەپاسیۆس گوێی لە دەنگی ژەنەراڵ بوو کە لە بێداریدا دەیوت:

"خوا هەر بۆ خۆی دەزانیّ هەنووکە سوکرە لە چ عاردەکیە."

ژەنەراڵ مۆنتیجا ئەمجارە کە هاتە سەردانی ئەوی زۆر باشترو سەر حاڵتری لە رۆژی یەکەمدا دیت. لەمەش باشتر ئەوە بوو کە ژەنەراڵ کەم کەمە دێتەوە باری سەردەمی رابردوو بەتایبەتیش لەبەرئەوەی کە مۆنتیجا ئاگاداریکردبۆوە کە کارتاخنا هێشتا دەوڵەت و قانوونی بنەڕەتی نوێی بەرەسمی نەناسیوەو بڕوبیانووشی ئەمەیە کە یەکەمجار دەیەویّ بزانیّ ئایا خواکین موسکرا سەرۆکایەتی کۆمار قبوڵ دەکا یان نا.

ژەنەراڵ وتی: "ئەگەر پێش ئەم بابەتە هەموو شتێك قبووڵ بکا. متمانەو ناوێکی باشتری دەبیّ."لە دیداری دواتریدا ژەنەراڵ ئەمەی بە توندی و موکڕی زێترەوە لەو داواکرد. ژەنەراڵ ئەوی لە منداڵیەوە دەناسی و هەر لەبەر کارەکەیان دۆستی یەکدی نەبوون. بەڵکە ژیانێکی هاوبەشیان پێکەوە بەسەربردبوو، زەمانیّ پەیوەندیەکانیان ئەوها سارد ببوو کە تا لەگەڵ یەکدا قسەشیان نەدەکرد، لەبەرئەوە لەناسکترین و ترسناکترین کاتەکانی رووبەڕووبوونەوەی ژەنەراڵ لەگەڵ مۆریجۆ لە مۆمپوکس مونتیجا لەناردنی یارمەتی سەربازی سڵەمیەوە و ژەنەراڵیش

ئەوی وەك ناپاك و مرۆڤێكی نابەرپرسیاردانا. مونتیجا داوای موبارەزەی لێكرد. لەگەڵ ئەم حاڵەو ئەو هەموو كینەیشی لە خزمەتی سەربەخۆیی و ژەنەراڵدا هەر ماوە لە زانكۆی سەربازی مەدرید ماتماتیك و فەلسەفەی خوێندبوو و تا ئەو حەلەی یەكەمین دەنگ و باسەكانی ئازادیخوازی لە فەنزویلا بیست لە دەستەی پارێزگاریكەرانی فرناندۆی حەوتەمی پاشای ئیسپانیادا بوو. لە مەكسیك سیخوڕێكی بێوێنە بوو، لە كورا زائۆ قاچاغی چەكی دەكردو تا حەڤدە ساڵی كە چەند جارێك بریندار كرا. لە هەموو جەنگێكدا كوڕێكی بە چەپارەو شەڕ كەرێكی زۆر بێوێنە بوو، لە ساڵی ١٨٢١ دا سەرتاسەری ناوچەی نێوان رێوئاچا و پانامای لە ئیسپانیایی پاككردەوەو لەگەڵ ئەوەی كە ژمارەی پیاوانی دوژمن لە كارتاخناد زۆر زۆر بوون و چاكیش تەیاربوون، بەڵام ئەوێشی داگیركرد. لە دواییدا بەشێوەیەكی پڕ لە شكۆ یەكێتی خۆی لەگەڵ ژەنەراڵدا راگەیاند، كلیلە زێرەكانی شاری بۆ ئەو نارد، بەڵام ژەنەراڵ بۆی ناردەوە پلەی ژەنەراڵی پێبەخشی و فەرمانڕەوایی ئەو ناوچەشی بەو سپارد. فەرمانڕەوایەكی خۆشەویست نەبوو و هەوڵیدەدا هەڵەكانی خۆی هەر بە گاڵتە بباتەسەرو بیانسەپێنێ.

چاكترین خانووی شاری هەبوو و كێڵگەكەی كە ناوی ئاگوئاس بیباس بوو، لە هەموو دەڤەرەكەدا لە وێنەی نەبوو، خەڵكی شارەكە بە نووسین لەسەردیواران دەیانپرسی كە پارەی كڕینی ئەو شتانەی لە كوێ هێناوە، لەگەڵ ئەم حاڵەدا لە پلەو پایەی خۆیدا ماوە، هەشت ساڵی رەبەق فەرمانڕەوایی كردو لەو ماوەیەدا بوو بە سیاسەتمەدارێكی زیرەك.

لەبەرانبەری هەر پێداگریەكی ژەنەراڵ مۆنتیجا بیانووی جیاجیای دەهێناوە، بەڵام جارێك ئاشكراو راشكاوانە قسەی دڵی خۆیكرد: "كەسانی سەر بە پارتەكەی بۆلیوار كارتاحنا ئامادەنین قانوونی بنەڕەتی و دەوڵەتی نوێ قبووڵ بكەن. دەوڵەتێك كە هەموو لە دژین و لەسەر بناغەی رێككەوتن دانەمەزراوە."ئەم سیاسەتە تایبەتبوو بەم ناوچە و تا ئەم وەختە ئەم جیاوازیانە، مێژوویەكی پڕ لە ئازارو زەحمەتی دروستكردبوو، مۆنتیجا وتی: "ئێوە قوربان كە لە هەمووان لیبرال ترن، ئەگەر لەبەرانبەری ئەم كەسانەی كە بۆ لەناوبردنی دەستكەوتەكانی ئێوە ناو لە خۆیاندەنێن لیبرال ئەگەر تۆ ئێمە ملكەچی خۆت بكەی ئەوا هیچمان لە دەستنایە ، بەڵام هیچ كاتێك ئێمە ئەوان قبولّ ناكەین."بەمجۆرە تاكە رێگا چارە ئەمە بوو كە ژەنەراڵ بۆ بەرگرتن لە نابووتی وڵات و یەكێتیەكەی لەوێدا بمێنێتەوە.

ژەنەراڵ بەدەنگێکی پڕ لە تەوسی تایبەت بە خۆی گوتی: "باشە ئەگەر بەم شێوەیە بە کارمۆنا بڵێین بێتە سەردانم تا پێکەوە قەناعەتی پێبکەین کە ئاژاوەیەك بنێتەوە. بەمجۆرە خوێنڕێژی کەمتر دەبێ لەوەی کە ئێوە کارتاخنابییەکان خۆتان بتانەوێ ئاژاوەیەك بنێتەوە."

بەڵام پێش ئەوەی مۆنتیجا ئەوێ بە جێبهێڵێ. ژەنەراڵ ددانی بەخۆیدا گرتبوو و داوای لەو کرد پێشنیارەکەی بۆ ئەوانیدکەشی دووبارە بکاتەوە تا ئەو مەسەلە چارەسەربکرێ. هێشتا چاوەڕێی وەڵامی ئەوانبوو کە ژەنەراڵ کارنیۆ ئاگاداریکردەوە کە موسکرا سەرۆکایەتی کۆماری قبووڵکردوە. ژەنەراڵ ناولەپێکی بەنێو چەوانی خۆیدا کێشاو وتی: "هەی لەعنەتی ئەگەر بەدەمی خۆیشی پێمبڵێ هەر باوەڕ ناکەم."

پاشنیوەڕۆی هەمان ڕۆژ باوبارانێکی توندی هێنا، درەختی لە ڕەگەوە هەڵکێشا، لاتێکی گوندەکە کاولبوو، حەوشەی ماڵ و گەوڕی ئاژەڵەکان وێران بوون و بەسەر قوڕو لیتەوباران دا وەرگەڕا، لە ژێر ئەو بارانە بەتاوە، ژەنەراڵ مۆنتیجا چوو تا ڕاستی هەواڵەکە بۆ ژەنەراڵ بێنێ. توندی زریانەکە لە بایەخی هەواڵەکەی کەمکردەوە. سەربازان و پاسەوانان کە لە بێکاری ئەو ڕۆژانەیان حەوسەڵەیان لەسەردانەمابوو، کارێکیان بۆ خۆیان پەیداکرد، بەپەلەکەوتنە خۆو پێشیان لە وێرانکاری زیاتر دەگرت، مۆنتیجا پارچەیەکی بارانی بەسەر شانوشەپیلکی داداو بۆ رزگارکردن ڕێبەرایەتی کارەکانیدەکرد.

ژەنەراڵ کە پەتۆیێکی لە خۆی وەرپێچابوو لەسەر کورسی بەرانبەری پەنجەرەکە دانیشتبوو و بەرانبەر زریان و لافاوەکەی هەموو شتێکی رادەماڵی، سەرسامی ببوو، لە منداڵیەوە ئاشنایەتی بەم جۆرە زریانانەی دەریاوە هەبوو، بەڵام لەو کاتەدا بە خۆزەپالاسیۆسی وت تا ئەم کاتە زریانێکی وای نەدیتوە، دوای ئەوەی کە بارەکە ئاسایی بۆوە مۆنتیجا کە سەرتاپای ئاوی لێدەچۆڕاوە و تا ئەژنۆیانی لە قوڕێدا بوو، هاتە ناو سالۆنەکەوە ژەنەراڵیش لەبیرکردنەوەدا ڕاچووبوو.

ژەنەراڵ وتی: "مۆنتیجا باشە، موسکرا سەرەنجام سەرۆکایەتی کۆماری قبووڵ کردوە ، بەڵام هێشتا کارتاخنا ئەوی بە ڕەسمی نەناسیوە."

بەڵام مۆنتیجا لەگەڵ ئەم لافاوەشدا هەست و بیری لەسەر خۆیبوو و گوتی: "قوربان، ئەگەر ئێوە لە کارتاخنا بمێننەوە کارەکان زۆر ئاسانتر دەچێتە پێشێ."

ژەنەراڵ وەڵامیداوە: "حەزناکەم وا بزانن من لە دواوەی ئەم مەسەلەوە. هەر نامەوێ هیچ ڕۆڵێکم هەبێ و لەمەش زیاتر هەر ماوەیەکی کە پێویستبێ لێرە دەمێنمەوە تا ئەم گیرو گرفتە بە تەواوی چارەسەردەبێ."

هەر هەمان شەو نامەیەکی بۆ ژەنەراڵ موسکرا نووسی کە تێیدا نووسیبووی: "ئاگاداریانکردمەوە کە ئێوە سەرۆکایەتی کۆمارتان قبووڵ کردووە. سەیرم لەمکارە هات، ئەگەر چی بۆ خۆمو وڵاتەکەم خۆشحاڵم بەڵام داخ بۆ ئێوە دەخۆم و لەسەر ئەم داخەشدا دەمێنمەوە."دوای ئیمزاکردنی نامەکە رستەیەکی زیرەکانەی بەم ناوەرۆکە لە کۆتایی نامەکەدا نووسی: "من هێشتا لێرە نەڕۆیشتوم. چونکە گوزرنامەم بەدەست نەگەیشتوە ، بەڵام هەر لەگەڵ وەچنگی بخەم ئێرە جێدەهێڵم."

ژەنەراڵ دانیال فلۆرەنسیو ئۆلری ئەندامی دیاری هەنگی سەربازی بەریتانی یاریدەدەری تایبەتی و نووسەری دوو زمانەی ژەنەراڵ رۆژی یەکشەممە گەیشتە تۆرباکۆ و گەیشتە کۆمەڵە هاوڕێکاکانی ژەنەراڵ مۆنتیجا لە کارتاخناوە هاوڕێگایەتی ئەویکرد و هەردووکیان لەگەڵ ژەنەراڵدا پاشنیوەڕۆیەکی رێك و دۆستانەیان لە ژێر دار نارنجاندا بە دەم پیاسەوە کاتەکەیان بەرێکرد. دوای گوتوبێژێکی زۆر لەگەڵ ژەنەراڵ ئالریدا، سەرەنجام ژەنەراڵ قسەکەی بردەوە سەر بابەتە هەمیشەییەکە و پرسی: لەوێ دەنگۆی چییە و چیدەڵێن؟"

ئالری وتی: "دەنگۆی ئەوەیە کە ئێوە ناڕۆن."

ژەنەراڵ پرسی: "سەیرە! ئێستا بۆچی وا بیردەکەنەوە؟"

ئالری وەڵامیداوە: "لەبەرئەوەی منوئلا دەمێنێتەوە."

ژەنەراڵ راستگۆریانە بە باوەڕنەکردنەوە گوتی: "ئاخر منوئلا هەمیشە ماوەتەوە."ئالری کە دۆستی گیانبەگیانی مانوێلاسئنز بوو. دەیزانی ژەنەراڵ هەقیەتی. ئەمە راستبوو کە ئەو هەمیشە دەماوە. بەڵام نەك لەبەر خواستی خۆیبوو، بەڵکە لەبەر ئەوەی کە ژەنەراڵ هەر جارێك بیانووێکی دەهێناوە تا بتوانێ لە کۆت و پێوەندی عەشقە ئاشکراکانی رابکا. جارێکیان لەگەڵ خۆزەپالاسیۆسدا، کە تەنیا لەگەڵ ئەودا ئەم جۆرە قسانەی دەکرد، ددانی پێداهێنابوو:

"هەرگیز جارێکی دیکە عاشق نابمەوە. چونکە وەك ئەوە وایە مرۆڤ لە یەك کاتدا دووگیانی لەبەردابێ."مانوێلا بەدان بەخۆداگرتنی گێروگرفت و بەهێزیەکی زۆرەوە هاتە ناوژیانی ژەنەراڵەوە، بەڵام هەرچەندەی پتر هەوڵیدەدا ئەو بخاتە ژێر رکێفی خۆی، ئەوا ژەنەراڵ زیاتر ئارەزووی لە ئازادکردنی ئەو بەندانە دەکرد. عیشقێکی پڕ لە راکردن و خۆدزینەوەی بەردەوام بوو، لە یەکەم دوو حەفتەی عیشقەکەیان ئەو بۆ چاوپێکەوتن لەگەڵ ژەنەراڵ خۆزەدسن مارتین دا ناچاربوو کە بچێتە گواجاکیل، منوئلا بەردەوام لە خۆی دەپرسی کە ئەم خۆشەویستیە چۆن چۆنییە. ژەنەراڵ گفتی پێدابوو کە لە

هەرجێگایەکبێ ئەوا هەموو رۆژێك نامەی بۆ بنووسێ و تێیدا خۆشەویستی خۆی بۆ دەربڕێ و ددانی پێدابنێ، لە راستیدا نامەیشی دەنووسی و زۆرجارانیش بە دەستخەتی خۆی، بەڵام نەیدەناردن. لە هەمانکاتدا، لە گوئاجاکیل لەگەڵ پێنج ژنی بنەماڵەی گاریکوئا عیشقێکی چەند لایەنی هەبوو و هیچ کاتێکیش نەگەیشتە ئەنجام کە لە نێوان نەنکێکی پەنجاو هەشت ساڵە و کچێکی سی و هەشت ساڵە و سێ نەوەی گەنجی دا کامەیانی زۆرتر خۆشدەوێ. کاتێك کە کارەکانی لەوێ کۆتایی پێهات، گفتی عشقێکی هەتا هەتایە و بە زووترین کات گەڕانەوەی پێدان. ئەو وەختەی کە گەڕاوە کیتۆ تا خۆی لەناو عیشقی ئاگرینی مانوێلا سەئنزدا نقوم بکا. لەسەرەتای ساڵی دواییدا جارێکی دیکە بۆ ئازادکردنی پیرۆ، کە دوا خەونیبوو رۆیشت و منوئلای تەنیا بەجێهێشت. منوئلا چواردە مانگان چاوەڕوانبوو، لە دواییدا هەر لەگەڵ ئەوەی کە نامەکانی ژەنەراڵی کە بە نووسەری تایبەتی خۆی خوئان خۆزەسانتانا نووسیبوونی — بەدەستگەیشت. بەرەو لیما کەوتە رێگا. ئەوی لە تەلاری ماگدالنا دۆزیەوە، لەو سەردەمەدا ئەنجومەن دەسەڵاتی تەواوی بەو دابوو هەر چوار دەوریشی بە ژنی جوانجوان گیرابوو، بێسەروبەری ئەو ماڵە بە جۆرێك بوو کە شەوێکیان ژەنەراڵ گوێزایەوە ، چونکە لەو دەنگە دەنگەی لە ژوورەکانەوە دەهات خەوی لێنەدەکەوت. بەڵام منوئلا بە باشی دەرەقەتی ئەو بارانە دەهات. لە کیتۆ لە دایك ببوو، کچی ناشەرعی ژنێکی دەوڵەمەندو پیاوێکی بەژن و ماڵ بوو، لە هەژدەساڵیدا بە یارمەتی ئەفسەرێکی سوپای پاشا لە راهیب خانەیەکی کە تێیدا دەخوێند، رایکردو ئەویش لەگەڵی رایکرد. لەگەڵ ئەمەدا دووساڵ دواتر لە لیما لەگەڵ جیمزتورن کە پزیشکێکی ئینگلیز بوو و دوو تەمەنی ئەوی هەبوو هاوسەرێتی کرد.

بەمجۆرە کاتێك کە بەدوای عیشقەکەی بەرەو لیماچوو، پێویستی بەوە نەدەکرد کەسێ دەرسی پێبلێ و توانی بە باشی شوێنی خۆی لە نێوان ئەو هەموو ئاژاوە و بێسەرو بەریەدا بکاتەوە.

ئالری یاریدەدەرو راوێژکاری تایبەتی مانوێلا لەنێو ئەو جەنگە عاشقانەییانەدا بوو، لەگەڵ ئەوەشدا کە منوئلا لەو ماڵەدا نەدەژیا ، بەڵام هەردەمێك بیویستبا دەیتوانی بچێتە ئەوێ عاقڵ دەستەمۆنەکراو روخۆش و لە هەمانکاتدا زۆر دەسەڵات خواز بوو، لەبەرئەوەی مێردەکەی ئینگلیز بوو هۆیەك بوو بۆ ئەوەی کە بەم زمانە بە باشی قسە بکا، بەڵام فەرەنسی لە قەدەر جێبەجێکردنی پێویستیەکانی دەزانی و هەرچەندە زۆر سەرەتاییانەش بێ، بەڵام پیانۆشی دەژەنی. بە زەحمەت دەستوخەتی دەخوێندراوە و هەڵەی نووسینەوەی زۆر بوو بەڕادەیەك کەخۆی بە هەڵەکانی خۆی زۆر پێدەکەنی. ژەنەراڵ ئەویکردبووە پاسەوان و پارێزگاریکاری پەروەندو دەفتەرەکانی و ئەم کارە دڵ

گۆڕینەوەی لە هەموو کاتو ساتو و جێگایەکدا، تا لە نێو ئاژەڵەکانی مانوێلا دەستەمۆی کردبوونو ڕایگرتبوون، بۆ ئەوان زۆر ئاسانکردبوو.

لەگەڵ ئەمەشدا کاتێك کە ژەنەراڵ بۆ داگیرکردنی ئەو شوێنانەی هێشتا لە پیرۆ داگیرنەکرابوون و لە دەستی ئیسپانیەکاندا بوو، بەرێکەوت، ئەوی لەگەڵ خۆیدا نەبرد، مانوێلا بەبێ مۆڵەت بەکاروانێك لەکەلوپەلەکانیەوە سەندوق و پەروەندەو تاقمێك سەربازی کۆلۆمبیاییەوە کە عیشقیان بۆ ئەو دەنواندو دڵسۆزی بوون. لەدوای ژەنەراڵدا بەرێکەوت. بەسەرپشتی وڵاغەوە سێسەد لگوا ڕێگای دووروکێوی ڕکو دژواری ئاندی بڕی و تەنیا ئەوەندەی بۆ کرا کە لە ماوەی چوار مانگ و دووشەو دا شەوێك خۆی بگەیەنێتە ژەنەراڵ ئەویش لەبەر ئەوەبوو گەفی خۆکوشتنی دەکرد. زۆری ویست تامانوێلا بۆی دەرکەوت لەو شوێنانەی کە لەگەڵ ژەنەراڵ نەبووە. ئەو لەگەڵ ئەو ژنانە بووە کە لەسەر ڕێگای خۆیدا توشیان بووە. لە نێوانیاندا کچێکی هەژدەساڵە بوو لە چینە نزمەکانی کۆمەڵگابوو ناوی منوئلیتا مادرۆنیۆ بووە کە ژەنەراڵ پەیوەندیەکی تایبەتی لەگەڵیدا هەبووە.

کاتی گەڕانەوەی بۆکیتۆ مانوێلا بڕیاریدابوو مێردەکەی جێبهێڵێ. کەوەسپی مێردەکەی دەکرد دەیگوت ئینگلیزێکی زۆر وشکە قسەکانی سەرنجڕاکێشنین، زۆر بە ئەسپایی دەڕوا. بە پارێزەوە هەڵدەستێ و دادەنیشێ. زۆر بەرێزەوە سڵاو و ئەحواڵپرسی دەکا و تا بە نوکتەکانی خۆشی پێناکەنێ. بەڵام ژەنەراڵ قەناعەتپێکرد کە لەو جیانەبێتەوە و بیر لە شوێنە کۆمەڵایەتیەکەی بکاتەوە. ئەویش قبووڵی کرد.

مانگێك لەدوای سەرکەوتن لە ئاجاکوچۆ، ژەنەراڵ لە کاتێکدا کە خاوەنی نیوێکی جیهان بوو، بەرەو پیرۆ، کە لە دواییدا بووبە کۆماری پۆلیڤیا رۆیشت، نەك هەر تەنیا بەپێی منوئلا رۆیشت ، بەڵکە بەر لە رۆیشتنی لە بابەت جودایی هەتا هەتایەوە قسەی لەگەڵدا کرد. لە نامەیەکدا بۆی نووسی: "من وایدەبینم کە هیچ شتێك ناتوانێ ئێمە پێکەوە ببەستێتەوە لە ئایندەدا تۆ تەنیا دەبی ئەگەر چی لە کەنار هاوسەرەکەتدای و منیش لەنێو ئەو جیهانەدا تەنیا دەمێنمەوە. تەنیا دان بەخۆداگرتنمان دەبێتە جۆرێك دڵدانەوە بۆمان."سێ مانگ بەسەر ئەمەدا تێنەپەڕیبوو کە نامەیەکی لە منوئلا پێگەیشت. منوئلا لەم نامەدا ئاگاداریکردەوە کە لەگەڵ مێردەکەیدا دەچێتە لەندەن. وەختێك کە لە ماڵی ژنێك بوو کە ناوی فرانسیسکا زوبیگاد گامارا بوو، ئەو نامەیەی بەدەستگەیشت. فرانسیسکا ژنێکی بەجەرگ و هاوسەری دەریا سالارێك بوو کە لە دواتردا بوو بە سەرۆك کۆمار. ژەنەراڵ لەو شەوەدا چاوەڕێی عیشقی

دووەمی نەکرد. دەم و دەست نامەیەکی بۆ منوئلا نووسی کە پتر لە فرمانپێکرنێك دەچوو: "راستیم پێبلێین و بەهیچ لایەکدا نەڕۆن."وهێلێکی بەژێر رستەکەی دواییدا کێشا: "من بە هەموو بوون و قەوارەمەوە تۆم خۆشدەوێ."منوئلا بە خۆشیەوە گوێڕایەڵی ئەم فرمانەی کرد.

خەونەکانی ژەنەراڵ هەر لە رۆژی یەکەمەوە لەبەریەك هەڵوەشانەوە کۆماری پۆلیڤیا تازە دامەزرابوو و چاوپێداخشاندنەوە بە قانوونی بنەڕەتی پیرۆ تازە کۆتایی پێهاتبوو، کە یەکەمین هەواڵەکانی داواکاریەکانی جیابوونەوەی ژەنەراڵ پائز لە ڤەنزویلا و ئاژاوە سیاسیەکانی سانتاندر لە نوئباگرانادا بە ژەنەراڵ گەیشتن و ناچار بوو دەستوبرد بۆ سانتافە بگەڕێتەوە ئەمجارەیان وەختێکی زۆرتری بەسەردا تێپەڕی تا ژەنەراڵ رێگای بەمنوئلادا کە بەدوایدابێ ، بەڵام کاتێك کە مۆڵەتی وەرگرت. هەروەك کۆیلان کەلوپەلی کێشاوە. سەندوقەکانیان لە دوازدە ولاغان بارکرد، و خولام و کەنیزەکانیشی لەگەڵ ئەم کاروانەدا بەرێکەوتن. ئەمە وێڕای یازدە پشیلە شەش سەگ، سێ مەیموونی تەعلیم دراو بە هونەری جوێنەکانی ناودەربار، کەڵەشێرێك وەستایەکی درێشەکاری و نۆقەفەزی پڕ لە تووتی گەورەو بچووك کە بەبێ هیچ تێبینیەك لە دژی سانتاندر بەسێ زمانان قسەیان دەکردو هوتافیان دەدا.

رێك لە کاتی خۆیدا بۆ رزگارکردنی گیانی ژەنەراڵ لە شەوی بیست و پێنجەمی ئەیلوول گەیشتە سانتافە، پێنج ساڵ بەسەر ئاشنایەتیاندا رەتدەبوو ، بەڵام ژەنەراڵ ئەوەندە بە گومان و دوودڵیەوە وەك پیران رەفتاری دەکرد کە مانوێلا هەستیکرد لە فەزایەکی تەمومژاوی تەنیا وسەرگەرداندا بەم لاو ئەولادا دەچێ. ژەنەراڵ دوای چەند وەختێك دووبارە بەرەو باشوور چۆوە تا بەر لەداگیرکردنی کیتۆ و گوئاجاکیل بگرێ و نەهێڵی بکەونە دەستی هێزەکانی پیرۆ و ئەمجارە مانوێلا بەبێ ئەوەی حەزبکا بەدوای کەوێ لە سانتافەماوە، چونکە دەیزانی کە بۆ دڵدارە راکردووەکەی جێگایەك نەماوە سەری پێدابکا و بۆی دەرچوو. دواتر ئالری لە یادەوەریەکانیدا نووسیبووی کە ژەنەراڵ لە هیچ کات و ساتێکدا وەك پاشنیوەڕۆی ئەو یەکشممەی لەتۆباکۆ بەو روونیو راشکاویەوە لەبارەی ئەوینە پەنهانەکانی خۆی نەدوابوو. مۆنتیجا لەو بارەوە وایزانیبوو کە ساڵانێك دواتر لە نامەیەکی تایبەتدا نووسی، کە بەبێ دوو دڵی ئەم قسانەی نیشانەی پیری بووە. مۆنتیجا کە لە هەستێکی سوعبەتچیانەوە زۆری بۆهات خۆی بۆ رانەگیراو لە کۆتاییدا لە ژەنەراڵی پرسی:

"تەنیا هەرمانوێلات بەتەنێ جێدەهێشت."

ژەنەراڵ بەدەنگێکی لەخۆڕادیتوانەوە وەڵامیداوە: "هەموویانم تەنیا جێدەهێشت ، بەڵام مانوێلام لە هەمووان پتر جێدەهێشت."

مۆنتیجا چاوێکی لە ئالری داگرت و وتی:

"ژەنەراڵ ددانی پێدابێنە چەند دانەبوون؟"

ژەنەراڵ بەسەر وەڵامێکی راستدا بازیداو گوتی: "کەمترن لەوەی ئێوە تێیدەگەن."ئەو شەوە کاتێك حەمامیدەکرد، خۆزەپالاسیۆس دوو دڵی لەلا نەهێشت، بە ژەنەراڵی گوت: "بەپێی حسێبی من سی و پێنج دانەبوونە: هەڵبەتە ئەمە بەبێ حسێبکردنی مەلە یەکشەویەکان."ئەم ئامارەی لەگەڵ حسێبەکانی ژەنەراڵ دەخوێندەوە: "بەڵام بەدرێژایی پەیوەندیەکەی لەگەڵ ژەنەراڵدا نەیویستبوو ئەم رازە ئاشکرابکا."

ژەنەراڵ روونیکردەوە: "ئالری پیاوێکی گەورەو سەربازێك و دۆستێکی دڵسۆزە ، بەڵام بگاتە هەرچیەك پاداشتی دەکاو هیچ شتێك لە یادەوەری نووسراوە ترسناکتر نییە."

رۆژی دواتر لە چاوپێکەوتنێکی دوورودرێژو تایبەتیدا داوای لە ئالری کرد کە بەرەو تاخنابچێ و لەمەڕ جموجوڵی کەشیتەکانەوە بەرەو ئەوروپا زانیاری وەدەستبێنێ. بەڵام لە ڕاستیدا کاری ئەو لێکۆڵینەوە لەمەڕ سیاسەتەکانی ناوچەیەك بوو. ئالری تازە گەیشتبووە جێ کە زانی شەممە دوازدەی مایس ئەنجوومەنی کارتاخنا قانوونی بنەڕەتی قبوولکردووە و سوێندە پێخواردبوو مۆنتیجا لەگەڵ ئەم هەواڵەدا پەیامێکی دیکەشی بۆ ژەنەراڵ نارد:

"چاوەڕێی ئێوە دەکەین."

هێشتا هەر چاوەڕێبوو کە لەگەڵ بیستنی هەواڵی مەرگی ژەنەراڵ لەناو نوێنەکەی دەرپەڕی. بەو پەڕی خێراییەوە بەرەو تۆرباکۆ کەوتەڕێ و لەوێ لە هەموو کاتێك سەرحاڵتر ژەنەراڵی دیت. ژەنەراڵ خەریکی فراوینکردنبوو لەگەڵ کۆنت فرانسوا رائیجیکورت کەهاتبوو داوا لە ژەنەراڵ بکا کە لەگەڵ ئەودا بە کەشتیەکی چکۆلانەی ئینگلیزی کەوا هەفتەیەکی دیکە دەگاتە کارتاخنا، بەرەو ئەوروپا بچێ. ئەمە دەستپێکی رۆژێکی باشبوو بۆ ژەنەراڵ. ئەو بڕیاریدابوو لەگەڵ نەخۆشیەکەیدا بەهێزبێ و بەورەیەکی بەرزەوە زۆرانبازی لەگەڵ بکاو تا ئەو کاتە لەم زۆرانبازیەی سەرکەوتوبوو. بەیانی زوو بەئاگاهاتەوە و لە کاتی دۆشینی مانگاکان لەوێ بوو. ئینجا بۆ شوێنی نووستنی سەربازەکان چوو لە ژیانی ئەوانی پرسی و فرمانی توندی بۆ باشکردنی باری ژیانی ئەوان دەرکرد. لەگەڕانەوەیدا چووە قاوەخانەیەکی ناوبازار، فنجانە قاوەیەکی فڕکرد و بۆ ئەوەی دوای رۆیشتنی فنجانەکە نەشکێنی لەگەڵ خۆیدا بردی. بەرەو ماڵ

دەچۆوە کە لە پڕێك منداڵانێکی لە قووتابخانە دەهاتنەوە. ڕێگایان لێگرت و هەر لە هەموویان پێکەوە هاواریان کرد: "بژی ئازادیخواز! بژی ئازادیخواز!"ئەوەندە گەشکەگرتبووی کە ئەگەر منداڵەکان ڕێگایان بۆ چۆڵنەکردبا، نەیدەزانی چیبکا.

کۆنت رائیجکورت لەگەڵ خانمێکدا بەبێ ئاگاداری و لەپڕ هاتبوونە سەردانی ژەنەراڵ، ژەنەراڵ لە هەموو ژیانیدا تا ئەو حەلە ژنێکی بەو جوانی و لەش و لارە ڕێکەوە نەدیتبوو، لەگەڵ ئەوەی کە بە گالیسکە هاتبوون، بەڵام جلوبەرگی سوارەیان لەبەردابوو، تەنیا خاسیەتێکی کە ئەو ژنە لە خۆی بەدەرخست ئەمەبوو کە ناوی کامیل و خەڵکی مارتینیکە کۆنت هیچ قسەیەکی لە بارەوە نەکرد، بەڵام بەدرێژایی گفتوگۆیەکەیان ئاشکرابوو کە شێتانە شێت و شەیدای ئەوە.

تەنیا بوونی کامیل شادی و جموجوڵی رابردووی تێزاندەگیانی ژەنەراڵ و فرمانیدا کە بەپەلە فراوینێکی پاشایانە ئامادەکەن. لەگەڵ ئەوەشدا کە کۆنت، بە باشی بە زمانی ئیسپانی قسەی دەکرد، هەموو دانیشتن و قسەوباسەکانیان هەر بە فەرەنسی کرد کە زمانی کامیل بوو، هەر کە کامیل گوتی خەڵکی (ترویسس- ئیلتس) ە ژەنەراڵ زۆر مۆشتاقانە چاوەکانی بریسکانەوە.

ژەنەراڵ گوتی: "ئاخ ئەو شوێنەی کە خۆزفینای تێدا هاتە دنیا."کامیل پێکەنی و گوتی: "تکادەکەم سەروەرەکەم، من لە ئێوە چاوەڕێبووم مەسەلەکان باشتر ببینن."

ژەنەراڵ شەرمەزاربوو و بەرستەیەکی شاعیرانە بەرگری لە خۆیکردو لە بارەی لاپاژری زێدو ماڵی شاژنی فەرەنسی، ماری ژۆزێفەوە کە هەر مارتنێك بوو بۆ خۆی، قسەیکرد، کامیل لە شارەزایی ژەنەراڵ لەمبارەوە زۆر سەرسامبوو.

ژەنەراڵ وتی: "راستی ئەمە کە قەت لەوێ و یان جێیەکی دیکەی مارتنێك نەبووم."

کامیل پرسی: "ئەدی ئەم شارەزاییەتان لە کوێ بوو؟"

ژەنەراڵ وتی: "ساڵانێك خەریکی خوفێرکردنبووم، چونکە دەمزانی کە رۆژێك بۆ رازیکردنی جوانترین ژنی ئەو دوورگانە پێویستیم بەو زانیاریانە دەبێ."

بەبێ راوەستان و بەزمانێکی پاراو ، بەڵام بەدەنگێکی گیراوەوە قسەی دەکرد. پارچەیەکی سادەی بەخۆیدادابوو شەلوارێکی لەبەرکردبوو جووتێك سۆڵی ڕەنگاوڕەنگی بەسەر پاوەکردبوو. کامیل سەری لە بۆنی ئەو کۆلۆنیایە سوڕما کە لە ژووری نانخواردندا ڕێڕێ دەهات. ژەنەراڵ ددانی پێداهێنا کە ئەمە لە لاوازی ئەوەوەیە کە دوژمنانی تەنانەت بەوەش تۆمەتباریان کردوە کە هەشت هەزار پزوی لە خەزێنەی دەوڵەت بە کۆلۆنیاداوە.

لە کۆڕی پیاواندا، ژەنەراڵ هەر جوێن و قسەی ناشیرینی بە دەمدا دەهات: بەڵام بوونی ژنێك بەسبوو تا ئەو تەرزی دوان و جۆرە وشانەی بە تەواوی بگۆڕێ. ژەنەراڵ خۆی سەری شووشەیەك شەرابی زۆر باشی بۆرگونیای کردەوە. کۆنت شەرابەکەی بە مەخمەڵێکی زۆر جوان وەسپکرد. خەریکی قاوەخواردنەوە بوون کە ژەنەراڵ ئایتوربیدە هاتە ژووریٚ و شتێکی بەبنگوێی ژەنەراڵ داچرپاند: سەرەتا ژەنەراڵ بەنارحەتیەوە گوێی بۆ راگرت: بەڵام دوای ئەوە خۆی بەکورسیەکە داداو دەستیکرد بە پێکەنین.

ژەنەراڵ گوتی: تکا دەکەم باشم گویٚ بۆ راگرە. لە کارتاخناوە چەند نێردراو و نوێنەرێك هاتوون تا لەرێورەسمی مردنی مندا بەشداری بکەن. رێگای هاتنە ژوورەوەیدان، مونتیجا و هاوڕێیەکانی هیچ چارەیەکیان نەبوو جگە لە گوێگرتن بۆ قسەکانی ژەنەراڵ. فرمانیدا کە تیپی مۆسیقاو شایی کەرانی سانخسنتۆ کە لە شەوی پێشوەوە لەنێو شاردا بوون ، بێنو هەندیٚ پارچە مۆسیقایان بۆ بژەنن. سەمای کۆمبیایان بۆ میوانان کرد، کامل بەدیتنی ئەو سەما جوانەی کە بەرەسەن ئەفریقای بوو، ماتبردیەوە و ویستی فێربیٚ، ژەنەراڵ لە پێکوتان و شایی، زۆر ناسرابوو و هەندیٚ لە هاوڕێیانی لەبیریان بوو کە لە دوا چاوپێکەوتنی لە تۆرباکۆ زۆر بە وەستاییەوە، سەمای کۆمبیای کردبوو، بەڵام هەر کە کامیل بۆ سەماکردن بانگی کرد. نەچوو، بە زەردەخەنەوە گوتی: "سیٚ ساڵ زمان درێژیە."کامیل تەنیا دوو یان سیٚ جار راهێنانی لەسەر ئەو سەمایە کرد. لە یەکێك لە پشووەکانی مۆسیقالێداندا لەپڕ دەنگی هاوار هاوار، تەقینەوەی تەرەقەو قلێشانەوە هاتە گویٚ کامیل زۆر ترساو هەترەشی رژا.

کۆنت بە حاڵەتێکی پڕ لە راستیەوە وتی: "خواکەم، شۆڕش پەرپا کراوە."ژەنەراڵ بە پێکەنینەوە وەڵامیدانەوە: "هەتا ناتوانن ئەوە بزانن کە چەندە نیازی شۆڕشمان هەیە. بەڵام بەداخەوە ئەم هات و هاوارە بۆ شەڕەکەڵەشێرە."

بەبیٚ تێڕامان قاوەکەی تەواوکردو بە ئاماژەی دەستی هەمووی بانگکردن تا بۆ سەیری شەڕە کەڵەشێرەکە بچن.

ژەنەراڵ گوتی: "مۆنتیجا. لەگەڵ مندا وەرە تا تێبینی ئەوە بکەی کە تا چ ڕادەیەك مردووم."بەمجۆرە دەوروبەری سعات دووی دوای نیوەڕۆ بوو کە لەگەڵ دەستەیەکی زۆردا بەسەرکردایەتی کۆنت رائیجکورت بۆ تەماشاکردنی شەڕە کەڵەباب رۆیشتن. بەڵام هیچ کەسێك تەماشای ئەوینەکرد. بەڵکە هەر هەموو روویان هەر لە کامیل بوو. هەموو وایانبیردەکردەوە کە کامیل مەعشوقەێکی دیکەی ژەنەراڵە. بەتایبەتیش کە هاتبووە شوێنێك کە بۆ ژنان

قەدەغەبوو. ئەوا ئەم بۆچوونەی بەهێزتردەکرد. هەر کە هەموو پێیانزانی کە کامیل لەگەڵ کۆنتدا پیاسەدەکا ئەم بۆچوونە بەهێزتریشبووو، چونکە هەموو دەیانزانی کە ژەنەراڵ بۆ کەمکردنەوەی پرۆپاگەندە خۆشەویستەکانی لەگەڵ خەڵکی دیکەدا دەخستەرێگا. دووەمین شەڕ زۆر ترسناك بوو کەڵەشێرێکی ڕەنگاوڕەنگ هەردووچاوی کەڵەبابێکی دیکەی لەقەپێڵك هێنادەرێ. بەڵام کەلەشێرە کوێرەکە خۆی بەدەستەوەنەدا. ئەوەندە ئازایانە شەڕیکرد تا سەری حەریفەکەی لێکردەوە و بەدەنووکان سەرەکەی خوارد.

کامیل وتی: "هەرگیز بیرم بۆ ئەوە نەدەچوو جەژنێکی ئەوەندە خوێناوی بێ، بەڵام زۆرم چێژ لێوەرگرت."

ژەنەراڵ بۆی روونکردەوە کە ئەگەر دادو فەریاد و هاوار بنێنەوە و کەڵەشێرەکان بەوردە جوێنی ناشیرین هانبدەن. لەمەش خوێنین تر دەبێ، بەڵام ئەمجارە لەبەربوونی ژن و بەتایبەتی ژنێکی وەها جوان ئەم کارەیان نەکرد. ژەنەراڵ بە توانجەوە پێی وت: "گوناحی ئێوەیە."کامیل کە چێژی دەبینی پێکەنی و وتی:

"قوربان ئێوە گوناحبارن، ساڵانێکی زۆر حوکمی ئەم وڵاتەتان کرد ، بەڵام هیچ قانوونێکتان دانەنا تا مرۆڤەکان ناچاربن لە ئامادەبوونی ژن و یان ئامادەنەبوونیدا بەیەك جۆر بجوڵێنەوە."

کەم کەم جامی سەبری ژەنەراڵ سەرەو ڕێژ بوو. ژەنەراڵ گوتی: "خوا هێشتت لێدەکەم من بەوشەی "قوربان"بانگ مەکە."ئەوشەوە بەهەمان شێوە کە خۆزەپالاسیۆس لەناو ئاوی بانیۆی حەمامەکەدا مەلەی پێدەکرد گوتی: "ئەمە جوانترین ژنێکە کە تا ئەم چرکەساتە دیتومە."ژەنەراڵ چاوەکانیکردەوە. گوتی: "زۆر ناشیرین و ئێسك گرانە."

بە گوێرەی بۆچونی گشتی. ئامادەبوونی ژەنەراڵ لەشەڕە کەڵەبابەکە پێشتر نەخشەی بۆ کێشابوو تا بتوانێ دەنگ و باسی پەیوەندی نەخۆشیە زۆرەکەی کە ببووە هۆی کەوتنەوەی دەنگۆی مردن، بەدرۆ بخاتەوە. ئەم پلانە زۆرکاریکرد، چونکە پۆستەچیەکان هەواڵی سەلامەتی ژەنەراڵیان بە هەموو خاڵەکانی وڵات گەیاند و لایەنگرانیشی وەرگرتنی ئەم هەواڵەیان کرد بە ئاهەنگ و جەژن و شادی.

ژەنەراڵ تا فێڵی لەلەشی خۆشی کرد، لەبەرئەوە تا چەند رۆژیش دواتر هەر بە کەیف و شادو سەرحاڵ بوو تارادەیەك رێگای بە خۆیدا جارێکی دیکە لەگەڵ یاریدەدەر و راوێژکارەکانی یاری کاغەز بکاتەوە.

ئاندرس ئیبارا که لاوترین به کەیفترینیانبوو و هێشتاش هەستە جەنگخوازیەکانی لە دڵدا هەڵگرتبوو، لە نامەیەکدا بۆ کچێکی دۆستی لە کیتۆ نووسی: مەرگ لەنێوان بازوەکانی تۆدا بە باشتر دەزانم لەم ژیانە ئارامەی بەبێ تۆ بێ."شەو رۆژ یاریان دەکرد: "جاری وا دەبوو یاریەکە رایدەکێشان و بێهەست و خوست دەبوون و هیچ دەنگێکیان لێوە نەدەهاتو جاری وابوو هاتوهاواریان لەگەڵ یەکدا دەکرد و لەگەڵ یەکدا باسو لێکۆڵینەوەیانبوو هەمیشە هەتا شەویش لەگەڵ ئەوەشدا خزمەتکارەکان بەردەوام ئاگرو ئاگردانەکانیان کردبۆوە لەبەرهێرشی مەلەکان لە ئاماندا نەبوون. ژەنەراڵ لەو شەوە بەدبەختیەی گوئادو ئاس یاری نەکردبۆوە. چونکە دەیویست یادی ئەو رووداوە ناخۆشەی لەگەڵ ویلسۆن روویدا بە تەواوی لە دڵیدا دەرچێ، بەڵام لەناو نوێنەکەیەوە گوێی دەدایە بانگ و هاوارو نهێنی و دڵتەنگیەکانیان و لەناو نەبوونی جەنگ لەبەر ئاشتیە بێبناغەیە. شەوێك کە کەوتە پیاسە ئیدی خۆی بۆ نەگیراو لە ناوان و ڕێرەوەکاندا وەستا. بۆئەوانەی کە لەبەرانبەری بوون ئاماژەی کردتا بێدەنگ بن و بە ئەسپایی خۆی لە ئاندیس ئاییبارا کە پشت لە ژەنەراڵ بوو، نزیککردەوە هەردوو دەستی لەسەر شانەکانی ئاییبارا داناو لێی پرسی:

"دەبڵێ بابزانم ئایا من لە مردوو دەچم."

ئیبارا کە بەمجۆرە رەفتارو پرسیارانەی ژەنەراڵ ئاشنا بوو بەبێ ئاوڕ دانەوە وتی: "من وا هەستناکەم، ژەنەراڵ."

ژەنەراڵ وتی: "یان کوێر بووی یان درۆم لەگەڵدا دەکەی."

ئیبارا وەڵامیداوە: "یان لەبەرئەوەی پشتم لە ئێوەیە."

ژەنەراڵ دانیشت تا سەیری یاریەکە بکاو لە دواییدا خۆیشی هاتە ناو یاریەکەوە بۆ هەمووان ئەمە گەڕانەوە بوو بۆ باری ئاسایی، نەك هەر تەنیا ئەم شەوە بەڵکە تا چەند شەوێك دواتریش بارەکە هەر بەمجۆرە بوو و بەقسەی ژەنەراڵ "تا ئەو کاتەی کە گوزەرنامەم بەدەستدەگا. خۆزەپالاسیۆس ژەنەراڵی ئاگادارکردبۆوە، کە لەگەڵ لە ئارادابوونی ئەم یاریانەو بایەخدانی خۆیشی پێیان، تەواوی ئەفسەران لەم هات و چونە بێ مەبەستەی کەبە هیچ شوێنێکی دیارکراو ناگا حەوسەلەیان نەماوە.

هیچ کەسێك وەك خۆی نیگەرانی چارەنووسی و ئایندەی ئەفسەران و هاوڕێیەکانی نەبوو، بەڵام کاتێك کە نەدەکرا مەسەلەکان چاربکرێن تاکە ڕێگاچارە خڵەتاندنی خۆیبوو، لەسەردەمی ئەو دەمەقاڵە ناخۆشەی لەگەڵ ویلسۆن و بەدرێژایی سەفەرەکەی ناو رووباریان هیچ کاتێك لە خەمی ئەوان دەرنەچووبوو. بۆ ئەو رەفتارەکەی ویلسۆن شتێکی وێنانەکراو بوو و تەنیا لە تێمان و دەستە پاچەییەوە دەهات. ژەنەراڵ کاتێك کە جەنگانی ئەوی لە شەڕە خوێناویەکاندا دیتبوو، گوتی: "وەك باوکی

نیزامیەکی زۆر باشە."دوایی لەشەڕی تارکی دەریاسالار سوکرە مەبەستی بوو ئەو بۆ پلەی سەرهەنگ بەرزبکاتەوە. بەڵام قبوولّی نەکرد تا ئەمەی کە سوکرە ناچاری قبولّکردنی کرد. ژەنەراڵ خۆی ئەمەیشی بۆ زیادکردو گوتی: "هەروەها زۆر خاکی و سادەو ساکارە."

چ لە جەنگ و چ لە ئاشتیدا نەزم و رێك و پێکیەکی زۆر زۆریان لەسەر بوو و لە رووی وەفاداریەوە ئەمجۆرە قانوونە سەختەیان قبووڵ دەکرد. هەموویان پیاوی مەیدانی جەنگ بوون و بەجۆرێکی وا دەجەنگان کە دەرفەتی ئاسوودەییان لە هیچ سەربازگەیەکدا نەدەدا، هەموو جۆرە کەسێکیان لە نێواندا دەدیترا. بەڵام دەستە سەرەکیەکەی کە لە ژەنەراڵ نزیکتر بوو هەموویان منداڵە سەرمایەدار و خاوەن بڕوانامەو لە شازادەکانبوون. هەمیشە بە دوور لە ماڵ و ژن و منداڵەکانیان و دوور لە هەموو شتێك خەریکی تێکۆشانبوون و زەمانە ئەوانیکردبووە پیاوی دەوڵەت و سیاسەت. هەموویان جگە لە ئایتوربیدەو راوێژکارانی ئەوروپایی. لە خەڵکی ڤەنزویلاو نزیکەی هەر هەموویان لە نەتەوەی ژەنەراڵ بوون. فرناندۆ خۆزەلارنسیۆ برایەکانی ئیبارا و بریسنیۆ مەندەر، پەیوەندی خانەوادەیی ئەوانی پێکەوە بەستبۆوە. بەڵام لەم نێوانەدا یەکێك لەوان جیاوازی لەگەڵ ئەوانیدیکە هەبوو، خۆزەلارنسیو سیلبا. کوڕە مامانێکی گوندی ئال تیناکۆ، لەناوچەی جانوس ماسی گری دەکرد، لە دایك و باوکیەوە رەنگی پێستی تاریکی وەرگرتبوو. بەڵام ژەنەراڵ ئەوی کردە هاوسەری ڤلیسیا، کە برازایەکی خۆی بوو. لە شازدە ساڵیەوە وەك سەربازێکی کە لەسەر داوای خۆی چووبووە ناو سوپا تا تەمەنی پەنجاو هەشت ساڵی کە پلەی ژەنەراڵی وەرگرت، لە پەنجاو دوو جەنگ لە پێناوی سەربەخۆییدا بەشداریکردبوو کە لەو شەڕانەدا پانزە برینی قووڵ و برینێکی زۆری دیکەی تێکرابوو. تەنیا جارێکیان لەبەر رەنگی پێستی مەسەلەیەکی بۆ خولّقا، لە میوانداریەکدا، ژنێك لە خانەوادانەکان پێشنیارەکەی ئەوی بۆ سەماکردن رەتکردەوە.

ژەنەراڵ فرمانیدا ئەو سەمایەیان دووبارە کردەوە و خۆی لەگەڵ خۆزەلارنسیۆ سەمای کرد.

ژەنەراڵ ئالری هەرهێندەی بستێك بوو لەبەرانبەری، ئەو موزەردە و بالآبەرز بوو هەمیشە جلی سەربازی جوان و خاوێنی لەبەردەکرد، لە تەمەنی هەژدەساڵیدا وەك عەلەمەداری سوارەی نیزامی هاتبووە ڤەنزویلا و نزیکەی لە هەموو جەنگەکانی سەربەخۆیی بەشداری کرد. ئەویش وەك هەمووان سەردەمی تاڵ و تیژی و غەزەب لێگیراوی خۆی چەشتبوو لەبەرئەوەی لە گفتوگۆی خۆزەئانتونیو پائز لەگەڵ سانتاندر کە بە فەرمانی ژەنەراڵ بۆ دۆزینەوەی رێگە چارەیەك کردبوویان ئالری بەرگری لە سانتاندر کرد. ژەنەراڵ ماوەی چواردە مانگان وازی لێهێنا .

دەسەڵاتی هیچ کەسێك لەوان جێگای نکۆڵی لێکردن نەبوو. مەسەلەی گرنگ ئەوەبوو کە ژەنەراڵ لەبەرانبەری ئەواندا ئاگاداری پارسەنگی توانای خۆی نەبوو و هەرچەندەی پتر هەوڵیدەدا میهرەبانبێ و لێیانەوە نزیکبێ ئەم دەسەڵاتە زیاتر بەدەردەکەوت. بەڵام ئەو شەوە کە خۆزەپالاسیۆس لەمەڕ ورەی ئەفسەرانەوە قسەی بۆ کرد. ژەنەراڵ بەبێ ئەوەی باشتربێ لەیەك ئاستدا یاریکرد. بەبێ ئەوەی هیچ نارحەتییەك دەرخا دەیدۆڕاندو ئەوەندەی درێژە بە یاریەکەدا تا ئەفسەرەکان خۆیان خۆیان دابەدەستەوە.

دیاربوو کە لە بێبەهرەییەکانی ڕابردوویان دڵتەنگ نەبوون. ئەو هەستی شکست خواردنە کە تا لە دوای سەرکەوتنیشیان لەجەنگدا هەر هەستیان پێدەکرد. بەڵام بایەخێکی نەبوو بۆیان. زەمانێکی زۆر تێدەپەڕی تا ژەنەراڵ پلەکانیان بەرزکاتەوە، هیچ یەکێك لەوان ئەو هەموو نارەحەتیانەی لا گرنگ نەبوو کە هەموو دەم بەر بارگەو ماڵەکانیان بەکۆڵێوەوە بوو . دادگا مووچەی مانگانەی نیزامیەکانی زۆر کەمکردبۆوە. هەمان بڕە پارەش هەمیشە بەسێ مانگان دەدراو بە شێوەی کۆپۆنی حکومەتی بوو کە خەرجکردنیان بارێکی ڕۆشنی نەبوو. هەموویان ئەم کۆپۆنانەیان بە نرخێکی کەمتر بە گۆرانیبێژ و مۆسیقیەکان دەفرۆشتەوە. بایەخیان بەوەش نەدەدا کە ژەنەراڵ بەجۆق و کەڕەنا لە وڵات بڕواتە دەرێ و ئەوانیش لەبەرانبەری دوژمنان رەق بەجێهێڵێ، هیچ یەکێك لەم شتانە بایەخی نەبوو، شکۆ و گەورەیی هەمیشە لەو کەسانی دیکە بوو. تەنیا مەسەلەیەکی لەتوانای ئەوان بەدەر بوو . نەبوونی دڵنیاییەك بوو کە ژەنەراڵ لەو کاتەوەی کە بڕیاری بەجێهێشتنی وڵاتی دابوو، لەواندا پەیدایکردبوو، هەرچەندەی ئەم سەفەرە بێئەنجامەی درێژەی دەکێشا، توانای دان بەخۆداگرتنی ئەم بارەش دژوارتردەبوو. ئەو شەوە ژەنەراڵ بەجۆرێك خۆشحاڵ بوو کە لە کاتی حەمامکردن بە خۆزەپالاسیۆسی وت هەتا سێبەرێکیش نێوانی ئەو و ئەفسەرەکانی جیاناکاتەوە. لەگەڵ ئەمەدا، خودی ئەفسەرەکان وایان بیردەکردەوە کە نەیانتوانیوە هەست و قەدرزانی ئەو بۆخۆیان ڕاکێشن، بەڵکە پتر بوونەتە هۆی نەهێشتنی دڵنیایی لەلای ئەو خۆزەماریا کارنیۆ لە هەمووان پتر لەگەڵ ئەم بۆچونەدا بوو، لەو شەوەوە کە لەناو بەلەمەکەدا لەگەڵ ژەنەراڵ قسەی کرد، خۆی لە هەمووان بەدوور دەگرت و بەبێ ئەوەی خۆی ئاگای لێبێ، دەنگۆی پەیوەندی لەگەڵ جیاخوازانی ڤەنزویلا زێتر بەهێزدەکرد، چوار ساڵ پێشتر ژەنەراڵ ئەوی هەروەك ئالری مونتیجا بریسنیو مندز و سانتاناو زۆرانی دیکەشی لە دڵی خۆیدا بردبوونەدەر، چونکە گومانیکردبوو کە دەیانەوێ بۆ خۆشەویستکردنی خۆیان سوپا خراپ بەکاربهێنن . وەك ئەو ڕۆژگارەی زوو هێشتاش ژەنەراڵ بەدوای ئەو کارانەدا دەچوو، گوێی بۆ دژە پڕۆپاگەندە رادەداشت و لەدوای دۆزینەوەی تروسکاییەك ڕاستیدا بوو، تا لەم بارە خراپەدا دوو دڵیەکانی بە تەواوی پێبگەن.

شەوێك ژەنەراڵ لە ژوورەکەی تەنیشتیەوە گوێی لە دەنگی کارنیۆ بوو دەیگوت لە پێناوی رزگاری و سەلامەتی وڵات ئەگەر پێویستبکا بۆتهەیە ناپاکیش بکەی، لەگەڵ ئەمەدا هیچ کاتێك بۆیدەرنەکەوت کە ئەو نووستبوویان بە ئاگابوو، ئەو شەوە ژەنەراڵ دەستی کارنیوی گرت، بردیە حەوشە و بە زمانە جادوییەکەی فریویدا، کارنیو ددانی بەراستیدا هێنا، کە زۆر نارحەتبوو لەمەی کە ئەگەر ژەنەراڵ تەواوی کارەکانی لەم وەختەدا رەها بکاو نیگەرانی ئەنجامەکەی نەبێ، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا وەفادار بوو، لەم سەفەرە تاریکەی ئەوەندە بەدوای رووناکیدا گەڕابوو کە ماندووببوو و چیدی بەبێ ئەوەی ورەی خۆی نوێ و بەرزبکاتەوە نەیدەتوانی چیدی بژی و لەبەرئەوە بڕیاریدا بوو کە بەرەو ڤەنزویلا رابکاو لەوێ لە پێناو یەکێتی وڵاتدا بجەنگێ.

کارنیۆ وتی "کارێکی لەوە بەشەرەفانەترم بە خەیاڵدا نایە."

ژەنەراڵ پرسی: "ئایا تۆ وا دەزانی کە لە ڤەنزویلا چارەنووست باشتر دەبێ؟"

کارنیۆ نەیوێرا بڵێ بەڵێ.

گوتی: "باشە، خۆ هەر نەبێ ئەوێ نیشتمانمە."

ژەنەراڵ گوتی: "ئەوەندە گەمژە مەبە، تێکڕای ئەمریکا وولاتی ئێمەیەو بۆ ئێمە هەموو جێگایەك وەك یەکە."

ژەنەراڵ رێگای نەدا کە کارنیۆ قسەیەکی دیکە بکا. دەمێکی چاك قسەی لەگەڵدا کردو لە هەموو چرکەساتێك هەوڵیدەدا ئەوەی کە لە دڵیدا بوو، بۆ کارنیۆی هەڵڕێژێ ئەگەر چی هیچ کاتێك نە ئەو و نەهیچ کەسێکی دیکە نەیانزانی کە ئایا ژەنەراڵ ئەوەی بەدڵ دەیگوت هیچ راستی تێدایە. سەرئەنجام دەستێکی لە پشتی دا و لەناو دالغە و خەیاڵەکانی خۆیدا بەجێهێشت.

ژەنەراڵ وتی: "کارنیۆ قسەی بێ سەرو بەر مەکە. هەرچی بوو ئیدی تەواو بووکۆتایی هات .

# (٦)

ڕۆژی چوارشەممە شانزەی حوزەیران ژەنەراڵ هەواڵی پێگەیشت دەوڵەت ئەو مانگانەی کە ئەنجوومەن بۆی بڕیبۆوە، پەسندی کردووە ، نامەیەکی توانج و پلاراوی بۆ مۆسکرا نووسی و تێیدا لەوە ئاگاداریکردەوە و لەکۆتاییدا بە بەکارهێنان و سوودوەرگرتن لە ڕاناوی بەکۆمەڵ و بە جۆرە دڵنیاییەکەوە کە خۆزەپالاسیۆس لاسایی دەکردەوە بە فرنانەدۆی وت: "ئێمە دەوڵەمەندین."ڕۆژی سێ شەممە بیست و دووەمی هەمان مانگ گوزەرنامەکەی وەرگرت، گوزەرنامەکەی لە هەودا بادەدا و دەیوت: "ئێمە ئازادین."دوو ڕۆژ دواتر، دوای شەوێك خەولێزران کاتێ هەڵسان گوتی: "ئێمە غەمبارین."هەمان ڕۆژ کەلکی لە هەوای فێنك و هەوراوی وەرگرت و بڕیاریدا بەرەو کارتاخنا بڕوا. تەنیا فرمانێکی دەرکرابوو ئەمەبوو کە ئەفسەران و هاوڕێکانی بەبێ جلوبەرگی سەربازی و بێچەکبن. هیچ شتێکی ڕوونکردەوەو نیشانەیەکیش نەبوو کە بتوانرێ هۆی ئەو کارە بزانرێ هەتا دەرفەتی خواحافیزی بەهیچ کەسێك نەدا. هەر لەگەڵ ئامادەبوونی ئەفسەرەکانی بۆی جما و کەلوپەل و ئەوانیدیکەی بەجێهێشت. تا لە دواییدا بەدوایاندا بێتەوە.

ژەنەراڵ بەعادەت لەسەفەرەکانیدا چەند لەسەر وەستانێکی هەبوو تا لە بارو گرفتەکانی خەڵکی ئاگاداربێ. لەبارەی هەموو شتێکەوە پرسیاری لێدەکردن. تەمەنی منداڵەکانیان، جۆری نەخۆشیەکانیان، باری کاروکاسبیان و بە کورتی لەسەر هەر شتێکی کە بەمێشکدا دەهات. بەڵام ئەمجارە ورتەی لێوە نەهات پەلەپەلیشی نەکرد، نەشکۆخی هیچ نیشانەیەکی نەخۆشی و ماندوویی تێدا نەدەدیترا، هەموو ڕۆژەکەی بەپەرداخێك شەراب بەسەربرد. دەوروبەری سعات چواری دوای

نیوەڕۆ بوو کە ڕاهیبە خانەیەکی کۆن لەسەر گردێکەوە لە ئاسۆدا بەدیارکەوت. کاتی وێرد و دوعا خوێندن بوو مرۆڤ وەك ڕێچکەی مێروولە لەسەر ئەو ڕێگایەدا دەهاتنە بەرچاوو لە گردەکە سەردەکەوتن. چەند چرکەیەك دواتر بازاڕی شار ، لە دوورەوە دیترا ، لەگەڵ بەدەرکەوتنی شورەکانی شار، ژەنەراڵ ئاماژەی بۆ خۆزە ماریا کارنیۆ کرد کە بێتە پێشتر، کارنیۆ هاتە پێشێ. ژەنەراڵ پاڵی بە بازوە بڕاوەکەی ئەو داوەو بە دەنگێکی کزەوە گوتی: "کارێکی گرنگ و نهێنیم بە ئێوەیە."دوایی پێی گوت: "هەر لەگەڵ گەیشتینە ئەوێ لە سوکرە بتۆژەوە بزانە لە کوێیە؟"وەك هەموو کات و بۆ خوا حافیزی دەستێکی لە پشتیدا و گوتی:

"هەڵبەتە ئەمە تەنیا لە نێوان خۆماندا دەبێ."

زەلامێکی زۆر بەسەرپەرشتی ژەنەراڵ مۆنتیجا لەسەر ڕێگا چاوەڕێی ژەنەراڵ بوون و ژەنەراڵ ناچار پاشماوەی ڕێگاکەی بە گالیسکەیەکی کۆندا بڕی کە فەرمانڕەوای ئیسپانی ناوچەکەی تێدا بوو چەند ولاغێك ڕایاندەکێشا. لەگەڵ ئەوەی کە ڕۆژئاوا دەبوو بەڵام دەتگوت کۆردەرەکانی دەوری شار، بە باوەشە چڵەدارو درەختی کەرناوە[1]جۆشی دەخوارد و بۆ گەنیەکانیان تا لە بۆنی ئاوەرۆکەی شاریش کە سەدەیەك بوو زبلدان و شوێنی زبڵدان و خاشاکی گەڕەك و ئاو دەستە پیس و خوێنی قەسابخانەکان بوو، زۆرتر بەرلووت دەکەوت. کاتێك کە لە دەروازەی شار کە مەدیالونا یان ناودەبرد، هاتنە ناوەوە، بایەکی توند لە باڵ کوتانی قەلە ترساوەکان بەو ناوەدا بڵاودەبۆوە. ترسی ئەو سەگە هارەی کە بەیانی ئەو ڕۆژە چەندین کەسی گرتبوو. هێشتاش باڵی بەسەر شارەکە داکێشابوو. ئەم سەگە کەهی ژنێکی سپی پێستی خەڵکی کاستیل بووەو لە شوێنێك بووە کە نەدەبووە لەوێبێ و چەند منداڵی گەڕەکی کۆیلەکانی گرتبوو، سەرەنجام ئەو منداڵانە توانیبوویان کە بە گاشە بەردان پەکی بخەن. لاشەکەی بەدرەختێکی قوتابخانەوە هەڵواسرابوو، بەڵام ژەنەراڵ مۆنتیجا فرمانیدا لەبەر باری تەندروستی و ڕێگرتن لەبەکارهێنانی لاشەکە لە کاری جادوگەریدا دەم و دەست بیسوتێنن.

ئاپۆڕایەك لەگەڵ دەستەیەك مۆسیقاژەن ڕژابوونە ناو شەقام. پاشنیوەڕۆیانی مانگی حوزەیران، ڕۆژ درێژ ترو هەوا سافتر دەبوو، لە هەیوانە پڕ لە گوڵەکانەوە، ژنان بە جلوبەرگی ڕازاوە و ڕەنگاورەنگ دەدیتران، دەنگی ناقوسی کڵێسای گەورە و دەنگی مۆسیقا و زرمە زرمی تۆپخانە وەك ڕێزلێنان تا دەریای دەهێنا لەرزە. بەڵام هیچیەکیان نەیاندەتوانی لەو هەموو

---

[1] کەرناز جۆرە درەختکە

هەژارییە کەمکەنەوە کە هەوڵی شاردنەوەیان دەدا. ژەنەراڵ لەناو ئەو گالیسکە کۆن و شەق و شڕەوە بەتەکاندانی کڵاوەکەی سڵاوی لە خەڵکی دەکردو لەو کاتەدا خۆی لە نێوان ئاپۆڕایەك لە خەڵکی هەژاردا دەدیت. ئەو پێشوازیە ناچیزەی لەگەڵ ئەو پێشوازیەی ئابی ١٨١٣ کاراکاس بەراورد دەکرد. لەو رۆژەدا تاجێکیان لە گەڵاو گوڵی ڕازاوە لەسەرنابوو و گالیسە جوانەکەیشی کە شەش کچ لە جوانترین کچەکانی شار رایاندەکێشا. خەڵکی لە خۆشیاندا فرمێسکیان هەڵدەڕێژت. ئەو رۆژە بوو کە ناوی جاویدانەی ئازادی بەخشی پێوە لکا.

وا دەهاتە بەرچاو کە ئەمەیان و ئەوەیان یادەوەری دوو ژیانی لێکجیان باژێری قەشەنگ و ئەفسانەیی کارتاخناد ئیندیاس کە چەندین جاران ببوو بە پایتەخت و جوانیەکەی ناوبانگێکی جیهانی بە تاڵان هێنابوو هیچ شتێکی لە هی جاران نەدەچوو. نۆ جاران لە دەریا و زەویەوە هێرشی کرابووە سەر و چەندین جار رێگرە دەریاییەکان تاڵانیان کردبوو، بەڵام هیچ یەکێك لەو کارەساتانە وەك جەنگی سەربەخۆیی و دوای ئەو زۆرانبازی ناوگرووپ و دەستەکان لە نێو خۆدا ئەم باژێرەی کاولنەکردبوو.

خانەوادە دەوڵەمەندەکان لەشار ڕایانکردبوو. کۆیلەکان دەستیان دابووە ئازادیەکی بێبەر و هەژاران کۆشکی ماڵە دەوڵەمەندانیان داگیرکردبوو. تەلارەکان ئەوەندە پیس و داپڕژاو ببوون. کە مشکی هێندەی پشیلەیەکیان لێ دەردەپەڕیە سەر شەقامەکان. لەو بنکەی "روانگە"[١] ەوە کە فیلپی دووەم لەسەر زوورگی ئاسکوریال دروستیکردبوو شوێنەواری نەمابوو، لەسەدەی حەڤدەمدا کارتاخناد گەورەترین بنکەی بازرگانیبوو، بەڵام ئیمرۆ لە چەند دوکانێکی بەو لاوە تێدا نەمابۆوە مەزنی و گەورەیی رابردووی شارەکە لەگەڵ بۆنی گەنیوی کە لە ئاوەڕۆ و کۆردەرەکانەوە هەڵدەستا. هیچ رووێکی وێکچویان لە نێواندا نەمابوو ژەنەراڵ ئاهێکی هەڵکێشا و بەبەرگوێی مۆنتیجای دا چرپاند: "ئەم سەربەخۆییە نەفرەتلێکراوە زۆر گران تەواو بووە!"ئەو شەوە مۆنتیجا لە ماڵە خانەوادانانیەکەی لە شەقامی لافاکتۆریا کە پێشتر هی مارکز ڤالدی هویوس بوو، هەموو کەسە ناسراوەکانی شاری کۆکردبۆوە لە ماڵە گەورەکانی شاردا چرا هەڵکرابوون. بەڵام ژەنەراڵ دڵی پێیان خۆشنەبوو، چونکە دەیزانی لەناوچەی کارائیب هەررووداوێك هەتا مەرگی کەسێك دەبێتە ئاهەنگێکی گشتی خەڵکی. لە راستیدا ئەمەشیان ئاهەنگێکی بەدرۆ بوو. چەند رۆژان لەمەوبەر لە هەموو لایەکەوە پرۆپاگەندەو ئاگاداری و

---

١ بنکەی روانگە: دیارە دەبێ روانگی ئاسمان بێ.

دروشمی دژی دەوڵەت دەدیتراو پارتە ناڕازی و لایەنگرانی خۆی هاندابوو کە تەواوی شووشەکان بشکێنن و بە تێلاو بەرچیغان بە کوتك و داران دژی پۆلیس راپەڕن. مۆنتیجا بە سوعبەتچێتیە هەمیشەییەکەیەوە ئەوەیدەزانی کە ئەم ئاژاوە لە دژی ئەوە و پارتی ئۆپۆزیسیۆن هیچ ناڕەزاییەکی لە ژەنەراڵ نییە، گوتی: "سوپاس بۆ خوا کە شووشەیەك نەماوە تا بیپشکێنن."پاسەوانەکانی زۆرترکردن، تێپەڕینی بەو ناوچەیەدا قەدەغەکرد، و ئەوەشی ڕاگەیاندو فرمانیدا هیچکەس باسی باری شێواوی شەقامەکان بۆ میوانەکانی نەگێڕێتەوە. ئەو شەوە کۆنت رائیجکۆرت چووە دیدەنی ژەنەراڵ و ئاگاداریکردەوە کە کەشتی بچووکی ئینگلیزی لە بورجی کۆشکی بوکاچیکاوە دەدیترێ، بەلام نەدەبوو ژەنەراڵ بەو کەشتیە بڕوا. هۆیەکەی کە بە هەمووانی وتبوو لەبەرئەوە بوو کە نەیدەویست بەسەرانسەری ئۆقیانوس دا لەگەڵ تاقمێك ژندا بخولێتەوە و کە دەبووایە لەگەڵیاندا لەناو ژوورێکدا بێ.

بەلام راستی ئەمەبوو کە لەگەڵ نانخواردنی نیوەڕۆ لە تۆرباکۆ چوون بۆ شەڕەکەڵەشێرو کاریدیکە، ژەنەراڵ نەیتوانیبوو نەخۆشی خۆی لە کۆنت بشارێتەوە کۆنت بیریدەکردەوە کە رەنگە ورەو چالاکی ژەنەراڵ توانای ئەم سەفەرەی وەبەربدا ، بەلام لەشی ئەو توانایەی تێدانەبوو و کۆنت بەهیچ جۆرێك نەیدەویست بۆ مەرگ دان بە داوەوە بکا. لەگەڵ ئەم شتانەشدا ئەو شەوە نە ئەم هۆیەو نە هیچ هۆیەکی دیکە بۆ گۆڕینی بیروڕای ژەنەراڵ کارینەکرد.

مۆنتیجا خۆی بە دەستەوەنەدا. میوانەکانیشی زووتر بەرێکرد تا ژەنەراڵ بتوانێ کەمێ بحەوێتەوە. بەلام ماوەیەکی زۆر خۆی لە هەیوانەکە چاوەدێریکردو لە هەمانکاتدا کچێکی زۆر نەشیملانەی باریکەلە بە ئامێری چەنگ حەوت ئاوازی عاشقانەی بۆ ژەنی ئەو کیژۆلە ئەوها ناسك و شیرین دەیژەنی کە هیچیەکێك لەو دووانە تا ئەو کاتە کە شنەی با دوا زەڕاتی نوزەی ئەو مۆسیقایەی بلاوکردەوە، هەتا ورتەشی لەبەرەوە نەهات، ژەنەراڵ خەواڵوو لەسەر کورسیە رحەتەکەیەوە دانیشتبوو لە جیهانی شەپۆلاوی چەنگەکەدا مەلەی دەکرد کە لە پڕ بەخۆهاتەوەو بەدەنگێکی کز ، بەلام روون و ئاشکرا دوا ئاوازی ئاهەنگەکەی لەژێر لێوانەوە وتەوە، لە کۆتاییدا سەری بەرەو مۆسیقاژنەکە وەرگێڕا تا سوپاسی بکا. بەلام تاکە شتێکی کەدیتی ئامێرێکی چەنگ بوو و لەگەڵ تاجێکی لە گوڵی ژاکاو لە دواییدا پاسەوانەکە باسەکەی بەبیرهێناوە.

وتی: "لە ئاواندا کەسێك لەبەرئەوەی بەرگری لە خۆیکردوە زیندانیکراوە مۆنتیجا پێکەنی و پرسی: "قۆچەکانی چرەنگێکن!"

ژەنەراڵ خۆی لەم قسەیە کەڕ کردو هەموو کەلوبەری باسەکەی، جگە لەپەیوەندی خۆی لەگەڵ میراندا لینسی لە جامایکا ، بۆ مۆنتیجا روونکردەوە، دوایی مۆنتیجا رێگا چارەیەکی پێشنیازکرد.

گوتی: "دەبێ داوابکا لەبەرنەخۆشی ئەو بۆ ئێرە بگوێزنەوە، هەر کە دەگاتە ئێرە، ئێمە خۆمان کارەکەی دیکە دەگرینە دەستمان."

ژەنەراڵ پرسی: "ئایا ئەمە لە تواناداا هەیە؟"

مۆنتیجا وەڵامیداوە: "لە تواناداا نییە."بەڵام ئێمە هەر دەیکەین."

ژەنەراڵ بێئەوەی گوێبداتە حەپەحەپی سەگان کە لە ناکاو دەستپێکردبوو، چاوەکانی داخستەوە، مۆنتیجا وایزانی کە خەویلێکەوتووە، دوای ئەوەی تا درەنگانێ لەناو بیرکردنەوە دابوو، چاوەکانی کردەوە و باسەکەی دووبارە و تاو و توێکردەوە.

سەرەنجام گوتی: "قبوولمە، بەڵام هیچ نازانم."

تەنیا لەو کاتەدا بوو کە ژەنەراڵ گوێی لێبوو وەڕە وەڕی سەگان لە هەموو لایەکی شار هەستا، ژەنەراڵ مۆنتیجا بۆی روونکردەوە کە بۆ بەرگرتن لەبڵاوبوونەوەی هاری، سەگەکانی شار ژەهرانخواردو دەکەن. تەنیا دوو منداڵیان لەوانەی سەگ قەپاڵی لێدابوون دۆزیوەتەوە، ئەوانیدکە یان دایك و بابیان دەیانشێردنەوە تا لەبەردەم خوایەکانیاندا بمرن و بۆیان ببنە قوربانی ، یان بۆ کۆردەرەی ماریال ئاباخایان دەبردن،تا لەوێ دەوڵەت دەستی پێیان نەگا و جادوگەران چاکیان کەنەوە.

ژەنەراڵ دژی کوشتاری ئاژەڵان نەبوو، بەڵام ژەهراویکردنی سەگان بەڕای ئەو کارێکی نامرۆڤانە بوو. سەگەکانیشی هێندەی ئەسپ و گوڵەکان لاخۆشەویستبوو، کاتێك کە بۆ یەکەمجار بەرەو ئەوروپا دەڕۆیشت، جووتە توولە سەگێکیشی لەگەڵ خۆیدا بردبوو، سەردەمێك کە لە ڤەنزویلاوە بە خۆو چوار سەد کەسی پێخاوسی لە پێناو ئازادکردنی نوئباگراناداو دامەزراندنی کۆماری کۆلۆمبیا چیاکانی (ئاند) یان کوتاوە. دە سەگیشی لەگەڵدا بوون. هەمیشە لە جەنگەکاندا لەگەڵ خۆیدا دەبردن، بنادۆ، ئازاترینیانبوو هەر لە رۆژی یەکەمی جەنگی سەربەخۆییەوە لەگەڵ ژەنەراڵ بوو، جارێك ئەو سەگە بەتەنیا بیست سەگی دڕندەی سووپای ئیسپانیای لە خرتۆڵێ وەردان و کوشتنی و سەرەنجام لە جەنگی کارابویو[1] بەنێزە لە

[1] کارابویو : ئاستانێکە لە ڤەنزویلا

پەلو پۆخرا. مانوێلا سئزیش لە لیما، جگە لە ئاژەڵی جۆراو جۆری دیکە. سەگەلێکی هەبوو کە لە ماڵێك لە ماگدالینادا بەخێویدەکردن کەسێك بە ژەنەراڵی وتبوو کە هەرکاتێك سەگێك دەمرێ، دەبێ بەخێرایی سەگێکی لە وێنەی ئەو بە هەمان ناو لە جێگای ئەو دابنرێ تا جێگاکەی لە مێشکی ئێمەدا چۆڵ نەبێ، بەڵام ژەنەراڵ لەگەڵ ئەم بۆچوونەدا نەبوو، ئەو هەریەکە یانی لەبەرهۆو شێوەی جیاوازیان خۆشدەویست و مردنی هەر یەکێکیشیان کاریگەری جیای لەسەر ئەو هەبوو. لە شەوی ناخۆشی بیست و پێنجی ئەیلوول لە کاتی ژماردنی سەگە کوژراوەکان دوو دانەیشیان کە ئاژاوەچیان سەریانبڕیبوو، حسێب کران. ئێستا لە دوا سەفەریدا تەنیا دووسەگی بۆ مابۆوە لەگەڵ سەگێکی نیوەگیان کە لە رێگادا خۆی کوتابووە ناو بەلەمەکەوە.

وەختێ کە مۆنتیجا بە ژەنەراڵی وت تەنیا لە رۆژی یەکەمدا پەنجا سەگیان دەرمانخواردکردووە، ئەوا ئەو ورەو کەیفە خۆشەی بەهۆی گوێگرتن لە ئاوازی چەنگەکە وەبەریداهاتبۆوە تێکچو.

مونتیجا زۆر داخی خواردو گفتیدا کە ئیدی سەگ نەکوژن، ئەم گفتە ئەنجامی هەبوو و ژەنەراڵ ئارامبۆوە. هەڵبەتە. کە بیری لێدەکردەوە لەبەرئەوەی نەبوو. کە قسەکەی جێبەجێ بکرێ، بەڵکە لەبەرئەوەی بەردەوام نیازی خێروچاکەی ژەنەراڵەکانی بۆ ئەو جۆرێك بوو لە پشت ئەستووری. جوانی شەو هەموولایەکی داگرتەوە. لەحەوشەی ماڵێدا بۆنی گوڵە یاسەکان دەهاتە بەرکوونەکەپوان ئاسمان هەر دەتگوت ئەڵماسە دەبریسکێتەوە و لە هەموو وەختێك پتر ئەستێرە دەدیتران، ژەنەراڵ پێش ئەوەش لەبارەی ئەو جێیەوە وتبووی: "دەڵێی ئەندەلوسە لە نیساندا."بایەکی پێچەوانە دەنگی حەپە حەپی سەگان و بۆن بۆگەنی لەگەڵ خۆیدا راماڵی.

مۆنتیجا بە پاڕانەوە وتی: "ژەنەراڵ لێرە مەڕۆن"

ژەنەراڵ وتی: "کەشتی لەبەندەرە."

مۆنتیجا گوتی: "کەشتی دیکەش دەبن."

ژەنەراڵ وتی: "جیاوازیەکی نیە، هەموویان دواکەشتی دەبن."

ژەنەراڵ یەك تۆزقاڵیش بۆچوونی خۆی نەگۆڕی، دوای پاڕانەوەیەکی زۆر، بۆ مۆنتیجا رێگایەکی دیکە نەمابوو جگە لە ئاشکراکردنی رازێك کە سوێندی پێخواردبوو تا ساتی رووداوەکە قسەکەی نەکا، لە سانتافە ژەنەراڵ رۆفائل ئۆردانتا لەگەڵ ئەفسەرانی پارتی بولیڤار،

بۆ ڕۆژەکانی یەکەمی ئەیلوول، شۆڕشێکیان ڕێکخستبوو، بەڵام بە پێچەوانەی ئەوەی مۆنتیجا چاوەڕێی دەکرد، ژەنەراڵ زۆر سەرسام نەهاتە بەرچاو.

ئەو گوتی: "ئاگادار نەبووین."بەڵام پێشبینی کردنی کە کێشە نەبوو، مۆنتیجا وردەکاری نەخشەی شۆڕشەکەی، کە تا ئەو سەردەمە بە دەستی تەواوی دانیشتوانی سەربازگە وەفادارەکە گەیشتبوو، بۆ ژەنەراڵ باسکرد، ژەنەراڵ لەو بارەوە زۆری بیرکردەوە و وتی: "بۆ من ناوەرۆکێکی نییە، ئەگەر ئۆردانتا بەراستی مەبەستی چاککردنەوەو ڕێکخستنەوەی وڵاتە، دەبێ لەگەڵ پائز بگاتە سازشێك و مێژووی پانزە ساڵی دوایی لە کاراکاسەوە تالیما دووبارە بکاتەوە. لەوێوە بەدواوە تا پاتاگونیا ئیدی هەروەك ئاو خواردنەوەیە."لەگەڵ ئەمەشدا بەر لە نووستن ئومێدی بە مۆنتیجادا. لێی پرسی: "ئایا سوکرە ئاگادارە؟"

مۆنتیجا وەڵامیداوە: "دژی ئەم پلانەیە."

ژەنەراڵ وتی: "دڵنیام لەبەر ئەوەیە کە ناکۆکی لەگەڵ ئوردانتا هەیە."مۆنتیجا وتی: "بەمشێوەنییە، بەڵکە لەگەڵ هۆکارێکی کە ڕێگر بێ لەبەردەم چونی بۆکیتۆ ناتەبایە."

ژەنەراڵ گوتی: "بەهەرحاڵ ئەو کەسەی کە دەبێ قسەی لەگەڵ بکەی سوکرەیە، قسەکردن لەگەڵ من کات بە فیڕۆ دانە."

لە ڕواڵەتدا قسەی دوایی بوو. بەیانی زووەکەی ڕۆژی دواتر فرمانی بە خۆزەپالاسیۆسدا ئەگەر کەشتی لە کەنداوەکەیە تەواوی کەلوپەلەکان بکاتەوە و کەسێکی نارد تا داوا لە کەشتیوانەکە بکا کە بەرانبەری قەڵای سانتۆدۆ مینگۆ لەنگەر بگرێ تا ئەو بتوانێ لەبەر هەیوانیماڵێوە بیبینێ. فرمانەکان زۆر وردبوون و لەوێ کە بە هیچیەکێك لە ئەفسەرەکانی نەوتبوو کە کامیان لەگەڵ خۆیدا دەبا.

هەموو وایان بیردەکردەوە کە ژەنەراڵ بە تەنیا دەڕوا. بەڵام ویلسۆن بەپێی بڕیارێکی کە لە حوزەیران لەگەڵ ژەنەراڵ دابوویان، پێشوەخت و بەبێ پرس و ڕا لەگەڵ کەسێکدا کەلوپەلەکانی بۆ کەشتیەکەبرد. کاتێك کە شەش گالیسکەی پڕ لەکەلوپەلەکانی ژەنەراڵ لە شەقامەکاندا بەرەو کەنداو دەڕۆیشتن، هەتا کەسانێکی کە هەرگیز باوەڕیان نەدەکرد کە بڕوا، چون تا خواحافیزی لە ژەنەراڵ بکەن. لەو نیوەڕۆ خوانەی کە سازیانکرد، کۆنت ڕائیجکۆرت لەگەڵ کامیل لە دەستەی میوانە شایانەکان دابوون، کامیل لاوتر دەهاتە بەرچاو، قژی خۆی لەگەڵ گوڵ وەك کەزی هۆنیبۆوە و بەرگێکی درێژی ڕەنگ سەوزی لەبەرکردبوو سۆلی بەهەمان ڕەنگی لە پێدابوو، ژەنەراڵ نارحەتی خۆی لە بەرچاوی ئەو شاردەوە.

ژەنەراڵ بە ئیسپانی گوتی: "کەیبانو دەبێ زۆر لە جوانی خۆی دڵنیابێ کە رەنگی سەوز یان هەڵبژاردوە."

کۆنت بەخێرایی ئەم رستەی وەرگێڕا و کامیل دایە حلیتەی پێکەنین کە لە هەموو ماڵەکەدا دەنگیداوە و هەوای پڕ لە بۆنی ئەو شوکولاتەکرد کە دەیخوارد.

کامیل وتی: "دۆن سیمۆن، دووبارە دەسپێنەکەنیەوە."شتێك لە هەردووکیاندا گۆڕابوو، لەبەرئەوەی هیچیان بۆ ئەوەی کە یەکدی نارحەتنەکەن، پرسیار و وەڵامی ددانشکێنی جاری یەکەمیان دەستپێنەکردەوە. کامیل ئەوی لەبیرکردو بۆ نیشاندانی دەسەڵاتی خۆی بەسەر زمانی فەرەنسی، لەنێوان کۆمەڵە خەڵکەکە دەرۆیشت و دەیدواندن، ژەنەراڵ رۆیشت و لەگەڵ باوکی روحانی سباستیان دێ سیگوئنزا کەوتە قسە، پیاوێکی پیرۆزبوو و لەبەر چاککردنەوەی ئاوڵەی هۆمبولت لە کاتی تێپەڕینی بەم شارەدا، خاوەنی رێزێکی تایبەتی بوو، بەڵام خۆی تەنیا کەسێك بوو کە بایەخی بەم باسە نەدەداو دەیگوت: "خواوەند وایداناوە کە دەستەیەك ئاوڵەدار بمرن و دەستەیەکی دیکە بژین و هومبولت لەم دەستەی دووەمە دابوو."

ژەنەراڵ کەبیستبووی ئەو سێسەد نەخۆشی جیاجیا چاکدەکاتەوە. لە سەفەری پێشوویدا دەیویست بیبینێ. بەڵام لەو کارەیدا سەرنەکەتبوو کاتێك کە خۆزەپالاسێوس لەبەندەر گەڕاوە و هەواڵیهێنا کە کەشتی دوای نانی نیوەڕۆ دێتە بەرانبەری قەڵا. مۆنتیجا رێورەسمی خواحافیزیەکی سەربازی ئامادەکرد. لەبەرئەوەی هەتاوی مانگی تەمموز گەرم بوو، مۆنتیجا فرمانیدا گالیسکەیەکی بەسایەبان ئامادەکەن تا ژەنەراڵ بە ئارامی بتوانێ ماوەی نێوان قەڵای دۆمینگۆ تا بەندەر ببڕێ. سەر لە سعات یازدە کاتێك کە مێزیان بە خۆراکی جۆراو جۆری خۆجێیی رازاندەوە ماڵەکە پڕاو پڕ لە میوانانێك بوو کە لەبەر هاڵاوی گەرما دڵە کوتکەیان گرتبوو، کامیل لەم هەموو جێگایەی کە هێنابووی بردیەوە ئەوێ و لەوێ خواحافیزیان لەگەڵ یەك کرد، پاشدا ژەنەراڵ قاپە خواردنە دەستلێنەدراوەکەی لەناو پەنجەرەکە داناو گەڕاوە جێی پێشوی. هیچ کەسێك تێنەگەیشت کە کەنگینێ و بۆچی بڕیاریدا کە بەو کەشتیە سەفەرنەکا. بە نیگەرانیەوە گوێی دەدا قسەی سیاسەتمەدارەکان کە لە بارەی سیاسەت و قات و قڕی ناوخۆی ناوچەکە قسەیان دەکرد. لەپڕ بەرەو لای کۆنت رایچکۆرت گەڕاوە و بەبێ ئەوەی پەیوەندی بە بابەتەکەوەهەبێ ، بەشێوەیەك کە هەموو گوێیان لێبێی پێی وت:

"جەنابی کۆنت، ئێوە حەقتانە، بەم حاڵە داخاویەوە، لە کەشتیەکی بچووکدا ناتوانم لەگەڵ ئەم هەموو ژن و ژارە کات بەسەر ببەم."

کۆنت ئاهێکی هەڵکێشا و وتی: "بەم شێوەیە ژەنەراڵ."دوایی بەپەلە وتی: "لە باتیان حەفتەیەکی دیکە کەشتیەکی ئینگلیزی بەناوی شانون دەگاتە بەندەرەکەو پڕە لە ژووری جوان و پزیشکێکی زۆر پڕ ئەزموونیشی تێدایە."

ژەنەراڵ وتی: "دکتۆرێك لەسەد ژن خراپترە."

لە هەموو حاڵێکدا ئەم قسەیە لە بیانوێك بترازێ شتێکی دیکە نەبوو، لەبەرئەوەی یەکێك لە کارکەرانی کەشتی بچووك ئامادەبوو کە کابینەکەی خۆی تا جامایکا بۆ ژەنەراڵ چۆل بکا. خۆزەپالاسیۆس تەنیا کەسێك بوو کە بەڕستەیەکی بێکەم و کورتی بیانوەکەی ژەنەراڵی قبووڵ کرد: "هەرچیەکی کە گەورەی من بیری لێبکاتەوە، ئەوە تەنیا گەورەکەی منە کە هەموو شتێك دەزانێ."لەگەڵ ئەمانەشدا، بەهیچ جۆرێك نەیدەتوانی بەو کەشتیە سەفەربکا، لەبەرئەوە کاتێك بەرەو قەڵای سانتۆ دۆمینگۆ دەهات، قاچی لەبەردێکا هەڵزەلی و زۆری ئازار پێگەیشت. بەمجۆرە بەو مەرجەی کە لە ماڵی مۆنتیجا نەژی. لە شاردراماوە. جوانترین خانووی شار بوو، بەڵام لەبەرنزیکی لە دەریاوە شێی هەبوو. زۆری نارحەتی بۆ ژەنەراڵ دروست دەکرد، بەتایبەتی لە زستاندا کاتی لە خەو هەڵسان پەتۆ و لێفەکانی هەمیشە شێداربوون. هەوای وشك بۆ سەلامەتی ئەو زۆر بوو. مۆنتیجا لەم بارەوە گەیشتە ئەنجامێك کە ژەنەراڵ ماوەیەکی زۆر لێی پاڵدەداتەوە و بۆ ئامادەکردنی پێویستیەکانی ئەو پەلەی کرد، لە پاڵ چیای پوپا گەڕەکێك هەبوو کە خەڵکی کارتاحنا لە ساڵی ١٨١٥ خۆیان ئاگریان تێبەردا تاکو سەربازە ئیسپانیەکان کە دووبارە بۆ داگیرکردنی شارەکە هاتنەوە، نەتوانن ئەوێ داگیربکەن. بەڵام ئەم بەرگری و فیداکاریە سوودی نەبوو، ئیسپانیەکان قەڵای سانتۆدۆمینگۆیان لەدوای سەدو شانزە شەو و رۆژ دەورگرتن داگیرکرد و لەو ماوەیەدا خەڵکی ناو قەڵاکە تەنانەت تەخت و کەوشەکانی خۆشیان خوارد و پتر لە شەش هەزار کەس لە برسان لەناوچون، دوای پانزە ساڵ هێشتا هەتاوی داغ شایەدی مشکی و خۆڵەمێشی ئەم وێرانەبوو، یەکێك لەو چەند خانووانەی کە چاککرابوونەوە، هی بازرگانێکی ئینگلیزبوو کەناوی جوداکینگسلربوو ئەو رۆژانە سەفەری کردبوو، ژێر ساپتەی ساغ و دیوارە رەنگاوڕەنگەکانی ئەم خانووە و ئەمەش وەبگرە لەنێو جەنگەڵێك داری میوەدا پەنهان بوو، کاتی هاتنە ناو توورباکۆ سەرنجی ژەنەراڵی راکێشا. ژەنەراڵ مۆنتیجا بیریدەکردەوەکە ئەم خانووە لە توانای کرێچیەکی وا دانییە ، بەڵام ژەنەراڵ بەبیری هێناوە کە هەندێك کات لەناو نوێنی میرێك و هەندێجار بە پەتوێکەوە لەسەر زەوی نوستوە، بەمجۆرە بۆ ماوەیەکی دیارکراو ماڵەکەی بە تەخت و نوێنەوە، بەمەسینە و دەستشۆرەوە، شەش قەنەفەی چەرمی و دەزگایەکی دەستی دەلاندن کە

جەنابی کینگلسد مەی بۆ خۆی پێدروست دەکرد، بە کرێگرت ژەنەراڵ مۆنتیجا کورسیەکی رحەتی بەرگ مەخمەلی بۆ بردو فرمانیدا تا شوێنێکی گونجاو بۆ سەربازە پاسەوانەکان ئامادەبکەن. ماڵەکە لە ژێر قرچەی سوورە هەتاویشدا فێنك بوو و هەمیشە لە ماڵی مارکس بالداوجوی تەڕەشوعەی کەمتر بوو. چوار ژووری نوستنی رووناکی هەبوو کە پەنجەرەی باشیان تێدابوو هەوا گۆڕی چاکیان هەبوو و ئیگوانایەکی[1] زۆریان تێدابوو لەو ناوە هات و چۆیاندەکرد. پێخەوی بەربەیانانی پیاو کەمتر بێحەوسەڵەدەبوو لەبەرئەوە دەیتوانی گوێ بۆ تەرکینی میوەی گونابا[2] کە لە درەختانەوە دەکەوتنە خواریّ رادەگریّ ، پاشنیوەڕۆی ئەو رۆژانەی بە خورِ باران دایدەکرد، دەکرا لەوێوە خەڵکێکی لانەوازو بێخان و مان ببینیّ کە کەس و کارە خنکاوەکانی خۆیان بۆ راهیباتخانە دەبرد.

لەو کاتەوەی کە بۆ ماڵە نوێیەکەی گوێزایەوە، تەنیا سیّ جاران سەردانی قەڵای مۆنتیجای کرد و هەر لەو دیدارانەدا بوو کە ئانتونیو میوسی، وێنەکێشی ئیتاڵیایی کە بەکارتاخناد داتێدەپەڕی، هاتە سەر ئەوەی کە وێنەی دەموچاوی بکێشیّ. هێندە لاواز ببوو کە بۆ وەستان لەنێوانی گوڵە کێویلکەکان و ئەو زریق و باقەی مەل و چۆلەکان ناچار بوو لەسەر کورسی دانیشیّ. بەبیّ ئەوەی بتوانیّ لە سعاتێك زیاتر دەوامبکا، لەگەڵ ئەمەشدا دیاربوو کە وێنەکێش حاڵەتی دەردەداری دەموچاوی گۆڕیبوو. بەڵام دیسانەوە ژەنەراڵ دڵی بەم وێنەیە خۆشبوو، ماوەیەکی کەم بەر لە هەوڵی کووشتنەکەی مانگی ئەیلوول، رەسامێکی خەڵکی گرانادا کەناوی خۆزەماریا ئسپیونسا بوو وێنەی دەموچاوی ئەوی کێشا، بەڵام بەبۆچوونی ژەنەراڵ ئەم وێنە زۆر لە راستیەوە نزیك بوو و ئەوەندە تووڕە بوو کە رِقی ئەوی بە ژەنەراڵ سانتانای نووسەری پێشووی خۆی دارێژت.

پێی وت: "دەزانی ئەم وێنە بەکێدەچیّ؟ بە ئولاجا ئەو پیرەمێردەی کە خەڵکی لامسایە."

مانوێلاسئز کە ئەم قسەی بیست، زۆر حەپەساوو تووڕەبوو، چونکە ئولاجای دەناسی. بە ژەنەراڵی ووت: "من وای بۆ دەچم کە ئێوە چیدی پەیوەندیتان بە خۆتانەوە نەماوە، چونکە ئولاجا تەمەنی هەشتا ساڵە و دواجاری کە ئەوم دیت هەتا نەیدەتوانی لەسەر قاچان بوەستیّ."

---

١ ئیگوانا: گیانەوەرێکی خشۆکی وەك مارمێلکە.

٢ گونابا: میوەیەکی رەنگ زەردی تایبەت بە ئەمریکای باشورە ، هێندەی سێوێك دەبیّ.

ناوی وێنەکێشی کۆنترین دەموچاو نەدەزانرا، ئەمە وێنەیەکی ژەنەراڵ بوو لە تەمەنی شازدەساڵیدا لەمەدرید کێشرابوو، لە تەمەنی سی و دوو ساڵیدا لە هایتی وێنەیەکی دیکەی کێشرابوو و هەردوو وێنە بە وردی شێوەی ژەنەراڵیان تێدابوو، باپیرە گەورەی باوکی ژەنەراڵ ئەفریقایی بوو، ڕەگێکی ئەفریقاییانەش لە خوێنی ژەنەراڵ داهەبوو، ئەم میراتە بە جۆرێك لە قیافەتیدا دیاربوو کە خانەدانانی لیما ناویان لێنابوو ئالی زامبۆ[1]. بەڵام هەروەك کە شۆرەت و دەسەڵاتی بڵاودەبۆوە، وێنەکێشانیش کە نەژادی ئەویان تێدا وندەکردو چەهرەیەکی شیاویان پێدەدا، وەك پەیکەرێکی کە وێنەی لە ڕۆمی دەچوو بەویش نەدەچوو، بەڵام لە تەمەنی چلوپێنج ساڵیدا، لە کاتێکدا کە نەخۆشی پەکی خستبوو و ئەو هەوڵیدەدا ئەوە لە خۆی و خەڵکی بشارێتەوە، ئەسپینوسای وێنەکێش ئەم حاڵەتانەی بە باشی تێدا نیشاندەدا ، ئەمە پتر لە وێنەکانی دیکە لەو دەچوو.

شەوێك لە ماڵە نوێیەکەی، لە کاتێکدا کە باران وەك کوندەی سەر بەرەو ژێر دەباری لەپڕ ژەنەراڵ لە خەو ڕاپەڕی و بوونەوەرێکی فریشتە ئاسای دیت لە قوژبنێکی ژوورەکەیدا دانیشتبوو و کراسێکی ئاودامەنی لەبەردابوو و قژی بە تاجێکی ککوجوی[2] کەبە شەوان دەدرەوشێنەوە ، ڕازابۆوە. لەسەردەمی دەسەڵاتدارێتی ئیسپانیادا موسافیرە ئەوروپییەکان لەوەی کە خەڵکی وڵاتەکە بە بوتڵی پڕ لە ککوجو، جادەکانیان ڕووناك دەکردەوە، زۆر سەرسام دەبوون.

دواتر ژنان ئەم مێشوولەیان وەك گوڵی بەرۆك و گوڵی لە قژدان بەکاردەهێنا. ئەوە شەوە ئەم کچە ککوجوەکانی بەداوێکەوە هۆنیبۆوە و بەشێوەیەك لەسەر سەری خۆیاندانابوو کە دەم و چاوی نورانی دەکرد. باریکەلەو ئەفسانەیی دەهاتە پێشچاوان، لەگەڵ ئەوەی کە تەمەنی لە بیست ساڵ تێنەدەپەڕی، قژی ماش و برنج ببوو و ژەنەراڵ لەودا پرتەوی کەسایەتیەکی بەدیکرد کە لە ژنێکی کامڵدا دەدیترا، هۆش و زیرەکیەکی بێکەم و زیاد.. بەهەربیانوێك ببوو خۆی لەدەستی سەربازان ڕزگارکردبوو، لەبەرچاوی ئەفسەری چاودێر بەجۆرێك عەجایب دەینواند کە وایزانی ڕەنگە ژەنەراڵ کەیفی پێیبێ و ئەوی لەگەڵ خۆزەپالاسیۆس ناردە ژوورێ، ژەنەراڵ

---

١ ئالی زامبۆ: نازناوێکە کە بەکۆیلە و بەگشتی بە مرۆڤی دوورەگەیان گوتووە

٢ ککوجو: مێشوولەیەکی ناوچە گەرمەکانی ئەمریکایە . درێژیەکەی نزیکەی سی سانتیمەتر ، لەم لاو ئەو لای سکیدا دووپەڵە هەن کە شەوان دەدرەوشێنەوە ڕووناکایی بڵاودەکەنەوە.

توانای لە ئامێزکردنی نەبوو، لەم ڕووەوە داوای لێکرد بێت و لەناوجۆلانەکە لە تەنیشتی درێژبێ.

کچەکە ڕستەکەی دەوری سەری هەڵگرت، لە قامیشە شەکرێکی کە پێیبوو پێچاو لە تەنیشت ژەنەراڵ درێژبوو. دوای ئەوەی کە لە بارەی چەند مەسەلەیەکی جۆراوجۆرەوە ئاخافتن، ژەنەراڵ غیرەتی دابەرخۆی لەبارەی خەڵکی کارتاخنادو بۆچونیان لەسەر ژەنەراڵ خۆی پرسیاری لێکرد.

کچەکە گوتی: "دەڵێن کە حاڵی جەناب عالیتان باشەو خۆت نەخۆش پیشاندەدەی تا دڵیان پێتبسووتێ."

ژەنەراڵ جلەکانی داکەندو داوای لێکرد تا لە ژێر ڕۆشنایی مۆمەکە بە وردی تەماشی لەشی بکا، لەو کاتەدا بوو کە کچەکە توانی بست بە بستی ڕەنجورترین لەش و لارێکی کە دەکرا وێناکرێ، ببینێ ، سکێکی تێك قوپاوە، دندەکانی هەمووی دەرپەڕیبوون، دەست و پێیەکان کتومت ئێسقانی کڕێنداوە بوون، ئەم هەموو چورچ و لۆچەی لە پێستی ناسك و ڕەنگ تێدانەماوی، وەسەرێکی وەك بڵێی هەر ئەویش نییەو کەسێکی دیکەیە.

ژەنەراڵ وتی: "تەنیا شتێکی کە ماوە، ئەوەیە مەرگ بگاتە سەرم."کچەکە لەسەر قسەکەی خۆی پێی داگرت و گوتی: "خەڵکی دەڵێن کە ئەو هەمیشە هەر ئەوهابووە، بەڵام ئێستا وا چاکە هەموویان بزانن."

ژەنەراڵ خۆی بە دەستەوەنەدا. بەردەوام نیشانەی توندو تۆکمەی نەخۆشیەکەی خۆی هەڵدەدا، لەو سەرو بەندانەدا، کیژۆڵەکە ناوە ناوێك دەبۆرژا. بەڵام بەبێ ئەوەی کە سەری ڕشتەی قسەکان لە دەستبدا، بە بۆرژانیشەوە وەڵامی پرسیارەکانی ژەنەراڵی دەداوە ، هەروەها گفتوگۆکەیان بەردەوام دەبوو، بەدرێژایی شەوەکەش دەستی بۆ نەبرد، بەڵام تەنیا ئەو هەستەی کە کچێکی گەنجی لە تەنیشت ڕاکشاوە بۆ ئەو بەس بوو.

لە پڕێك لە ڕۆخ پەنجەرەوە دەنگی گۆرانی ئیتۆربیدەیان بەرگوێ کەوت: ئەگەر زریان درێژەبکێشێ و تەم و با بەهێزتر هەڵکەن خۆت بە گەردنم ئاوێزانکە تا دەریا هەردووکمان پێکەوە هەڵلووشێ. گۆرانیەکان زۆر کۆن بوون، هی ڕۆژگارێك بوون کە هێشتا ورگی دەیتوانی گواجابایە گەییوەکان هەرس بکاو لەشی و گیانی توانای گەوزاندنی ژنێکیان لە تاریکیدا هەبوو، هەردووکیان زۆر بە تاسەوە لە ڕۆخ یەکدا گوێیان بۆ ئەو گۆرانیانە ڕادێرا، بەڵام کچۆڵەکە دوای ئەوە بە ڕووتی خەوبردیەوە و ژەنەراڵیش چەند چرکە ساتێك دواتر جووڵەی لەبەربڕا، بێدەنگیەکە بەجۆرێکی ئەو تۆبوو کە کاتێك کچەکە بە ئەسپایی هەڵساو لە سەر

پەنجان هەنگاوینا، سەگەکان تەپەی پێی ئەویان بیست و دەستیانکرد بەوەڕین، کە ژەنەراڵ زانی ئەو بە دوای دەسکی دەرگاکەدا دەگەڕێ. پێی گوت: "کچەکە ئەوا دەڕۆی."

کیژەکە بە خەندەیەکی جوان و شادمانانە وەڵامیداوە:

"زۆرم حەزدەکرد بمێنمەوە."

وەك هەموو ئەوانیدیکە، ئەویش رۆیشت. لە هەموو ئەو ژنانەی کە لە ژیانی ئەودابوون هەندێکیان تەنیا بۆ چەند سعاتێك، بیری مانەوەی لەگەڵ یەکێك لەوانە هەرگیز بە مێشکی دانەهاتبوو، ئەگەر نیازی خۆشەویستیەکی هەبووایە، دەیتوانی دنیا سەرەو ژێربکا تا بگاتە ئەو خۆشەویستیە، هەر کە دڵی رازی دەبوو، تەنیا بیرەوەریەکەی بۆ ئەو بەسبوو، نامەی عاشقانەی بۆ دەنووسین و دیاری زۆری بۆ دەناردن، بەڵام هیچ کاتێك بەقەد سەرە دەرزیەکیش گفتی بەهیچ ژنێك نەدا کە لەگەڵیدا بژی. ئەو شەوە هەر لەگەڵ تەنیا ماوە، هەڵساو لەگەڵ ئیتۆربیدە و ئەفسەرانی دیکەی، کە لە رۆخی ئاگر لە حەوشە سەرگەرمی قسەو باس بوون، لێکی گرێداوە. داوای لە ئیتۆربی دەکرد کە بە گیتارەکەی سەرهەنگ خۆزەدلاکروز پاروس گۆرانی بۆ بچڕێ. لەو سترانانەی کە ئەو داوایدەکرد، هەستیان بە خراپی بارو ورەی ئەو کرد.

لە کاتی دووەمین سەردانی بۆ ئەوروپا، دڵی کەوتبووە سەر ئاوازو گۆرانی شادو کورتیلەی ئەو سەردەم، لە زەماوەندو بووك گوازتنەوەی ئیتالیەکانی کاراکاس و بەدەنگی بەرزدەیگوتن و لەگەڵ ئەم گۆرانیە جوان و سەروا دارانە سەمای دەکرد، بەڵام جەنگ زەوق و سەرو سەلیقەی ئەوی گۆڕی. گۆرانیە رۆمانتیکیەکان کە هاودەمی بەر بەیانی یەکەمین ئەویندارییەکانی ببوون. جێگاکانی خۆیان بۆ سەما بەشکۆ و رەسمی و سەربازیەکان چولکردبوو، ئەو شەوە گۆرانییەکانی تافی لاوی لە ئیتۆر بیدە داوادەکرد و لەبەرئەوەی ئەو گەنجتر بوو لەوەی هەموو شتانەی لەبیربێ، ژەنەراڵ ناچاربوو خۆی یەکەمجار هەندێکیانی فێربکا، هەر بەو شێوە کە ژەنەراڵ لە ناخەوە دەجۆشا، گوێگران کەم کەمە قەڵقڕیان لێکرد تا ئەوەی کە لە کۆتاییدا ژەنەراڵ و ئیتۆربیدە لە رۆخ خۆڵەمێشە دامرکاوەکەی ئاگردانەکە تەنیا مانەوە.

شەوێکی ئێجگار سەیربوو، یەك ئەستێرەش لە ئاسمانێدا نەدەدیترا و لەبەری دەریاوە بایەك دەهات کە نەوایەکی تێکەڵی لە دەنگی هەتیوەبێباوکەکان و بۆنی گەنیوی زەنەکەکان دەهێنا، ئیتۆربیدە پیاوێکی هێمن و سەلار بوو دەیتوانی تا بەیانی بەبێ ئەوەی چاوی لەسەریەکدابنێ سەیری مشکی و خۆڵەمێشی ناو ئاگردانەکە بکا یان یەکبین گۆرانی بڵێ، ژەنەراڵ کە بە کولەو ژەیەك ئاگرەکەی تێکدەدا گۆرانیەکەی بڕیەوەو پرسی: "خەڵکی لە مەکسیك دەڵێن چی؟"

ئیتۆ بیدە وتی: "کەسم لەوێ نییە، من دوور خراوەیەکم."

ژەنەراڵ وتی: "ئێمە هەموومان لێرە وەك دوورخراوەین. تەنیا شەش ساڵ لە ڤەنزویلا ژیاوم و ئەویتر هەر هەمووی بەسەر پشتی ئەسپەوە بەم لاو ئەولادا غارم داوە. ئێوە باوەڕناکەن، بەڵام من ئامادەم هەر چیم هەیە بیبەخشم بۆ ئەوەی بچمەوە تەمەنی (مانتۆ) م و خەریکی نانخواردنبم."ئەو ووشانە لە کرۆکی دڵیەوە دەهاتنە دەرێ، کەوتبۆوە یادو یادەوەری سەردەمی منداڵی. ئەوساکە ئاهێکی هەڵکێشاو لە بێدەنگیەکی قووڵدا کەوتە تەماشاکردنی ئاگرەکە، کاتێك کە دەستی بە قسەکردەوە، لەناو خەونەکانی هاتبووە دەرێ، وتی: "گرنگ ئەمەیە کە ئیدی ئێمە ئیسپانی نین، بەڵام لەوە بەدواوە هەر رۆژەی لە شوێنێك بۆ شوێنێکی دیکە چووین، لەولاتانێکی کە هەر رۆژەی ناو و دەوڵەتەکەیان دەگۆڕێ، ئیدی تاکو نازانین سەر بە کێشین، دووبارە کەوتەوە روانینی ئاگرو سوتووەکە و دەمێکی پێچوو بە دەنگێکی جیا لە دەنگی پێشوی پرسی:

"بۆچی لەم هەموو دەوڵەتەی دنیا روویان لێدەرکرد؟"

ئیتۆربیدە بەتام و چێژێکەوە وەڵامی پرسیارەکەی داوە: "لە قوتابخانەی سەربازی لەسەر پەڕەی کاغەزان فێری جەنگیانکردین و لەسەر نەخشەشدا لەگەڵ سەربازی بووکەشووشەدا دەجەنگاین. رۆژانی یەکشەممەش ئێمەیان بۆ زورگ و گردۆڵکەکانی دەوروبەردەبرد و لەنێوان مانگاو ژنانێکی کە لە سرووتی دوعا خوێندن دەگەڕانەوە بەشێوەیەکی ئاسایی پیاسەمان دەکرد. لەپڕ سەرهەنگ تۆپێکی دەتەقاند تا ئێمە بە ترسان لە خەڵك و زرمەی تۆپ و بۆنی باروت ئاشنابین. بیری لێبکەنەوە کە بەناوبانگترین مامۆستامان ئینگلیزێکی زامداربوو فێری دەکردین چۆن بەسواری ئەسپەوە خۆمان فرێدەینە باوەشی مردن."

"ئایا ئێوە بەراستی جەنگخواز بوون؟"

ئیتۆربیدە وەڵامیداوە: "جەنگەکانی ئێوە بەڵێ. بەڵام دوو ساڵ بەسەر قبووڵکردنمدا تێپەڕیوە و هێشتا جەنگێکی بەراستیم نەدیوە."[1]

ژەنەراڵ بەبێ ئەوەی تەماشای دەموچاوی بکا. درێژەی بە قسەکانی خۆیداو وتی: "لێرە ئیتر جەنگێك روونادا جگە لە جەنگی ئەم دژی ئەویدیکە."

خۆزەپالاسیۆس بەبیری هێناوە کە بەرەبەری سپێدەی بەیانە. ئینجا ژەنەراڵ بە کولەوژەکەی خۆڵەمێشەکەی بلاوکردەوە: پالی بە بازووی ئیتورپیدە داو لە کاتی هەڵسان پێی گوت: "ئەگەر

[1] - مانتۆم : نەمزانی مەبەستی چیە

من لە باتی ئێوە دەبووم، بەر لەوەی ئابڕوم بچێ و ناوم بزرێ، لە شەقەی باڵدەدەم و لێرە ڕادەکەم."خۆزەپالاسێوس تا لێواری مەرگ بەردەوام دووبارەیدەکردەوە کە لەو خانووەی دامەنی گردەکە هێزی شەیتانی هەیە. تازە لەو ماڵە دامەزرابوون کە کاپیتان خۆزەتۆماس ماچادۆ هاتە دیدەنی ژەنەراڵ و ئاگاداریکرد کە چەند سەربازگەیەك دەوڵەتی نوێیان بەرەسمی نەناسیوە و پارتێکی نوێ بۆ لایەنگیری لە ژەنەراڵ هەڵساوەتەوە، ژەنەراڵ بەتایبەتی و بە وردی گوێی بۆ قسەکانی ڕاگرت، بەڵام هێندە بۆی سەرنجڕاکێش نەبوو.

سەرەنجام گوتی: "هەواڵی باشن بەڵام تازە درەنگە جگە لەمە تا ئەو جێگایەی کە پەیوەندی بە منەوە هەیە، دەبێ مرۆڤێکی بێچارەو بێ تواناچی لە دەستبێ؟ فرمانیدا کە وەك شایانی کەسایەتیەکەی لەگەڵ ئەم نێرراوە ڕەفتار بکەن و ڕێزی بگرن، بەڵام گفتی هیچ وەڵامێکی پێنەدا، وتی: "چاوەڕێی ناکەم باری وڵات چاکبێتەوە."

لەگەڵ ئەمەشدا هەر لەگەڵ خواحافیزی لە کاپیتان ماچادۆکرد، بەرەو کارنیۆ گەڕاوە و پرسی: "سوکرەتان دۆزیەوە؟"وەڵامەکە بە بەلێ بوو، ئەو بەپەلە لە ناوەڕاستی مانگی مایس دا سانتافەی بەجێهێشتوە تا بەوەخت بگاتە ژن و کچەکەی.

کارنیۆ زیاتر وتی: "لەلایەنی کاتەوە دەستی پێشخستووە ئەگینا لە ڕێگای پوپاچان سەرۆك موسکرا تووشی ئەو دەبوو."

ژەنەراڵ بەسەرسامیەوە وتی: "کەوایە. لە ڕێگای زەویەوە سەفەردەکا."کارنیۆ گوتی: "بەڵێ بەم شێوە ژەنەراڵ."

ژەنەراڵ دیسان گوتی: "وای، خوای گەورە."

وەك ئەوەی ژەنەراڵ ئیلهامی بۆهاتبێ، هەمان شەو ئاگاداریان کرد کە لە چواری حوزەیران لە کاتێکدا دەریا سالار سوکرە لە ڕێگای بەترسی بروئکوس تێپەڕیوە، هەڵمەتیان بۆ بردوەو لە پشتەوە پێکاویانە. ژەنەراڵ تازە حەمامی شەوانەی کردبوو کە مۆنتیجا ئەم هەواڵە ناخۆشەی دایە پەشتەماڵەکەی فرێدا سەر سینی نانی ئێوارەو بارێکی شێتانەی بەسەرداهات هاواریکرد: "هەی لەعنەتینە."

هێشتا دەنگی ژەنەراڵ لە ماڵەکە دەنگیدەداوە کە جلەوی خۆیگرتەوە، خۆی هاویشتە سەر کورسیەکەو ناڵاندی. چەندین بار دووبارەیکردەوە: "کاری ئوباندوە ئەم پیاوکوژە بە کرێگیراوی ئیسپانیایە."مەبەستی خۆزە ماریا ئوباندوی فەرمانداری ناوچەیەك بوو کە ناوی پاستۆبوو لە سنووری باشووری نوئباگرانادا. ئەو بوو ژەنەراڵی لە تاکە جێنیشینی خۆی بێبەش کرد و

بەمجۆرە سەرۆكایەتی كۆماری ئەم وولاتە پارچە پارچەی بۆ خۆی مسۆگەر دەكرد تا لە دواییدا بیخاتە ژێر دەسەلاتی سانتاندەر، یەكێك لەوانەی دەستی لە تاوانەكەدا هەبوو لە یاداشتی خۆیدا نووسیبووی كە لە كاتی لە مالّ دەرچوون و رۆیشتن بەرەو مەیدانی سانتافە، شوێنی جێبەجێكردنی پلانی ئەو تاوانە، بەدیتنی دەریا سالار سوكرە كە لەهەوایەكی تەم و مژاوی ئەو پاشنیوەرۆیەدا بە تەنیا پیاسەیدەكرد، گیانم وەتەنگ هاتبوو.

ئەو شەوە كە ژەنەرالّ لەمەرگی سوكرە ئاگاداركرا، خوێن رشاوە خۆزەپالاسێوس ئەمجارەشیان وەك جاری پێشوو لە ئوندا كە ژەنەرالّ ئەوی لە كاتی حەمامكردندا غافلگیركردبوو، ئەم باسەی لیّ شاردبۆوە، بەبیّ ئەوەی ژەنەرالّ داوای لێبكا هەردوو نهێنی لیّ شاردبۆوە، لەبەرئەوەی دەیزانی كاتێك كە ئەم هەموو كێشە لە ئارادایە، پێویستی بە زیادكردنی كێشەیەكی دیكە نەدەكرد.

قەدەرانێك پێشتر، شەوێك لە گوئاجاكیل ژەنەرالّ لە پێشوەخت پیربوونی خۆی بە ئاگاهاتەوە، هێشتا قژی بەناوشانیدا دەهاتەخواریّ، لە كاتی جەنگ و عیشقبازیەكانیدا بۆ پتر ئیسراحەتكردن لە پشتەوە وەك كلكی ئەسپ دەیهۆنینەوە، بەلاّم لەو سەروبەندانەدا تێگەیشت كە نزیكەی هەر هەموو قژی سپی و دەموچاوی پڕ چورچ و لۆچ و غەمگین بووە. لە نامەیەكدا بۆ دۆستێكی نووسی: "ئەگەر بمبینی ، نامناسیەوە تەمەنم چلویەك سالّە بەلاّم وەك پیرەمێردێكی شەست سالّە دێمە بەرچاو."هەر ئەو شەوە قژی كورتكردەوە، دوای ماوەیەكی كەم لە پوتوسی [1] بۆ ئەوەی رێگا لە ونبوونی شونی لاوێتیدا بگریّ و روالّەتی خۆی گەنج نیشانبدا، سمێلی خەتكردو ریشیشی قەلّەم كرد.

دوای كوژرانی سوكرە ئیدی ژەنەرالّ نەیدەتوانی پیری خۆی بشارێتەوە، مالّی دامەنگردەكە نوقمی پرسەداری بوو، ئەفسەران ئیدی یاری كاغەزیان نەدەكرد، هەموو شەو لە دەوری ئاگر یان لە ژووری نووستنە هاوبەشەكەیان لەناو جۆلانە هەلّواسراوەكان بەم لاو بەو لای ژێر ساپیتەوە درێژببوون و بە قسەو باس كاتیان بەسەر دەبرد.

ژەنەرالّ بڕیاریدابوو نائارامی دەروونی خۆی بڕەوێنێتەوە خەمی دلّی خۆی هەلّڕێژیّ، هەر جارەی دوو یان سیّ كەسی لە ئەفسەرەكانی لە دەوروپشتی خۆیدا كۆدەكردەوە و لەسەر هەست و خورپەكانی ناو دلّ و دەروونی قسەی دەكرد، جارێكی دیكەش ناچاریكردن كە گویّ بۆ

[1] پوتوسی : ناوی پارێزگایەكە لە پۆلیڤیا

چیرۆکی زۆر دووباره کراوەی سانتاندر رادێرن لەمەی کە لە کاتی ئازادی پیرۆدا سوپا و یارمەتی نەناردبوو.

ژەنەراڵ پێی گوتن: "سانتاندر مگێزی بەدو نامەردانەیە و مەنتیقی بێپایەو بناغەیە: ناتوانێ لە سنوورەکانی ئەم وولاتە بەو دیو هیچ ببینێ و لە هیچ بگا.

بۆ هەزارەمین جار دووبارەیکردەوە کە ترسناکترین زەبرێکی کە بەر یەکێتی ولات کەوت، ئەمەبوو کە سانتاندر "پێشی خۆی."ولاتە یەکگرتووەکانی بۆ کۆنگرەی پەنەما بانگهێشت کرد، لە کاتێکدا کە مەبەستمانبوو یەکپارچەیی و یەکێتی ئەمریکا ڕاگەیەنین. ژەنەراڵ وتی: "هەر لەوە دەچوو کە پشیلەیەك بۆ ئاهەنگی مشکان بانگ کەین، ئەمە هەمووی لە ترسی هەڕەشە و گەفی ولاتە یەکگرتووەکانبوو کە ئێمە بە دامەزراندنی دەوڵەتی یەکگرتوو دژی یەکێتی پیرۆز، تاوانبار دەکا، ئەمە چ شانازییەکە!"

جارێکی دیکەش نیگەرانی لە خوێنساردی سانتاندر لە گەیشتنە ئامانجەکانی دووبارەکردەوە، گوتی: "ئەو وەك ماسیەکی مردارە."دیسانەوە بۆ جاری هەزارەم لەسەر وەرگرتنی قەرز لە لەندەن و گەندەڵی خۆی و دۆستەکانی رەخنەی گرت، بەتەنیا یان لەناو کۆمەڵە خەڵکێکدا ئەگەر دەکەوتە یادی سانتاندر، دووبارە دارو چیلکەی رەپێش دەکردو ئاگرەکەی خۆش دەکردو نەیدەتوانی خۆی بگرێ یان خۆی رازیبکا.

ژەنەراڵ وتی: "بەم پێیەبوو کە کۆتایی دنیا دەستپێکرد."لەمەڕ خەزێنەی دەوڵەت و خەرجیەکانەوە هێندە سەختگیربوو کە هەر کاتێك لەم بارەوە قسەیەك دەکرا، بە تووڕەبوونی ئەو کۆتایی پێدەهات.

کاتێك کە سەرۆك کۆمار بوو، بڕیاری دەرکردبوو کە هەر یەکێك لە فەرمانبەرانی دەوڵەت ئەگەر زیاتر لە دەپزو بە بێجێ و بێکەڵك خەرج بکا یان بدزێ، ئەوا لە سێدارە دەدرێ، بە پێچەوانەوە سامانی تایبەتی خۆی ئەوەندە بەدەست و دڵانە دەبەشیەوە کە هەرچی بۆ ئەو مابۆوە لە ماوەی چەند ساڵێکدا خەرج کرابوو، ئەو پارەی لە دەوڵەتیشەوە پێی دەدرا لەنێوان بێوەژن و بێکەس و بریندارانی جەنگ دابەشی دەکرد. ئەو ئاشانەی بە میرات بۆی بەجێمابوو بەسەر برازاو ماڵەکەی کاراکاسی بۆ خوارزایەکانی کردە دیاری و زۆربەی زەویەکانی پێش نەهێشتنی یاسای کۆیلەیی، لە نێوان کۆیلەکانی ئازاد کرابوون، دابەشکرد. ملیۆنە پەزوەکەی کە ئەنجومەنی لیما لە وەختی ئازادی پیرۆدا بۆ ئەو کردە دیاری قبووڵ نەکرد، خانووێکی رازاوەی کە دەوڵەت بۆ دانیشتنی ئەوی دیارکردبوو و دابووی بەو چەند رۆژێك پێشی

دەستلەکارکێشانەوەی بەخشیبوویە دۆستێکی کە تووشی کێشە هاتبوو. لە دەڤەری (ئاپورە) لەناو جۆلانەکەیەوە هەڵساو جێگەکەی بە یەکێك لە دەلیلەکانی دا چونکە تای لێبوو و تاوەکو ئیسراحەتی تێدابکاو خۆیشی لەسەر پەتوێك لەسەر زەوی لێیڕاکشا.

بیست هەزار پەزوەکەیشی کە دەیویست لە سامانی خۆی بیداتە جۆرج رنکاستر، قەرزنەبوو، بەڵکە دەوڵەت پێی قەرزار بوو، ئەسپەکانی کە زۆر دڵی پێیانەوەبوو خۆشیدەویستن دابوونی بە دۆستەکانی و تا ناسراوترین و بەشکۆترینیان پالومۆبلانکۆ، لە پۆلیڤیا لە گەورەکەی دەریا سالار سانتاکروز بوو، بەم پێیە بوو کە بابەتی وەرگرتنی قەرز وەرگرتن لە دەوڵەتێکی دیکەو یا خەرجی بێڕێو جێ ئەوی زۆر تووڕەو نارحەتدەکرد.

تا چەند شەوان قوولترین نارحەتیە دەروونییەکانی خۆی لە بۆ ئەوان باسکرد. لە سپێدەدەمانی رۆژی چوارەمدا، کاتێك کە ئالۆزییەکان گەیشتبوونە ئەوپەڕی. هەر بەو جلوبەرگانەوەی کە کاتی گەیشتنی هەواڵی مەرگی سوکرە لەبەریدابوو، هەڵسا، ژەنەراڵ بریسنیۆ مندزی بانگکردو لەگەڵ ئەودا تا گزنگانێ هەرقسەو باسی کرد. ژەنەراڵ لەناو نوێنەکەی خۆی و بریسنیومندز لە ناو نوێنێکی دیکە دابوو، کە خۆزەپالاسیۆس لە تەنیشت ژەنەراڵ بۆی ئامادەکردبوو، رەنگە هیچ یەکێك لەو دوانە ئاگایان لەوە نەبوو کە لەم چەند رۆژانەدا خوەکانی زەمانی ئاشتیان بە جارێك وەلانابوو و بۆ شەوەناخۆش و نائاسایشیەکانی مەیدانی جەنگ گەڕابوونەوە. لەو گفتوگۆیەدا بە تەواوی بۆ ژەنەراڵ ئاشکرا بوو کە نائارامی و ئارەزووەکانی خۆزە ماریا کارنیۆ، کە لە توربارکۆ بۆ ژەنەراڵی گێڕابۆوە، تەنیا هی ئەو نەبوو بەڵکە زۆرترینی ئەفسەرە ڤەنزویلاییەکان حەزیان لە نائارامیەکی وادەکرد، ئەوان دوای رەفتاری خەڵکی گرانادا دژی خۆیان، خۆیان زیاتر بە ڤەنزویلایی دەزانی. بەڵام ئامادەبوون خۆشیان بۆ یەکێتی ئەم وولاتە بکەنە قوربانی. ئەگەر ژەنەراڵ فەرمانیدەدا بۆ جەنگ بەرەو ڤەنزویلا بڕۆن، هەر لە هەمووی تێکڕایان ئەم فرمانەیان قبوولدەکردو پێش هەموانیش بریسنیومندزە. رۆژانێکی بەد بوو، تاکە میوانییەکی کە ژەنەراڵ قبوولێکرد، سەرهەنگی هەنگاری میسیسلاونایی پرسکی، قارەمانی جەنگی فریدلەند رزگاربووی کارەساتی لایبزیگ بوو. ئەو بەراسپاردەی ژەنەراڵ پۆنیاتوسکی هاتبوو، بۆ خزمەتکردن لەناو سوپای کۆلۆمبیا.

ژەنەراڵ پێی وت: "ئێوە درەنگ گەیشتون. هیچ شتێك لێرە نەماوە."دوای مەرگی سوکرە هەموو شتێك نابووتببوو. ژەنەراڵ ئەمەی لە ناپی برسکی گەیاندو ئەو لە یاداشتەکانی

ڕۆژانەیشی دا ئەم مەسەلەی بە هەمان شێوە باسکرد. سەدو هەشتا ساڵ دواتر شاعیرێکی گرانادایی ئەم یاداشتانەی دۆزیەوە تا لە مێژوودا تۆماربکرێ.

ناپی یرسکی لەگەڵ دەریاوانی ئینگلیزی شانون گەیشتە ئەوێ و کاپیتانی دەریاوان لەگەڵ ئەودا هاتبووە ماڵی ژەنەراڵ، ژەنەراڵ لەسەر ئارەزووی پلانەکانی سەفەرەکەی بۆ ئەوروپا لەگەڵ ئەودا قسەیکرد، بەڵام لە قسەکانی بۆنی ئەوە دەکرا کەبەڕاستی مەبەستی سەفەری نەبێ، لەبەرئەوەی ئەو کەشتیە یەکەمجار لە لاگوایرا دەوەستاو پێش کەوتنەرێی بەرە کینگستون دووبارە دەگەڕاوە کارتاخنا، ژەنەراڵ نامەیەکی لە بارەی کانزاکانی ئاواوە بەکاپیتان دا بە پارێزەرە ڤەنزویلاییەکەی بدا، بەو هیوایەی کە پارەو پولێکی بۆ بنێرن. بەڵام کاپیتان بەبێ هیچ وەڵامێك لەلای پارێزەرەکە گەڕاوە و ژەنەراڵ ئەوەندە غەمبارو نارحەتبوو کە کەس زاتینەکرد لێی بپرسێ ئایا دەڕوا یان نا.

هیچ هەواڵێکی خۆش نەبوو خۆزەپالاسێوسیش هەوڵێدەدا لەو هەواڵە خراپانەی کە دەگەن، زیادی بەسەرەوە نەنێن و ئەوەندەی بۆیدەکرا هەواڵەکانی درەنگ بە ژەنەراڵ دەدا، بابەتێکی کە سەرپاکی ئەفسەرانی نیگەرانکردبوو و لە ژەنەراڵیشیان دەشاردەوە ئەمەبوو کەسەربازانی پیادەو سوارە سۆزەنەکیان گرتبوو و نەخۆشیەکەشیان بە هەموو لایەکدا بڵاوکردبۆوە. نەخۆشیەکە لە دوو ژنەوە هاتبوو کە لە ئاوندا لەگەڵ هەر هەموو سەربازەکاندا نووستبوون ئەوانیش بە بێ گوێپێدان لەگەڵیاندا نووستبوون و بۆ هەر شوێنێك دەچوون نەخۆشییەکەیان تۆدەدا. لەگەڵ ئەمەشدا کە هەرچی ڕێگاو داودەرمانێکی هەبوو بۆ بەرگرتن لە نەخۆشیەکە تاقیانکردبۆوە سەربازان تێکڕایان گرتبوویانەوەو تەنانەت بۆ دەرمانیش کەسێکیان لێی قوتارنەببوو، لەگەڵ ئەمانەشدا، شێوازەکانی خۆزەپالاسێوس بۆ ئەمەی کە ژەنەراڵ لە هەموو هەواڵە ناخۆش و بێسوودەکان ئاگادارنەبێ، بێکەم و کوڕی نەبوو.

شەوێك نامەیەك کە نەزانرا بەهۆی کێوە بەبێ ئەوەی کەس بزانێ بەچ شێوەیەك دەست بەدەست ڕۆیشتوە تا گەییوەتە ناو نوێنەکەی ژەنەراڵ، ژەنەراڵ یەکەمجار بەبێ چاویلکە نامەکەی خوێندەوەو دوای ئەوە لەسەر گڕی مۆمێکی ڕاگرت تا بە تەواوی سووتا.

نامەکە لە خۆزفاساگرارەوە بوو، ڕۆژی دووشەممە لەگەڵ ژن و منداڵەکانیدا بە بیستنی ئەوەی کە ژەنەراڵ وازدەهێنێ و وڵات بەجێدەهێڵێ گەیشتبووە مومپوکس و سەرسام ببوو، ژەنەراڵ هەرگیز ناوەرۆکی ئەو نامەی ئاشکرانەکرد.

بەڵام هەموو شەوەکە نائارام بوو و لەبیرکردنەوە راچووبوو و لەگەڵ بولیڵەی بەیانی پەیامێکی ئاشتی بە خوزفادا نارد. ئەو بەرانبەر تکاو پاڕانەوەکانی ژەنەراڵ خۆیڕاگرت و بەپێی بەرنامەیەکی دارێژراو بەبێ بچووکترین گۆڕانکاری لە رێگای سەفەرەکەی بەردەوامبوو هەروەك خۆزەپالاسیۆس وتبووی، تاکە بەڵگەو بیانوی ئەمە بوو لەگەڵ کەسێکدا کە لەسەرەمەرگ و گیانەلایە، ئاشتی و ئاشتەوایی سوودێکی نییە. ئەو حەفتە هەموو زانیان کەمانوێلاسئنز لە سانتافە جەنگی خۆی بۆ گەڕانەوەی ژەنەراڵ دەستپێکردوە، وەزارەتی دەوڵەت لەبەرئەوەی کە ئەویان تەنگەتاو و ناچارکرد فرمانیدا بوو ئەو پەروەندانەی کە لە ژێر دەستیدان بگەرێنێتەوە ، ئەو بە پارێزەوە دەستی دابووە چالاکیەك کە دەوڵەتی وەتەنگ هێنا لەگەڵ دوو کۆیلەی شەڕکەری کە لەگەڵیدابوون چەند دروشمێکی کە لە دژی ژەنەراڵ لەسەر دیواران نووسرابوو، پاك دەکردەوە ئاگاداری بۆ رێزگرتنی ژەنەراڵ بڵاودەکردەوەو پروپاگەندەی لە دژی دەوڵەت بڵاودەکردەوە. هەموو دەیانزانی هەروەك بە جلی ژەنەراڵ دەهاتە ناو سەربازگەوە بەهەمان شێوەش لە ئاهەنگی سەربازان و چالاکییە دژە دەوڵەتیەکاندا بەشداری دەکرد. گرنگترین دەنگۆ ئەمە بوو کە لە تەك ئۆردانتا خەریکی دارێژتنی پلانی شۆڕشێکی چەکدارانەیە تا دەسەڵاتی تەواو بۆ ژەنەراڵ بگێڕێتەوە.

بەڵام وێناکردنی ئەمە کە مانوێلا ئەم هەموو توانایەی هەبێ، کێشە بوو، پاشنیوەڕۆی هەموو رۆژێك بەبێ دواکەوتن تاو بەرەتای دەهاتێ ، هەروەها کۆخەتوندەکەی هێزی لەبەربڕیبوو، سەر لە بەیانی رۆژێك، خۆزەپالاسیۆس گوێی لە دەنگی ئەو بوو هاواری دەکرد: "ئەم وڵاتە حەرامزادە!"خۆزەپالاسیۆس بە هەڵەداوان و نیگەرانیەوە خۆی بە ژوورەکەدا کردو ژەنەراڵی دیت کە گۆناکانی لە خوێندا نقوم بوون.

لە کاتی ریش تاشیندا خۆی بڕیبوو، بەڵام نارحەتی نەخۆشی نەبوو، بەڵکە لە نەزانی خۆی تووڕەبوو، ویلسۆن یەکسەر پزیشکی بۆ ژەنەراڵ بردو لەبەرئەوەی پزیشك ئەوی زۆر نائارام و بێ هیوا دیت، ویستی بە چەند دڵۆپێك دەرمانی خەو ئارامی بکاتەوە. ژەنەراڵ بە توندی پێشی لەم کارەی پزیشکەکە گرت.

ژەنەراڵ گوتی: "لەم بارەی خۆم وازم لێبێنە بێئومێدی دەرمانی شکست خواردوانە."

ماریا ئەنتۆنیای خوشکی لە کاراکاسەوە نامەیەکی بۆ نووسی، لەم نامەیەدا نووسیبووی: "هەموو خەڵکی لەوە لێت پەستن کە نایەی یاساو قانوون بەرقەرارەکەی ولەوە سکاڵادەکەن، هەموو کەشیشەکان لایەنگری تۆ دەکەن، رێگای راکردن لەسەربازی ناگیرێ و کێوەکان پڕاوپڕن لە خەڵکی

چەكدار كە ئامادەن بۆ تۆ بجەنگن."هەروەها لە نامەكەدا نووسیبووی: "ئاهەنگێكی كە سازكراوە ئاهەنگی شێتانەیەو ئەوانەی ئاهەنگ دەكەن، تا نازانن بۆ دەیكەن."لە هەمانكاتدا گرووپێك لایەنگریان دەكرد، لەسەر نیوەی دیوارەكانی وڵات هەر رۆژەو دروشمێك لە دژی ژەنەراڵ دەنووسرا لە هەندێك لەو دروشماندا هاتبوو كە تا پێنج وەچەی ژەنەراڵ دەبێ بكوژرێن.

پێكەنیناویترین كار لە ئەنجوومەنی ڤەنزویلا كە لە ڤالنسیا[1] دامەزرابوو، روویدا. ئەوان بە جیابوونەوەی یەكجارەكی رازیبوون ، هەروەها بڵاویانكردەوە كە تا كاتێك كە ژەنەراڵ لە وڵاتی كۆلۆمبیایە، بۆ چارەسەركردنی كێشەی نوئباگرانادا و ئەكوادۆر چارەسەرێك نادۆزێتەوە، بابەتێكی دیكەی كە تووشی نارحەتیكرد، ئەمە بوو كە ئاگاداری رەسمی دەوڵەت لە كەسێكەوە بەو گەیشت كە یەكێك بوو لەو كەسانەی كە لە هەوڵی كوشتنەكەی بیست و پێنجی ئەیلوولدا دەستی هەبوو و بەخوێنی سەری ژەنەراڵ تینوو بوو.

سەرۆك موسكرا ئەم كەسەی لە تاراوگە هێنابۆوە و كردبووی بە وەزیری دەوڵەت. ژەنەراڵ ووتی: "دەبێ بڵێم كە ئەم رووداوە لە هەموو رووداوێكی دیكە كاری لەسەر ژیانمدا بەجێهێشت."شەو بە بێداری ماوەو بە چەند نووسەرێكی وت تا وەڵامی جیاجیا بۆ ئەو ئاگاداریە بنووسن، بەڵام ئەوەندە توورە بوو لە داخا چوینوێ، دوای بێداربوونەوەی لە خەوێكی ئاڵۆز، بە خۆزەپالاسیۆسی وت: "ئەو رۆژەی كە دەمرم، هەموو ناقروسەكانی كاراكاس لێدەدرێن.

بەڵام كارەكە لەمەش پتر تەشەنەی سەندبوو، فەرمانڕەوا ماراكائیبۆ لەگەڵ زانینی هەواڵی مەرگی ژەنەراڵ بەیاننامەیەكی بڵاوكردەوە كە تێیدا نووسیبووی: "من لەم رووداوە گەورەی كە بەبێ دوو دڵی لە پێناو ئازادی و شادمانی وڵاتدا بە كەڵكە. خۆشحاڵم، خوای شەڕانیەكان و ئانارشیست و دیكتاتۆری وڵات لەناوچوون."ئەم بەیاننامە لەسەرەتادا بۆ ئاگاداركردنەوەی دەوڵەتی كاراكاس بوو، بەڵام سەرەنجام بوو بە بەیاننامەیەكی میللی و سەرانسەری.

لەنێوان ئەو هەموو مەسەلانەدا لەو رۆژە ناخۆش و غەمگینانە، رۆژێكیان بەیانی سعات پێنج خۆزەپالاسیۆس ساڵوەگەری لە دایك بوونی ژەنەراڵی هێناوە یاد: "بیست و چوارەمی حوزەیران، بە بۆنەی شەهید كریستینا."ژەنەراڵ چاوەكانی كردەوەو جارێكی دیكە گەیشتە ئەو سەرئەنجامەی كە لە بۆ بێبەختی و بێنێوچەوانی هەڵبژیردراوە. هەرگیز رۆژی لە دایك بوونی ئاهەنگی نەدەگێڕا و تەنیا لە رۆژی سیمۆن قەشەدا كە كاتێك خودی ئەو بوو رێوڕەسمێكی سازو بەرپادەكرد. لە رێبازی

---

١ ڤالنسیا: شارێكی ڤەنزویلایە

کاتۆلیکدا یازه قەدیس بەناوی سیمون هەن و ئەو وای بەباش دەزانی بەناوی کەسێك کە یارمەتی حەزرەتی مەسیحی دا ، ناوببرێ، بەڵام چارەنووسی سیمۆنێکی دیکەی بۆ ئەو هەڵبژارد، ئەو یەکێك بوو لە موژدە دەرانی ئایینی مەسیحی لە میسرو حەبەشە کە بیست و هەشتەمی ئۆکتۆبەر رۆژی ئەو بوو، لەو رۆژەدا لەسانتافە لە ئاهەنگێکدا تاجێکیان لە گول و گەلای زەیتون لەسەر سەری ژەنەراڵ دانا، ژەنەراڵ زۆر بە زیرەکیەوە تاجەکەی لەسەرسەری خۆی هەڵگرت و لەسەر سەری سانتادری داناو ئەو بەبێ ئەوەی بجوولێتەوە تاجەکەی قبووڵ کرد، چلو حەوت بۆ ئەو مانایەکی تایبەتی هەبوو، لەبەرئەوەی بیست و چوارەمی حوزەیرانی ساڵی پێشوو لە گوئاجاکیل لەنێوان ئەو هەموو دەنگ و باسە ناخۆش و تایە گەرمەی دا یەك لە دوای یەك و لەپڕ نیشانەو هەستێکی سەیر ئەوی راچەناند، ژەنەراڵ هەرگیز باوەڕی بە هەستی شەشەم و نیشانان نەبوو، نیشانەکە ئاشکراو روونبوو، ئەگەر لەوە سەرکەوتبا کە تا رۆژی لە دایکبوونی لە ساڵی داهاتوودا بە زیندوویی بمێنێتەوە ئیدی هیچ مەرگێك نەیدەتوانی لە ناوی ببا تەنیا پشتبەستن بەو هەستی شەشەمە، بەهەرشێوەیەك بوو ئەوی بە پێچەوانەی تەواوی پێشبینیەکان بە زیندوویی هێشتەوە، لە ژێر لێوەوە وتی: "سەیرە، تەمەنم بووە بە چل و حەوت ساڵ و هێشتا ماوم."

ژەنەراڵ بەهێزێکی تازەو دڵێکی سەراوڕێژ لە هەویا کە ئیدی لە هەموو بەڵایەکان لە ئاماندایە، لەناو جۆلانەکەی خۆی راستبۆوە، بریسنیۆ مندز سەردەستەی تاقمێکی کە دەیانویست بەرەو ڤەنزویلا بڕۆن و لە پێناوی یەکێتی کۆلۆمبیادا تێبکۆشن، بانگ کردو داوای لێکرد کە بە بۆنەی لە دایکبوونی ئەم هەواڵە بە ئەفسەرەکانی دیکەش بڵێ. پێی وت: "لە ئەفسەری پلە ملازم بەرەو سەر هەرکەسێك دەیەوێ بۆ جەنگ بچێتە ڤەنزویلا ناوی خۆی تۆمار بکا."

ژەنەراڵ بریسنیۆ مندز یەکەم کەس بوو. دوو ژەنەراڵ چوار سەرهەنگ و هەشت سەروانی دیکەش لە سوپای کارتاخنا ناویان تۆمارکرد.

بەڵام کاتێك کە کارنیۆ گفتەکەی بە بیر ژەنەراڵ هێناوە، ژەنەراڵ پێی وت: "ئێوەم بۆ ئەرك و فرمانی گرنگتر پێویستە."

دووسعات پێشی ئەوەی بجمێ بڕیاریدا کە خۆزەلارنسیۆسیلباش بنێرن، چونکە هەستی دەکرد کە ژەنگهەڵهێنان و رزین یەکڕیتمی گرێکوێرەکانی ئەوی پتر دەکرد. بەڵام سیلبا ئەم شانازیەی قبووڵنەکرد.

ئەو گوتی: "ئەمەش جەنگە و لەسەخترین جەنگەکانە. لەبەرئەمە ئەگەر ژەنەراڵ رێگابدا من هەر لێرە دەمێنمەوە."

ژەنەراڵ دژی رۆیشتنی ئایتوربیدە و فرناندۆو ئاندرس ئیبارا بوو بۆ جەنگ بە ئایتۆربیدەی وت: "ئەگەر بڕیاربێ تۆ بنێرم، ئەوا بۆ جێگایەکی دیکەت دەنێرم."ئەوهای بەڵگە بۆ ئەندرس هێناوە کەوا ژەنەراڵ دی بەگوئیبارا لە جەنگدایە و دووبرا لە جەنگێکدا زیادە. ئیدی لەم رووەوە فرناندۆ پێی دانەگرت، لەبەرئەوەی دەیزانی کە بە وەڵامە هەمیشەییەکەی دەگا: "پیاو دەبێ لەگەڵ تێکڕای قەوارەو بوونی بچێتە جەنگەوە ناتوانێ رێگابدا کە تەنیا چاوەکان و دەستی راستی لە تێکۆشاندابێ."

فرناندۆ بەم وەڵامە پشت ئەستوور بوو، بە نیشان و مەدالیایەکی سەربازی دەزانی بۆ خۆی. مۆنتیجا هەر هەمان شەو بارگەی سەفەری تێکنا، ژەنەراڵ لە کۆڕێکی سادەدا یەکەیەکەیانی لە ئامێزگرت و خوا حافیزی لە تێکڕایان کرد.

ئەوان بە جیاجیاو لە رێگای جیاجیاوە رۆیشتن، چەند کەسێکیان لە رێی جامایکاەوە هەندێکیان لە رێی کورازائوە وە ئەوا نیدیکە لە گواخیدا[1].

هەر بەو شێوەی کە لە ئەرك و فرمانە نهێنییەکانی دژی ئیسپانیا پێیان دەسپێردرا، فێربووبوون، هەموویان بە بێچەك و بەجلوبەرگی خۆیان نەك هی سەربازی سەفەریان دەکرد تا کەس بە ناسنامەی ئەوان نەزانێ.

سبەینەکەی رۆژی دوایی ماڵەکەی دامەن تەپۆلکەکە شێوەی سەربازگەیەکی وێران و چۆڵکراوی بەخۆوە گرتبوو، بەڵام ژەنەراڵ لەوێدا ماوەو هێویداربوو، کە جەنگی تازە بتوانێ تاجە گەڵا زەیتونیەکەی ساڵانی زووی بۆ بگەڕێنێتەوە.

---

١گواخیرا: ناوچەیەکە لە وولاَتی کۆلۆمبیا کە ناوەندەکەی ریۆئاچایە.

## (٧)

رۆژی پێنجەمی ئەیلوول ژەنەراڵ رافائیل ئۆردانتا دەسەڵاتی گرتەدەست. خولی ئەنجوومەن کۆتایی هاتبوو هیچ توانایەك نەبوو کەلای ئەم کۆدەتایە بگرێ و بەرەسمیەت. بیناسیێ، بەڵام ئاژاوەگێڕان لە کەشیشە گەورەکانی سانتافە ئەم داخوازیەیان کرد ئەوانیش تا ئەو حەلە کە ژەنەراڵ دووبارە دەسەڵات دەگرێتەوە دەست، ئۆردانتاو دەسەڵاتەکەیان بە رەسمی ناسی.

بەمجۆرە ئاژاوەیەك بەهۆی سەربازان و ئەفسەرانی ڤەنزویلایی نرایەوەو ئاژاوەچیان بە پارێزگاری و پاڵپشتی وردە بازرگانان و پیاوە ئاییینیەکان توانیان هێزەکانی دەوڵەت شکست بێبێنن، ئەمە یەکەمین کۆدەتای کۆماری کۆلۆمبیا و یەکەم جەنگی ناوەخۆ بوو لەو چلو نۆ جەنگەی کە تا کۆتایی سەدە روویدا. سەرۆك خواکین موسکراو یاریدەرەکەی کایسدۆ لەنێو ئاژاوەگێڕاندا تەنیا مانەوەو وازیان لە بەرپرسیارێتیەکانیان هێنا. ئۆردانتا دەسەڵاتی گرتە دەست و لەیەکەمین هەلدا نوێنەرانێکی بۆ ژەنەراڵ ناردو سەرۆکایەتی کۆماری بۆ پێشنیارکرد.

لە مێژبوو کە خۆزەپالاسیۆس سەروەری خۆی بەم چەشنە تەندروستی و گیانە پڕ لە شادیەوە نەدیتبوو، هەر لەگەڵ وەرگرتنی هەواڵ کۆدەتاو سەرکەوتنی ژانەسەرو تایەکەی رەونیەوە. لە هەمان کاتدا قەت خۆزە ئەوی هێندە نیگەران نەدیتبوو، مۆنتیجا کە لەم لاینەوە نیگەرانبوو. داوی لە باوکی روحانی سباستیان سیگوئنزا کرد تا بە چەشنێك ئاگای لە ژەنەراڵ بێ کە هەستی پێنەکاو یارمەتیبدا. باوکە روحانی بە خۆشحاڵیەوە قبوڵیکرد و راسپاردەکەی بە باشی ئەنجامدا. لە پاشنیوەڕۆ گەرمەکانی کە چاوەڕوانی نێراوەکانی ئۆردانتا بوون، خۆیان بە یاری شەترەنج سەرقاڵ دەکردو باوکە روحانی بە زیرەکی کارێکی وای دەکرد کە ژەنەراڵ یاریەکە بباتەوە.

ژەنەراڵ لە دووەمین سەفەری بۆ ئەورووپا فێری یاری شەترەنج ببوو، لە شەوانی بێکاری و لە کاتی لەشکر کێشی بۆ سەر پیرۆ. لەگەڵ ژەنەراڵ ئالری یاری دەکرد. توانای زۆری پەیداکردبوو،

بەڵام لەمە پتر نەچووە پێشێ. ژەنەراڵ دەیوت: "شەترەنج یاری نیە. بەڵکە عیشقێکەو من عیشقەکانی دیکەم لاباشترن."لەگەڵ ئەمەدا لەبەرنامەی گشتی ژەنەراڵ بۆ قوتابخانە وەك یاریەکی بەسوود باسی شەترەنج کراوە و فرمانیدابوو کە لە قوتابخانان شەترەنج وەك وانەیەك بگوترێتەوە. راستی ئەمەبوو کە سەرومێشکی بۆ ئەم یاریە نەدەگونجاو ئەو هۆش و بیرەی کە دەبوو لای شەترەنج بەکاربێنێ. ژەنەراڵ بۆ هەندێ مەسەلەی دیکە پێویستی پێی بوو.

جۆلانەو بالینگانی ژەنەراڵیان لەناو دەرگایەك بەرانبەری رێگایەکی، کەنێراوەکانی ئۆردانتای لێوەی دەهاتن. هەڵواسیبوو، قەشە سباستیان هەمیشە ئەوی لەناو نوێنەکە بە چاوەڕێیی دەدیت. ژەنەراڵ بەدیتنی قەشە دەیوت: "باوکە! ئێوە لە پڕ دێن."ژەنەراڵ تێکڕای ئەو ماوەیەی کە قەشە سباستیان بیری لە جووڵاندنی بەردێکی شەترەنج دەکردەوە پیاسەی دەکردو تەنیا چەند چرکە ساتێك بۆ بزواندی بەردی شەترەنج دادەنیشت.

قەشە پێی وت: "قوربان حەواسم پەرتە کە ئێوە بەزیندوویی چاوان دەخۆم."

ژەنەراڵ بە پێکەنینەوە دەیگوت: "کەسێك کە لە خۆباییانە فراوین بکا، نانی ئێوارە بەشەرمەوە دەخوا."

ئالری خووی بەوە گرتبوو لە تەنیشت مێزی یاری راوەستێ. یاریەکە تەماشاو تاوتوێ بکاو لە بارەشیەوە پێشنیاران بۆ ژەنەراڵ بکا، بەڵام ژەنەراڵ بە تووڕەییەوە رەتی دەکردنەوە. لە باتیان هەروەختێك کە دەیبردەوە، دەچووە ئەو حەوشەی کە ئەفسەران یاریان تێدا دەکرد، بانگی سەرکەوتنەکەی خۆی رادەهێشت. جارێك قەشەسباستیان لە ناوەڕاستی یاری لە ژەنەراڵی پرسی کە بۆچی یادەوەریەکانی نانووسێتەوە.

ژەنەراڵ وتی: "هەرگیز نەخێر.. یادەوەری هی مردوانە."

باری پۆست یەکێك لە مەسەلە گرنگەکان بوو، بەتایبەتی لەو حەفتە پڕ لە ئاژاوەو بێسەرو بەریانەدا کە پۆستەچیەکان لە سانتافە چاوەڕێیی هەواڵی نوێ دەبوون و بەرێکەوتنی خۆیان دوادەخست. پۆستەکانی نێوان رێگاکانیش لە چاوەڕوانیدا بێزارببوون. بەڵام لە باتی ئەوە کارو خێرایی پۆستەچیە نهێنیەکان زێتر ببوو، بەجۆرە ژەنەراڵ بەر لە گەیشتنی پۆستی ئاسایی لە دەنگ و باسەکان ئاگاداربوو و کاتێکی تەواوی بۆ بیرکردنەوەو بڕیاردان هەبوو.

کاتێك کە لە رۆژی حەڤدەمی ئەیلوولدا، ئاگادارکراوە کە نوێنەرانی ئۆردانتا نزیکی شارن، کارنیۆی لەگەڵ ئالری نارد تا لە رێگای تورباکو پێشوازیان بکەن. دوو سەرهەنگ بەنێوی

بیسنتەپی نیرس و خولیان سانتاماریا بوون کە لە چرکەساتی یەکەمدا لە بارو ورەی بەرزو شادی نەخۆشیێکی کە لە سانتافە هێندە لە بارەی نەخۆشیەکەوە قسەی دەکرد. سەرسام بوون.

لە ماڵی ژەنەراڵ دانیشتنێکی بچووك سازکرا کە تێیدا کەسانێکی ناسراو و نیزامی بەشداریان تێداکرد. بەبۆنەی رووداوەکە، قسەی رەخنە ئامێزانەکراو لە خۆشی سەر بڵندی وڵات خواردیانەوە. لە کۆتایی کۆبوونەوەکە، داوای لە نوێنەرانکرد بمێننەوەو پێکەوە قسە لە بارەی راستیەکانەوە بکەن. سەرهەنگ سانتاماریا لە هەوڵی ئەوەدابوو کە مەسەلەکان هێندە عێدزکەر نەیەتەبەرچاو، کێشەی بنەڕەتی باسکرا: "ئەگەر ژەنەراڵ دەسەڵات لە دەست نەگرێ، ئاژاوە و بێسەرو بەریەکی ترسناك لە وڵات پەیدادەبێ."ژەنەراڵ ئەم قسەی قبووڵنەکرد.

ژەنەراڵ وتی: "یەکەمجار دەبێ شتێك هەبێ تا بتوانرێ بگۆڕدرێ. تەنیا کاتێك کە ئاسۆیێکی سیاسی روون پەیدابێ دەتوانرێ بزانرێ کە ئایا بەراستی وڵاتێك هەیە یان نا."

سەرهەنگ سانتاماریا لە مەبەستەکەی ژەنەراڵ حاڵی نەبوو. ژەنەراڵ ووتی: "مەبەستم ئەوەیە کە لەم دەمەی ئێستادا بنەڕەتی ترین مەسەلە دووبارە یەکگرتنەوەی وڵاتە لە رێگای جەنگەوە. بەڵام سەری رشتەی کارەکە لێرە نییە، بەڵکە لە ڤەنزویلایە."

لەو چرکە ساتە بەدواوە ئامانجێکی دیارکراوی بۆ پەیداببوو، لەگەڵ زانینی ئەمەی کە دوژمن لە دەرەوە نیە و لەناو ماڵی خۆمانە، دەبێ هەموو شتێك لە سەرەتاوە دەستپێکرێتەوە نفوسدارانی هەر وڵاتێك کە لە نوئباگرانادا سانتاندر و لایەنگرانی نوێنەریان بوون، لە دژی ئامانجی یەکپارچەیی و یەکێتی جەنگیان راگەیاندبوو، لەبەرئەمەی ئەم ئامانجانە پێچەوانەی دەسەڵات و ئیمتیازە تایبەتیەکانی خانەوادە گەورەو خانەدانەکان بوو.

ژەنەراڵ ووتی: "ئەمە تەنیا بیانوێکە بۆ جەنگێك کە خەریکە نابوتماندەکا. لە هەموویشی ناخۆشتر ئەمەیەکە وا دەزانن دنیا سەربەرەو ژێر دەکەن لە کاتێکدا کە بەمکارانەیان تەنیا بەدوای هزرو بیرێکی دواکەوتویی ئیسپانی دەکەون و پشتگیری لێدەکەن."

ژەنەراڵ بەبێ ئەوەی کە پشی تازە بکاتەوە، بەردەوام بوو: "دەزانم کە بە تاوانی گوتنی قسەی لێك ناکۆك گاڵتەم پێدەکەن کە بۆ نموونە لە رۆژێکدا لە نامەیەکدا بەکەسێك دەڵێم کە پاشایەتیم قبووڵە، لە شوێنێکی دیکەدا دەنووسم کە ئەمە رەتدەکەمەوە و لە جێگایەکی دیکەی نامەیەکی ئەو کاتە لەگەڵ هەردوو بابەتدام."ئەویان بەوە تاوانبارکردبوو کە لە دادوەریەکانیدا لەمەڕ خەڵك و مێژووەوە بێنچینەو بنەوانە، رۆژێك لە دژی فرناندۆی حەوتەم

راستدەبێتەوە ، بەڵام خۆی لەموریجۆ کەنار دەگرێ، لەگەڵ ئیسپانیەکاندا دەجەنگێ ، بەڵام هەموویان هاندەدا بۆ قبوولکردنی روحیەتی ئەوان.

رۆژگارێك بۆ سەرکەوتن، پاڵی بە هائیتی دەدا ، بەڵام لە کۆنگرەی پەنامادا ئەوی بە وڵاتێکی بێگانەو دەرەکی داناوە و بانگیشیان ناکا، جارێك لە وەختی دوعاکردندا قسەی شڕم بڕم دەکاو جارێکی دیکە بەرگری لە کلێسادەکا. ئەویان بە کەسێکی ناجێگیر، ریاکارو هەتا ناپاکیش دەژمارد، لەبەرئەوەی لەو باوەڕەدابوون کە لەبەردەمی دۆستانی بە شان و بازویانی هەڵدەدا و لە پشتەوەش قسەی خراپیان پێدەڵێ. ژەنەراڵ بەردەوامبوو، باشە هەموو ئەو قسانەم قبووڵە، بەڵام کات و جێگاکە وای پێویست دەکرد، لەبەرئەوەی هەر هەموو ئەو کارانەم لە پێناوی سەربەخۆیی و یەکێتی ئەم کیشوەرەدا کردوە و لەم بارەوەش تەنانەت بۆ جارێکیش قسەی لێك ناکۆکم نەکردووە."

سەرئەنجام بە زاراوە کارییبیەکەی وتی: "ئەویدیکە هەر هەمووی بە کارکارەی دۆزەخ."

دوو رۆژ دوای ئەوە نامەیەکی بۆ ژەنەراڵ بریسنیو مەندز نووسی کە تێیدا گوتبووی: "من پایەی سەرۆکایەتی کۆمارم بۆیە قبووڵ نەکرد، چونکە نەمدەویست وەك سەرۆکی ئاژاوەچیان بەدناوبم."لەگەڵ ئەم حاڵەش لە هەردوو نامەیدا کە هەمان شەو بۆ ژەنەراڵ روفائیل ئۆردانتا بە فرناندۆی نووسیبوون، چاوی لەوەبوو کە هێندە سەختگیرو توندڕەو نەبێ.

نامەی یەکەم وەڵامێکی رەسمی بوو سەنگینی و تۆکمەیی نامەکە لە ناونیشانەکەیدا بەدەردەکەوت: "عالی جەنابی بەڕێز."لەو نامەدا لەبەرباری شێواوی وولات و لەبەریەکهەڵوەشانەوەی دەوڵەت ئەوها کۆدەتاکەی رێنشاندەری کردبوو، نووسیبووی: "لەم بارو زرووفەدا ناتوانرێ میللەت بخەڵەتێنرێ."لەگەڵ ئەوەی لە توانایدا نەبوو کە سەرۆکایەتی کۆمار قبووڵ بکا. تەنیا ئامادە ببوو کە بگەڕێتەوە سانتافەو وەك سەربازێکی ئاسایی لە خزمەتی دەوڵەتی نوێدا بێ.

نامەکەی دیکە بەم ناونیشانەبوو: "ژەنەراڵی ئازیزی من."نامەیەکی دوورودرێژ بوو و هەموو بەڵگەکانی لەسەر بناغەی نەبوونی باوەڕو قبووڵنەکردنی سەرۆکایەتی کۆمار هێنابۆوە، لەو شوێنەی کە هێشتا دۆن خواکین موسکرا دەستی لە پلەو پایە نەکێشابۆوە، هەر چرکەساتێك بۆی هەبوو داوای سەرۆکایەتی کۆمار بکا و ژەنەراڵیش وەك دەستبەسەرداگرێکی سەرۆکایەتی کۆمار بناسێرێ. بەمجۆرە ئەوەی لە نامەی یەکەم داگوتبوی، لە نامەی دووەمیشدا دووبارەی کردەوە، تا کاتێك کە فرمانێکی روون و ئاشکرا لە لایەنی سەرچاوەو دەسەڵاتی قانوونیەوە نەگا. لە توانایدا نابێ دەسەڵات بگرێتە دەست.

هەردوو نامە لەگەڵ ئاگادارنامەیەکدا، کە تێیدا داوای لە میللەت کردبوو کە بەسۆز کارنەکەن و فریوی سۆزەکان نەخۆن و دەوڵەتی نوێ بپارێزن، بە پۆستێك رەوانەکرا، بەڵام خۆی لە هەر سازشێك بێبەری زانیبوو، لە دوواییدا گوتبووی: "لەگەڵ ئەمەدا وا دێتە بەرچاوان کە من خزمەتی زۆری ئەم وولاتەم کردوە. بەڵام لە راستیدا هیچ کارێکم نەکردوە."سەرەڕای ئەمە، ددانی پێدانا کە رستە گەلێکی نووسیوە. تەنیا لەبۆ پشت ئەستورکردنی چەند کەسێك بووە.

خاڵێکی سەیری دیکە لە نامەی دووەمدا ئەمەبوو کە لەرەیەکی فەرماندەرانەی تێدا هەستپێدەکرا، لە کاتێکدا نەدەسەڵاتی هەبوو نە دەسەڵاتی قبووڵ دەکرد، داوای بەرزکردنەوەی پایەی سەربازی سەرهەنگ فلورنسیو خیمنزی کردبوو ، هەروەها داوایکردبوو کە ئەو لەگەڵ هێزێکی زۆر بۆ رۆژئاوا بنێرن تا بەرووی ژەنەراڵ خۆزە ماریا ئوباندۆ و ژەنەراڵ خۆزە ئیلاریۆلویز، کە لەگەڵ دەوڵەتی ناوەندی لە جەنگدابوون، بوەستنەوە، لە نامەکەدا هاتبوو: "لەگەڵ ئەوانەی کە سوکرەیان کووشت."رایسپاردبوو ئەو ئەفسەرانەی دیکەشی کارو فرمانی دیکەیان بدرێتی و پلەیشیان بەرزبکرێتەوە بۆ ئوردانتای نووسیبوو: "ئێوە بەم لایەنە رابگەن و من کارەکانی دیکە لە ماگدالناوە تا ڤەنزویلا، بە بۆجاکاوە پێکەوە دەکەم."ژەنەراڵ خۆی دەیویست لەگەڵ دوو هەزار کەس بەرەو سانتافە بچێ و بەشداری لە بەرقەرارکردنی یاسا و جێگیرکردنی دەوڵەتی نوێ بکا.

تا چل و دوو رۆژ هیچ هەواڵێکی راستەوخۆی لەئوردانتاوە پێنەگەیشت ، بەڵام لەو مانگە دوورودرێژە دا لەسەر نووسینی نامەو دەرکردنی فرمانەکانی بەردەوام بوو. کەشتی دەهاتن و تێدەپەڕین، بەڵام ئەو لەمەڕ سەفەرەکەی بەرەو ئەوروپای هیچی بەسەر زاردا نەدەهات. تەنیا ناو ناوە یادی دەکردەوە.

ماڵەکەی دامەنی گردەکە، ببووە سەربازگەی ناوەندی هەموو وڵات و وەبگرە رۆژانە هەموو پلان و بڕیارێکی سەربازی لەناو جۆلانەیەکی ناو ئەو بنکە سەربازیەوە دەردەچوو، بەرەبەرە و بەبێی ئەوەی کە خۆیشی ئاگاداربێ. دەستی لە بڕیارە ناسەربازیەکانیشدا وەردەدا، بەڕادەیەك کە لە پڕژانە سەر بچووکترین مەسەلەکانیش خافڵ نەدەبوو، مەسەلەهایەکی وەك ئامادەکاری و بەردەستیکردنی کارێك بۆ یەکێك لە دۆستە باشەکانی کە ناوی تاتیس لە دایەرەی پۆست ،یان راسپاردە بۆ ژەنەراڵ خۆزە ئۆکرۆس تا دووبارە بە خزمەتی سەربازی بگەڕێتەوە بەجێهێشتبوو، چونکە لەو هەموو ئارامیەی لە ماڵ مانەوەی ماندوببوو.

لەم رۆژانەدا وتەیەکی کۆنی خۆی دووبارە دەکردەوە: "منی پیر، ماندوو کە نەفت، نەخۆش، تاوانبارکراو بابردەڵە و نائومێدم و مووچەیەکی باشیشم نادەنێ."

لەگەڵ ئەمانەشدا هەر کەسێکی ئەویدەدیت و گوێی لەو قسانە دەبوو نەیدەتوانی پێی باوەڕبکا، لە رواڵەتدا لە پێناوی پشتیوانی و بەهێزکردنی دەوڵەت کاریدەکرد.

بەڵام لە راستیدا وەك سەرۆك کۆمار، نەخشەی دادەرێژت بۆ گەڕاندنەوەی ڤەنزویلا و ئەو ساکە دامەزراندنەوەی یەکێتی نێوان میللەتانێکیان دروست دەکردەوە کە بەرگوشادترین خاکی جیهانیان هەبوو.

کاتێکی لەمە باشتر نەدەڕەخسا، نوئباگرانادا لە دەستی ئۆردانتا بوو، پارتی لیبرال شکستی هێنابوو و سانتاندر لە پاریس مابۆوە. ئیکوادۆر لە دەستی فلورسدا بوو پیاوێکی ڤەنزویلای بەرزەفڕو ئازا کە لە بۆ دروستکردنی کۆمارێکی نوێ کۆلۆمبیای لە کیتۆو گوئاجاکیل جیاکردبۆوە و ژەنەراڵ دڵنیابوو، کە دوای شکستخواردنی بکوژانی سوکرە، دەتوانێ بەرحەتی پێی باوەڕبکا. لەلایەن پۆلیڤاشەوە خاترجەم بوو، چونکە لە دەستی دۆستی خۆی دەریاسالار سانتاکروز بوو و ئەو تازە بە تازە نوێنەرایەتی سیاسی خۆی لە فاتیکان بۆ ژەنەراڵ پێشنیازکردبوو بەم پێیە ئامانجی راستەقینە لە دەستهێنانەدەری دەسەڵاتبوو لە دەستی ژەنەراڵ پائز لە ڤەنزویلا.

پلانی سەربازی ژەنەراڵ هێرشێکی گەورەبوو لە بەری کوکۆتاوە، لە کاتێکدا کە پائیز هێزەکانی لە ماراکائیب دامەزراندبوو، بەڵام لە رۆژی یەکەمی ئەیلوولدا لە رێو ئاجا ئاژاوەیەك کەوتەوە، فەرمانداری سەربازیان لێخست، لە ملکەچکردنی دەسەڵاتی ناوەندی، لەکارتاخناد هەڵگەڕانەوەی و رایانگەیاند کە ئیدی ئەوان سەر بە ڤەنزویلان.

ماراکائب دەمودەست پشتیوانی خۆی بۆ ئەوان راگەیاند و ژەنەراڵ پیدرۆ کاروخۆ، سەرۆکی دەستەی هەوڵی کوشتنەکەی بیست و پێنجی ئەیلوولی کە بە هاتنەناوەوە ناوبژی دەوڵەتی ڤەنزویلا لە چەنگ عەدالەت رایکردبوو، بە هانایانەوە نارد.

مۆنتیجا هەر لەگەڵ ئەم هەواڵەی زانی، ئاگاداری ژەنەراڵی کردەوە، بەڵام ئەو پێشوەخت ئاگادارکرابوو، ئەم ئاژاوە لە رێو ئاجا دەرفەتی بە ژەنەراڵ دەدا تا هێزە بەتواناو پشوخواردوەکەی لەلایەکی دیکەوە دژی ماراکائیب کۆبکاتەوە. ژەنەراڵ گوتی: "سەرەڕای ئەمانەش کاروخۆ لە دەستی ئێمەیە."

هەمان شەو لەگەڵ ئەفسەرەکانی کۆبۆوە: پلانی ستراتیژیەکی وردیان دارێژت. ژەنەراڵ شوێن و سەنگەری لەشکرەکانی سەر نەخشەی چەشنی تەختەکانی شەترەنج دەجووڵاندو تێکڕای خاسیەت و وردەکاریەکانی ئەو وولاتەو تا بچووکترین و بێنرخترین تواناو مەبەستەکانی دوژمنی لەبەرچاو دەگرت.

خوێندنێکی هێندە بەرزی سەربازی نەخوێندبوو و کەچی لە هیچ ڕوویێکەوە لەگەڵ زۆربەی ئەفسەرەکانی، کە لە باشترین قوتابخانە سەربازیەکانی ئیسپانیادا خوێندبوویان، بەراوردنەدەکرا، بەڵام دەیتوانی هەموو هەڵێك بە بچووکترین وردەکاریەکانیەوە وێنابکا. بیری ئەوەندە تیژ بوو کە دەیتوانی بەربەست و کۆسپێکی کە ساڵانێك پێشتر لە شوێنێك دیتبووی، بەبیر بێتەوە و لەگەڵ ئەمەی لە هونەرەکانی جەنگدا مامۆستا نەبوو، بەڵام هیچ کەسێك لە ڕووی بیرکردنەوەی سەربازی لەو باشتر نەدەبوو. لەگەڵ گزنگی دا، نەخشەکە بەدوا وردەکاریەکانیەوە تەواوبوو، نەخشەیەکی زۆر وردو کردەبوو، هێرشی بردنە سەر ماراکائیب بۆ کۆتایی تشرینی دووەم یان سەرەتای کانوونی یەکەم پێشبینی کرابوو، دوای تەواوکردنی دوا لێکۆڵینەوەکان لە سێ شەممەیەکی باراناوی و سعات هەشتی سەر لە بەیانی مۆنتیجا سەرنجی هەموویانی بۆ نەبوونی ژەنەراڵێکی گرانادایی ڕاکێشا.

ژەنەراڵ وتی: "هیچ ژەنەراڵێکی گرانادایی نرخیان نیەو بۆ ئەم کارە لێهاتوونین، هەموویان بەرەڵان."

مۆنتیجا بەخێرایی بابەتەکەی گۆڕی و پرسی

"ژەنەراڵ ئێوە خۆتان بۆ کوێ دەچن؟"

ژەنەراڵ وەڵامیداوە: "لەم چرکە ساتەوە کوکوتا یان ڕێوئاجا بۆ من جیاوازیان نییە."

هەڵسا بڕواو پشووبدا کە قیافەو شێوەی گرژو مۆنی ژەنەراڵ کارنیۆ پێچەوانەی گفتەکانی بەبیرهێناوە. ڕاستیەکەی ئەمەبوو کە مەبەستی بوو بەهەر نرخێکی بووە ئەو لە تەنیشت خۆی بهێڵێیتەوە. بەڵام بۆی دەرکەوت کە ئەمجارەیان ناتوانێ ڕێگای ڕۆیشتنی لێبگرێ، وەك هەمیشە دەستێکی لەناو شانیداو گوتی:

کارنیۆ، من گفتی خۆم دەگەینمە جێ، ئێوەش دەڕۆن!"

لە ڕۆژی بیست و پێنجەمی ئەیلوول مێژوویێك کە لە ڕواڵەتدا ببوو بە نیشان و هێمایەك، ئەفسەرانی بەرێخراو لەگەڵ دوو هەزار سەرباز لە کارتاخنا هاتنە دەرێ. ژەنەراڵ ماریانۆ مۆنتیجا، خۆزەفلیکس پلانکۆ و خۆزەماریا کارنیۆ، فەرماندەیی ئەو دەستە سەربازەیان لە ئەستۆ دابوو و یەکەم ئامانجیشیان دۆزینەوەی ماڵێکی گونجاو بوو لە سانتاماریا تا ژەنەراڵ تێیدا بحەوێتەوەو لە هەمانکاتیشدا ئاگای لە حاڵ و باری جەنگبێ.

ژەنەراڵ لە نامەیەکدا بۆ دۆستەکانی نووسی: "دوو ڕۆژی دیکە بۆ پشودان، وەرزش و باشکردنەوەی باری دەروونی و بەرزکردنەوەی وەرەم بەرەو سانتافە دەڕۆم، ئەم قسەش بەکردەوە جیبەجێکرا ڕۆژی دووەمی ئۆکتۆبەر لە ڕێگادا نامەیەکی بۆ ژەنەراڵ خۆستوبریستیو نووسی و تێیدا بە ئاشکرا باری خۆی

تێدا باسکرد: "من دەچمە سانتامارتا تا لەوێ جەنگاوەرانی دژی ماراکائیبۆ بپارێزم."هەروەها لە هەمان ڕۆژیشدا نامەیەکی دیکەی بۆ ئۆردانتانووسی: "من دەچمە سەردانی وولاتی سانتامارتا کە هەرگیز من ئەویم نەدیتوە تاکو ئەگەر دوژمنانێکی کاریانکردبێتە سەر بیروبۆچونی خەلکی و شتی ناڕاستیان لە مێشکنابن ڕاستیکەمەوە و لە مێشکیان دەرکەم."تەنیا ئەو کاتە بوو کە ئامانجی ڕاستەقینەی بەجۆرە دەربڕی: "دەمەوێ عەمەلیاتە جەنگیەکانی دژی ڕێو ئاچا لە نزیکەوە ببینم ، هەروەها لە ماراکائیب نزیك دەبمەوە بەلکە ڕۆلێك لە عەمەلیاتێکی گرنگدا ببینم."ئیدی وەك خانە نشینێکی شکستخواردووی ڕووبەرەو تاراوگە نەدەهاتە بەرچاو، بەلکە لە ژەنەراڵێکی ڕاستەقینەی ناوجەنگ دەچوو. بڕیاری ڕۆیشتنێکی واخێرا دراو کە دەرفەتی خواحافیزیە ڕەسمیەکان نەماو ژمارەیەکی کەمی دۆستانیش لە کاتی خۆیدا بەرۆیشتنەکەیان زانی. بۆ ئەوەی کە ئەو هەموو کەلوپەل و ناومالە لە جەنگێکی وا پڕ لەنادلنیایی لەگەڵ خۆیاندا نەبەن، ژەنەراڵ فەرمانی بە فەرناندۆ خۆزە پالاسیۆسدا کە نیوەی ئاتەجەکان بە ئامانەت لەلای دۆستان و بازرگانان دانێن. دە کیسەی پڕ لە بەلگەنامەی تایبەتی ژەنەراڵ درا بە بازرگانێکی ناوچەکە کە ناوی خوان پاباخئو بوو و بڕیاربوو بۆ ئەدریسێکی کە لە دواییدا دەیدرایە بۆ پاریسیان بنێرێ. لە نێراوەکە باسی ئەوە کرابوو کە ئەگەر خوای نەکردە شتێکی پێشبینی نەکراو هاتە پێشەوە دەبێ بیانسووتێنێ.

فرناندۆ لە دوا کاتەکاندا. لەنێوان کەلوپەلەکانی نووسینی مامیدا. بەبێ ئەوەی کە بزانێ لە کوێوە هاتووە، دووسەد ئۆنسی زێری دیتەوە و ئەویشی بە بانکێك کە ناوی بۆش و کۆمپانیاکەی بوو، سپارد.

تورەکەیەکی کە سیوپێنج مەدالیای زێری تێدابوو لەلای خوان و فرانسیسکۆ مارتین بە ئامانەتی دانا. هەروەکو پارچە مەخمەلێکیان کە دووسەدو نەوەت و چوار مەدالیای زیوی گەورەو نەوەت و شەش مەدالیای مام ناوەندی و شەست و حەوت مەدالیای بچووکی یادگاری لە زێرو زیو، کە ژمارەیەك لەوانە وێنەی ژەنەراڵیان لەسەر بوو، بە ئامانەت بەو سپارد، جگە لەمانەش کەوچك و چنگالە زێرەکانی کە لە مومپوکس لەگەڵ خۆیاندا بارکردبوو، چەند چەرچەفێکی کۆنە، دوو سەندوق کتێب، شمشێرێك لەگەڵ بەردی بە نرخ و تفەنگێکی لە کارکرایشیان لەلای ئەو بەجێهێشت. لەنێو ئەو هەموو شتە جیاجیایانەدا، چەند جووتێکیش چاوێلەکە هەبوون، کە بێسوود بوون، ژەنەراڵ لە تەمەنی سی و نۆ سالیدا لە کێشەی ریش تاشینی خۆیەوە لەوە گەیشت کە وردە وردە چاوی کزتردەبوو ژمارەی چاوێلکەکەی چاویشی پتر دەبوو تا وای لێهات چاوی یەك بست بڕی نەدەکردو نەیدەتوانی لەدووری بستێکدا بخوێنێتەوە.

هەروەها خۆزە پالاسیۆس کۆڵەپشتەیەکی کە ساڵانێك سەفەری پێکردبوو و کەس بە راستی نەیدەزانی چیتدایە. ئەوا لای خوان ددیوس ئامادۆری بە ئامانەت بەجێهێشت. خاسیەتی ژەنەراڵ ئەوهابوو کە لەیەك چرکە ساتدا بۆشتهایەکی کەم نرخ و بایەخ و کەسانێکی کە هێندە لێهاتوو نەبوون ئەم قسەیەش بەکردەوە جێبەجێکرا. نرخێکی زۆری دادەناو دیسان لە چرکەساتێکی دیکەدا لێیان بێزاردەبوو و دەیوست سەریان هەڵقەنی. هەرچەندە ئێستا ئەوەی لە توانادا نەبوو. لە ساڵی ١٨٢٦ ئەو کۆڵەپشتەی لە لیماوە بۆ سانتافە بردبوو و هەتا دوای هەوڵی کوشتنەکەی بیست و پێنجی ئەیلوول هەرکە بۆ دواجەنگ بەرەو باشوور دەگەڕاوە. جوعبەکەی پێبوو، ژەنەراڵ دەیوت: "تا کاتێك دڵنیانەبین سەر بە ئێمەیە، ناتوانین بەجێی بهێڵین."

کاتێك کەبۆ دواجار بۆ سانتافەی گەڕاوە تا نامەی وازهێنانی خۆی لەدەسەڵات بە ئەنجوومەن بدا، ئەم کۆڵەپشتە بەشێك بوو لە پاشماوەی کەلوپەلە لە ئەژمار نەهاتووەکانی. سەرئەنجام لە کارتاخناد، بڕیاریاندا زارکی کۆڵە پشتەکە بکەنەوە، بڕێکی زۆریان لەکەلوپەلە تایبەتیەکانی ژەنەراڵ لەناو کۆڵە پشتەکە دیتەوە کە ماوەیەکی زۆربوو وایاندەزانی ئەو کەلوپەلانە ونبوون:

چوارسەد و پانزە ئۆنس زێڕ، وێنەیەکی ژەنەراڵ جۆرج واشنیگتن لەگەڵ تۆپەلێك مووی قژی، تورەگەیەکی زێرینی بچووك کە دیاربوو لە لایەن پاشای بەریتانیاوە بۆیهاتبوو جوعبەیەکی زێرینی دیکە کە کلیلی ئەڵماسی لەگەڵدا بوو و ئەستێرەیەکی گەورەی پولیقی کە ئەڵماسیان لە سەرەکەی چەسپاندبوو. خۆزەپالاسیۆس هەر هەموو ئەوانەی لە ماڵی دفرانسیسکۆ مارتین بە ئەمانەت دانابوو و وەسڵێکی رەسمی و ئیمزاکراوی وەرگرت . بەڵام هێشتاش بڕێکی زۆر کەلوپەلی بێسوود هەبوون لەناو ئەوانەشدا چوار سەندوق کۆنە جلوبەرگ سەندوقێك چەرچەفی سەرمێزو دەسماڵی لە داوەدەزو چنراوی زۆر کۆنەو سەندوقێك لە هەموو جۆرە کەوچك و جنگاڵی زێرو زیو کە ژەنەراڵ ئەوانی فڕێدەدا و بەڵام نەیدەفرۆشتن. لەبەرئەمەی کە رەنگە رۆژێك دووبارە ناچاربێ پێشوازی میوانانێکی بەرێز بکا، زۆر جاران ئەوەیان بۆ پێشنیارکردبوو کە بۆ زیادکردنی ژمارەی پیاوەکانی ئەوانە بفرۆشی. بەڵام هەمیشە بەم بیانوە کە ماڵی دەوڵەتن چاوی لەمکارە پۆشی بوو.

بەکەلوپەلێکی کەمترو ژمارەیەکی کەمتری پیاوەکانی سەفەری خۆیان بەرەو تۆرباکۆ دەستپێکرد. رۆژی یەکەم هەواکەی زۆر خۆشبوو، بەڵام پێشی نیوەرۆی رۆژی دووەم دایکردە بارانێکی بەلێزمەو ناچاربوون پەنا بۆ ژێر درەختێك ببەن و شەویش لەبەرتاوی ئەو باران و بایە بەهێزەدا لەژێر هەمان درەخت بەسەر ببەن. ژەنەراڵ لەتاو ژانی سپڵ و جگەری دەیناڵاند، خۆزە پالاسیۆس لەبەر رۆشنایی ئەو زانیاریانەی لەناو کتێبێکی فەرەنسی دابوون دەرمانێکی بۆ گرتەوە. بەڵام ژان و تایەکەی گرانتربوون. بەیانی رۆژی دوایی باری ژەنەراڵ ئەوەندە ترسناك بوو کە بێهۆشی کرد. بەو حاڵەوە ئەویان بۆ گوندی

سولداد برد لەوێ یەکێك لە دۆستەکانی ژەنەراڵ کەناوی پیدرۆ خوان بیسبال بوو لە ماڵەکەیدا رایگرت قەدەری مانگێك لەو ماڵەدا ماوە و لەم ماوەدا بەرانبەری ئەو هەموو ژان و دەردانەی کە بارانەکانی مانگی تشرینی یەکەم تووشی کردبوو ددانی بەخۆیدا گرت.

سولداد[1] ناوێکی پڕ بە پێستی ئەو گوندەبوو، چوار شەقام و چەند کەچە خانووێکی تێدابوو و لە دووری دوولگوای کۆنەشاری بارانکادسن نیکولاس هەڵکەوتبوو، شارێك کە چەند ساڵێك دواتر بوو بەیەکێك لە پێشکەوترین و ئاوەدانترین شارەکانی وولاَت ژەنەراڵ هیچ پەنایەکی ئارامتر لەم گوندە و هیچ ماڵێکی باشتر لەم ماڵە بۆ سەلامەتی خۆی نەدەدۆزیەوە. ئەم خانووە شەش هەیوانی هەتاو گر و بەرۆژو رووناك و حەوشەیەکی فەراح و جوانی هەبوو کە ژەنەراڵ لەژێر سایەی درەختە تەمەن سەد ساڵیەکانیدا پیاسەی دەکرد و بیری دەکردەوە، لە پەنجەرەی ژووری نووستنەوە، چۆڵاییەکی کپ و بەشکۆ و کلیسای کاول و خانوی رەنگ شین دیاربوون.

ئارامی ئەو خانووەش هێندەی سوود بە حاڵی ئەو نەگەیاند. یەکەمین شەو سەری بە گێژەوە هات بەلاَم قبووڵی نەدەکرد کە لە لاوازی و بێهێزی خۆی بێ. بەپێێی کتێبی پزیشکی فەرەنسی نەخۆشیەکەی خۆی نارحەتییەکی مگێزی لە ژێر کاریگەری سەرمابوونێکی زۆر لێتیربووەوەو رۆماتیزمێکی کۆنی کە بەهۆی سەرمای هەوای ئەو شەوەوە لێی هەڵدابۆوە، کە دژی ئەوەش بوو لەیەك کاتدا چەند جۆرە دەرمانێك بەکاربێنێ ، چەندین پزیشکیان بۆ هەنارد، بەلاَم رێگەی نەدا چارەسەری بکەن، لەگەڵ ئەمەشدا هەمیشە لەکەمی پزیشکان سکالاَی دەکرد، سەرهەنگ ویلسۆن لە نامەیەکدا کە ئەو رۆژانە بۆ باوکی نووسی، ئاگاداریکرد، کە ژەنەراڵ هەر کاتێك بمرێ دەمرێ و قبووڵنەکردنی پزیشکانی لەبەرئەوە نییە گیانی خۆی خۆشناوێ. بەڵکە لە تێگەیشتنی راست و گەشبینەوەیتی. ویلسۆن دەیگوت لە راستیدا نەخۆشی تاکە دوژمنێکە کە ژەنەراڵ پێی هەراساندەبێ و نیشان بەو نیشانە کە نایەوێ لە مەسەلەکانی دیکە دواکەوێ، لەبەرئەوەیە نایەوێ لەگەڵ نەخۆشیدا ڕووبەڕووبێتەوە. ژەنەراڵ پێشتر وتبووی: "ڕووبەڕوو بوونەوەی لەگەڵ نەخۆشی دا و چاودێریکردنی وەك کارکردن لەناو کەشتیدا وایە."چوار ساڵ پێشتر لە لیما. کاتی ئامادەکردنی قانوونی بنەڕەتی پۆلیڤیا، ئالری بۆ ژەنەراڵی پێشنیارکردبوو کە تەنیا دەرمانێك بەکاربێنێ . لە وەلاَمی ئەویشدا زۆر لێبڕاوانە وتبوی: "ناکرێ هاوکات لە دوو پێشبرکێدا ببرێتەوە."

بەڕواڵەت ژەنەراڵ باوەڕی بەوە بوو کە کارو بزووتنەوەی چەکێکی باشە لە دژی نەخۆشی. فرناندۆ باریگا بە عادەت بەروانکەیەکی بەبەر ژەنەراڵەوە دەبەست و بە کەوچکان خواردنی لەدەم دەکرد. ژەنەراڵ لە کپی و بێدەنگیەك خواردنەکەی دەجوی و تا دوای تەواوبوونیشی . وەك منداڵان، دەمی بۆ

---

١ سولداد: لە زمانی ئیسپاندا ماناکەی تەنیایی و گۆشەگیر یە .

کەوچکێکی دیکە دەکردەوە. بەڵام ئەو ڕۆژانە، قاپەکەی لە فرناندۆ وەردەگرت و بەبێ بەروانکە، خۆی خواردنەکەی دەخوارد تا هەموو بەوەیانزانی کە هێشتا دەروەستی کارەکانی خۆی دێ.

هەموو کات ژەنەراڵ هەوڵیدەدا ئەو کارانەی کە هەمیشە خزمەتکارو یاریدەدەرەکانی بۆیاندەکرد، خۆی بیانکا، دڵی خۆزەپالاسیۆس دەشکا، بەتایبەتی جارێکیان کە ژەنەراڵ لە کاتی پڕکردنی شووشە مەرەکەبێك هەمووی بەخۆیدا ڕێژت. لەگەڵ ئەوەشدا نەخۆشبوو هەموو هەفتەیەك نینۆکەکانی دەکردو هەموو ڕۆژێك ڕێکی دەخستن. هیچ کاتێك دەستی نەدەلەرزی و لەم لایەنەوە هەموو بە باش باسیان دەکرد.

لە گوندی سولدادیش، کاتێك کە ردێنی دەتاشی، لە ئەندێشەیەکی بە ڕواڵەت ئەنگێزەکەی لە سەردەمی منداڵیەوە هاتبێ ڕۆچۆ، مشتێك لەمووەسپییەکان کە هەر کەمێکی لێ مابۆوە، تراشی، لە دواییدا بە ئاگاییەکی زۆرترەوە، مشتێکی دیکەی لەمووەکانی قژی و ئەو کاتە هەر هەمووی بەبێ هیچ یاسا ڕێسایەك چەشنی چیمەن کورتکردەوەو لەو کاتەدا چەند بەیتێکی لە شیعری بەناوبانگی لائارائوکانای لەبەرخۆیەوە دەگوت. کاتێك کە خۆزەپالاسیۆس خۆی بە ژووریداکرد تا بزانێ ژەنەراڵ لەگەڵ کێ دەدوێ، ئەوی دیت خەریکی تراشینی سەری خۆیەتی. سەرئەنجام هەموو سەری خۆی لە کۆڵکدا.

بەدرێژایی ڕۆژ کڵاوێکی ئاوریشمی لەسەردەنا و شەوان کڵاوێکی ڕەنگاوڕەنگی خەوی لەسەردەنا، بەڵام نەیدەتوانی لەهەمبەر ئەو باسە ساردانە و لاوازیەی سەرتاپای لەشی خۆی ڕاگرێ. لە تاریکی و تنۆکی شەودا هەڵدەستا و لە ژێر ڕووناکایی تریفەی مانگەشەودا پیاسەی دەکرد. بەڵام ئیدی رووت نەبوو و هەتا لەو شەوە گەرمانەشدا پەتوێکی لە خۆی لوولدەدا. بەرەبەرە بەدرێژایی ڕۆژ، پەتوشی بۆ بەسنەبوو و کڵاوە ڕەنگاوڕەنگیەکەی نووستنیشی لەسەر کڵاوە ئاوریشمیەکە لەسەردەنا.

فرتوفێڵۆکەلەکبازی نیزامیانو خراپ کەڵك وەرگرتنی سیاستمەداران ژەنەراڵی بەشێوەیەك توورە کردبوو کە ڕۆژێك بە توورەییەوە مشتەکۆڵەیەکی بە مێزەکەدا کوتاو گوتی ئیدی توانای هیچ کامێکیانم نەماوە.

هاواری کرد: "بڵێن سیلدارە تا چیدی نەیەنەلام."بڕیارەکەی زۆر بەراستی بوو کە ئەنجامدانی ڕێو ڕەسم و پۆشینی جلوبەرگی سەربازی لەماڵەوە قەدەغەکرد. بەڵام بەبێی ئەوان نەیدەتوانی بژی و بەمجۆرە بوو کە بە پێچەوانەی فرمانێکی کە خۆی دەریکردبوو درێژەی بە سەردانە گشتی و تایبەتیە بێسوودو بەرهەمەکانی دا. لەو وەختەدا حاڵی هێندە جێگای

ترسبوو کە سەرئەنجام ئامادەبوو پزیشکی بێتەلای. بەم مەرجەی کە نەچارەسەری بکا. نە لە بارەی نەخۆشیەکانی پرسیاربکا، نە دەرمانێکیشی بۆ بنووسێ کە بیخوا.

ژەنەراڵ گوتی: "تەنیا بۆ هاودەمی."

پزیشکێکیان دۆزیەوە ناوی هیرکولیس گاستل بەندۆ بوو، پیرەمێردێکی سەر رووتاوەی قەڵەو چالاك رووخۆش و ددان بەخۆداگر کە هەر سەبرو هێمنیەکەی ژانی هەموو دەردێکی دەڕەواندەوە. لەسەرانسەری ناوچەکەدا زانیاری و هەڵسوکەوت و ڕەچێتەی دەرمانەکانی زۆر بەناوبانگ بوو. ئەمەش ئەو دکتۆرە بوو ئەو خاسیەتانەی تێدابوو کە ژەنەراڵ داوای دەکردو لەمەش باشتر پەیدانەدەبوو. خامەی شوکلاتەو پەنیری بۆ چارەسەرکردنی زەرتك دەنووسی و ئامۆژگاری دەکرد کە لە کاتی سەردڵ سەنگینی و هەرس نەکردنی خۆراکدا عیشقبازی بکرێ باشە . چونکە ئەم کارە تەمەن درێژدەکا. هەمیشە جگەرەی گەورە گەورەی کە خۆی بە کاغەزی ئەستوور دەیپێچانەوە دەکێشا بۆ نەخۆشەکانیشی دەنووسی تا بۆ چاکبوونەوە لە هەر نەخۆشیەك بیکێشن. نەخۆشەکان خۆیان دەیانگوت کەوا ئەو هیچ کاتێك بە تەواوی چارەمان ناکا ، بەڵکە بە قسە خۆشەکانی سەرپەشیتمان دەکاو چارەماندەکا، دکتۆر بەم قسەپێدەکەنی و دەیگوت:

"ژمارەی ئەو نەخۆشانەی کە لە ژێر دەستی پزیشکەکانی دیکەدا دەمرن لەگەڵ ئەوانەی لە ژێر دەستی مندا دەمرن، جیاوازیان نییە، بەڵام نەخۆشەکانی من خۆشحاڵتر و رازی تر دەمرن."

ئەو بەگالیسکەی جەنابی بارتولومە مولینارس گەیشتەجێ. بەرێز مولینارس تا ئەو حەلەی کە ژەنەراڵ سەردانەکانی قەدەغەکرد، هەموو رۆژێك جۆرەها میوانی دەهێناو دەبرد. کراسێکی کەتانی ئوتونەکراوی لەبەردابوو و گیرفانەکانی پڕ بوون لە جۆرەها نوقل و شیرینی. کاتی گەیشتنی باراندەباری و شڕە سەیوانێکی ئەوتۆی بە دەستەوەبوو کە بەهۆیەوە گیانی زیاتر تەڕدەبوو، دوای سڵاوکردن و بەر لە هەر شتێك لەبەر بۆنی ناخۆشی ئەو جگەرەی کە تا نیوەی کێشابوو عوزاخوایی کرد. ژەنەراڵ ژەنەراڵ نەتەنیاو لەو وەختەدا ، بەڵکە هیچ کاتێك نەیدەتوانی بۆنی جگەرە بکا، بەڵام پێشەکی ئەوی بوردبوو، ژەنەراڵ بە دکتۆری وت: "مەسەلەیەك نییە. من راهاتوم مانوێلا تا لەناو نوێنیشدا جگەرەی دەکێشا، جگەرەی ئەو بۆنی زۆر لە جگەرەکانی ئێوە ناخۆشتر بوو، سەرەڕای ئەوە ئەو چەڕە دووکەڵی جگەرەکەی زۆر زیاتر بەبەردەم و چاو و لووتی مندا وەردەکرد."

دکتۆر کاستیل ئەمەی بە هەلەزانی، لە ژەنەراڵی پرسی: "بەراست حاڵ و باریان چۆنە؟"

ژەنەراڵ پرسی: "حاڵ و باری کێ؟"

دکتۆر وتی: "دونیا و مانوێلا."

ژەنەراڵ بە وشكیەكەوە وەڵامیداوە: "باشە."

ژەنەراڵ ئەوەندە روون و ئاشكرا بابەتی قسەكانی وەرگێڕا كە دكتۆر بۆ شاردنەوەی بێشەرمیەكەی خۆی پێكەنینی گرت. ژەنەراڵ گومانی نەبوو دەیزانی كە تاقمەكەی لەگەڵیدان بە هەموو كەتن و كوكە و عیشقبازیەكانی دەزانن، هیچ كاتێك لەمەڕ ئەڤینداریەكانیەوە نەدوابوو. بەڵام چیرۆكەكە ئەوەندە دەنگیدابۆوە كە هەموو خەڵكی لە نهێنییەكانی ناو ژووری نووستنەكەیشی بە ئاگابوون. سێ مانگی دەویست تا نامەیەكی ئاسایی لە لیماوە بگاتە كارتاخناد، بەڵام چیرۆكە خۆشەویستەكانی پەیوەندیان بە ژەنەراڵەوە بوو بەبا بڵاودەبوونەوەو بەرگوێی هەموو كەسێك دەكەوتن. پرۆپاگەندە وەك سێبەر لێی نەدەبوونەوە.

بۆ هەمیشەش دەبووە مۆرو بە مەعشوقەكانیەوە دەنرا، بەڵام ئەو نهێنیە عاشقانەكانی زۆر بە پیرۆز دەزانی و یەكبین بەدوای ئەوەوە بوو كە وەپەنایان دا. جگە لە خۆزەپالاسیۆس كە مەحرەمی نهێنییەكانی بوو، كەس كەس هیچ جۆرە بێوەفاییەكی لە ژەنەراڵ بەرانبەری ئەو ژنانە نەدیتبوو كە لەگەڵیاندا ژیابوو.

جگە لەم رووداوە بچووكە كە بوونی دكتۆر گاستل بەندۆ بۆ ئەو موجیزەیەك بوو. دكتۆر ئەوی بە كارەسەرسامكەرەكانی هێنابۆوە سەرخۆ شتی حەنتیكۆكەی دەدا ژەنەراڵ شەكۆركەی [1] بەشێوەی گیانلەبەران دروستكراو نانە برنج و شوكولاتەی شێوە بادەمی بۆ رادەگرت و ئەویش وەك رێزلێنانێك قبوڵی دەكردو بۆ خۆخەریككردن دەیخوادن. رۆژێك سكاڵایكرد كە ئەم شتانە وا دەكەن هەست بەبرسیەتی نەكا. بەڵام كێشیش زیاد ناكا. ئەمە ئەو شتە بوو كە دكتۆر دەیویست. دكتۆر لە وەڵامی ژەنەراڵدا وتی:

"قوربان خۆت نارِحەت نەكەی، هەر چشتێكی كە بكەوێـە ناو دەمەوە قەڵەودەكاو هەرشتێكی كە لێیەوە دەرچێ لاوازیدەكا."بە بۆچونی ژەنەراڵ ئەم نموونە و نیشانە هێندە سەرنجراكێش بوو ئەوەندەش پێكەنیناوی بوو كە قبوڵی كرد لەگەڵ دكتۆر پەرداخێك شەراب و پیاڵەیەك ساگۆ [2] بنۆشی.

بەڵام هەرچیەكی كە دكتۆر بەسەرپەشتی و چاودێری بەهێزی دەكردەوە ئەوا بە هەواڵی ناخۆش و نەخۆش و لاوازدەبوو و لەبەین دەچوو.

كەسێك بۆ ژەنەراڵ گێڕاوە كە خاوەن ماڵەكەی كارتاخنا، تەخت و ڕایەخ و تەژگەبەر و هەرچییەكی ژەنەراڵی دەستی بەركەوتبوو لە ترسی بڵاوەبوونی نەخۆشی ئاگری تێبەرداوە و

---

١ شەكرۆكە: لە دەڤەرێكی فراوانی كوردستان بە نوقل دەڵێن وە (شەكر ) یشی پێدەڵێن ، هەروەها (نزش و شیرینی ) یشی پێدەڵێن .

٢ ساگۆ: دەبێ خواردنەوەیەك بێ.

سووتاندوویتی. فرمانی بەدۆن خوان ئامادۆردا لەو پارەی کە لای دانابوو، کرێ و لە هەرشتیکی زیان بە ماڵەکە گەیشتوەو نرخی شتە سووتاوەکانیش بدا. بەڵام دیسانەوەش نەیتوانی نارحەتیەکانی خۆی سووك بکا.

چەند رۆژێك دواتر کاتێك کە ژەنەراڵ پێزانی کە دۆن خواکین موسکرا، لەسەر رێگای خۆی بەرەو وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. بەوێدا تێپەڕیوەو نەشهاتۆتە سەردانی ئەو، لەشی زێتر تێکچوو. ژەنەراڵ بەبێ ئەوەی نارحەتیەکەی وەشێرێ. لە هەموو کەسێك لەمبارەوە پرسیاری کرد و لە دواییدا زانی کە موسکرا یەك هەفتە لە چاوەڕێی کەشتی دا لەم شارەبووە و لەم ماوەدا لەگەڵ زۆر لە دۆست و دوژمنانی ئەو چاویان پێککەوتوەو لەگەڵ هەمووانیش لەسەر ناشوکریەکانی ژەنەراڵ گوتوبێژی کردوە.

موسکرا کاتی سواربوونی کەشتی باوەڕی خۆی بۆ ئەو کەسانە روونکردبۆوە کە بۆ بەرێکردنی چووبوون و پێی گوتبوون: "ئەم قسەیەم بەباشی لە مێشکی خۆتان بچەقێنن، ئەم پیاوە هیچ کەسێکی ناوێ و کەسیشی خۆشناوێ."

خۆزەپلاسێوس چاك دەیزانی کە ژەنەراڵ لە ئاست ئەم تەرزە قسانە چەندە هەستدارە بۆ ژەنەراڵ هیچ شتێك لەمە ناخۆشتر نەبوو کەسێك هەبێ کە هەست و خۆشەویستی و پەیوەندی ئەو بخاتە ژێر پرسیارو گومانەوە.

ئەو لە دەستی دەهات ئوقیانووس و کێوی هەزار بە هەزار بخاتە ژێر پێیەکانیەوە و بەهێزە پڕ لە تواناسەر لێشێواندنەکەی لەو کەسە بگەیەنێ کە ئەو بە هەڵە داچووە. لەو پەڕی شکۆ و گەورەیی دا شاجوانی شار ئەنکوستورا دلفیناگو ئاردیولا، لەبەر هەوەس بازیەکانی ژەنەراڵ دەرگای ماڵەکەی بە روویدا پێوە دابۆوە و پێی وتبوو: "ئێوە، ژەنەراڵ دیارترین پیاوێکن کە دەتانناسم، بەڵام عاشقی بۆ ئێوە نەهاتووە."

ژەنەراڵ لە پەنجەرەی موبەقی ماڵەکەوە چووە ژووریێ و سێ رۆژی تێداماوە تا ئەو کاتەی دڵ و باوەڕی دلفنیای بەدەستهێنا، بەڵام لەو ماوانەدا نەك هەر تەنیا نزیك بوو لە جەنگێك شکستبێنێ، بەڵکە هێندەی نەمابوو کە گیانیشی لەدەستبدا.

موسکرا لەوە دووربوو ژەنەراڵ دەستی پێی بگا، بەڵام ژەنەراڵ لەمەڕ موسکراوە کینەی خۆی بۆ هەموو کەسێك باس دەکرد. هەرچی کارێکی کە بۆیکردبوو دەخستەوە بیری، چەندەی یارمەتیدابوو و تا ببێتە ئەو کەسەی کە هەیەو تاوەکو کوێ و کوێ و چڕادەیەك ناچار بووە نەزانی و لە خۆبایی لادێیانەی ئەو تەحەمولبکا.

بۆ ئەوەی دڵنیابێ کە موسکرا لە هەر کوێیەك هەیە دەنگی ئەوی دەگاتێ ئەوا نامەیەکی توندو تیژو دوورودرێژی بۆ یەکێك لە دۆستە هاوبەشەکەیان نووسی. ئەو هەواڵانەی کە نەدەگەیشتن ئەوی لە تاریکایی و نادیاریەکی تەمومژاویدا نقوم دەکرد. ئۆردانتا هێشتا وەڵامی نامەکانی نەدابۆوە. بریسنیۆ مەندز، پیاوی باوەڕپێکراوی ژەنەراڵ لە ڤەنزویلاوە سەبەتەیەك میوەی جامایکی کە ژەنەراڵ زۆری حەزلێدەکردن. بۆ ناردبوو، بەڵام ئەو کەسەی کە پێیدا ناردبوو لە نیوەی رێگادا نقومببوو، خۆستۆ بریسنیۆ کە لە سنووری رۆژهەڵاتدابوو بە کارەکانی ژەنەراڵی داماوکردبوو. بێدەنگی ئۆردانتا وولاتی تاریك کردبوو، هەروەها مەرگی فرناندز مادرید نوێنەری ژەنەراڵ لە لەندەن دنیای تاریك داهێنا. ژەنەراڵ نەیدەزانی کە لە هەمان کاتدا کە لە ئوردانتا بێ ئاگابوو، ئەو پەیوەندی لەگەڵ ئەفسەرەکانی هەبوو و داوای لێکردبوون کە وەڵامێکی یەکجارەکی لە ژەنەراڵ وەرگرن. بۆ ئالری نووسیبوو"دەبێ هەر بزانین کە ئایا ژەنەراڵ سەرۆکایەتی کۆمار قبوڵ دەکا یان نا؟ ئایا ناچارین کە هەموو ژیانمان هەر بەدوای مۆتەکەیدا ڕابکەین کە پێشوەخت دەزانین قەت نایگەنینێ؟"نەك هەر تەنیا ئالری بەڵکە هیتریش هەوڵیاندا کە لە گوتوبێژە ئاسایی و نارەسمیەکاندا وەڵامێك لە ژەنەراڵ ببیەن بەڵام ژەنەراڵ بەردەوام بە رێگایەك لە وەڵامی یەکجارەکی خۆیدەدزیەوە.

هەواڵێکی باوەڕپێکراوی کە لە بارەی رێو ئاچاوە پێیانگەیشت. گەلێ لەوە خراپتر بوو لەوەی چاوەڕێدەکرا. بەپێی بڕیارێکی پێشوەخت ژەنەراڵ مانوێل بالدس لە رۆژی بیستەمی تشیرینی یەکەمدا شاری رێو ئاچاری بەبێ هیچ بەرگریەك داگیرکردبوو. بەڵام بە ماوەی هەفتەیەك لەپەلوپۆی خست بالدس دەستکێشانەوەی خۆی پێشکەێش بە مۆنتیجا کرد. ئەم کارەی کە بالدس بە شانازی تێدەگەیشت زۆر بێنرخ هاتە بەرچاوی ژەنەراڵ: ژەنەراڵ وتی: "ئەم گەماڵبابە لە ترسا دڵی وەستاوە."بەپێی پلانێکی پێشتر بۆ کێشراو تەنیا پانزە رۆژی مابوو هێرش ببەنە سەر ماراکائب، بەڵام تازە ئیدی تا داگیرکردنی رێو ئاچاش لە خەونێك بەو لاوە شتێکی دیکە نەبوو. ژەنەراڵ هاواریکرد: "سەردەستەی ژەنەراڵەکانم نەیتوانی ئاژاوەی سەربازگەیەك سەرکوتبکا."

ژەنەراڵ دوایی ئاگادارکراوە کە خەڵکی لەبەر لەشکرو سوپای دەوڵەت رادەکەن. چونکە ئەوان لەشکرو ژەنەراڵیان بەبکوژی ئەدمیرال پادیجای قارەمانی خۆشەویستی رێوئاچا دەزانن. ئەم هەواڵە پتر لە هەواڵەکانی دیکە هەست و دڵی ژەنەراڵیان بریندار کرد. جگە لەمەش ئەم کارەسات و بەدبەختیە بە هەموو وڵاتدا بڵاوببۆوە. سەرانسەری وڵات رووبەڕووی ئاژاوە ببۆوە و دەوڵەتەکەی ئۆردانتا بە هیچ کلۆجێك نەیدەتوانی جڵەوگیری بارەکەبێ.

دکتۆر گاستل بەندۆ بەدیتنی ژەنەراڵ کە بەرانبەری یەکێك لە نێراوە تایبەتیەکان بە تووڕەیی سووکایەتی بەدەوڵەت دەکرد لەو هێزەی کەسەرچاوەی ئەو هەموو تووڕەییە بوو ، سەرسامبوو ، ژەنەراڵ دەینەڕاند: "ئەم دەوڵەتە لەعنەتیە تێکچووە، لەباتی ئەوەی کە خەڵکی بەگەڕبخاو بایەخیان پێبدا، شەپڕەی لە کارەکانیان داوە. ئەم دەوڵەتە دنیا دەخواو ئیدی بۆ جاری سێیەم دروست نابێتەوە. لەبەرئەوەی تێکڕای ئەو کەسانەی کە پێکیدەهێنن و ئەوانەی کە دەیپارێزن لەنێو دەچن."

هەموو هەوڵەکانی دکتۆر بۆ هێوکردنەوەی ژەنەراڵ کەڵکیان نەگرت. دوای ئەوەی کە سووکایەتیکردنەکانی تەواوبوو بەدەنگێکی گیراوەوە سەرانی لەشکری دا بەرجوێنان. لە بارەی سەرهەنگ خوئاکین باریگای قارەمانی سێ جەنگی زۆر گرنگەوە گوتی کە مرۆڤێکی زۆر خراپ و بێکەڵکە و تا دەگاتە ئەوەی وەك پیاو کوژ ناویهێنا. لەمەڕ ژەنەراڵ پیدرۆمارگی تیۆوە کە بەناو لە کوشتنی سوکرە پشکدار بوو، گوتی پیاوێکی بێچارەیە هی فەرماندەیی لەشکرێك نییە. لەسەر ژەنەراڵ گوترا لسی باشترین کەسی کە لە کائوکا هەیبوو، بە دەستەواژەیەکی بێبەزەییانە بۆچوونی خۆی دەربڕی: "لە مرۆڤێکی مردۆخ دینۆ[1] بەو لاوە شتێکی دیکەی تێدا بەستە نییە."

رەنگی پەڕیبوو لەسەر کورسیەك دانیشت تا پشووێك بدا لەو کاتەدا دکتۆر گاستل بەندۆی دیت کە بەسەر سامی لەناو چوارچێوەی دەرگادا وەستابوو، دەنگی هەڵبری وتی: "لە کەسێکی کە دوو خانوو لە خانووەکانی خۆی لە تاسبازی[2] دۆڕاند، ناکرێ چاوەڕێی زێتری لێبکرێ."

دکتۆر گاستی بەندۆ حەپەسابوو.

لە ژەنەراڵی پرسی: "لەبارەی کێوە قسە دەکەین."

ژەنەراڵ وەڵامیداوە:

"لەبارەی ئۆردانتا، لە ماراکائب خانووەکانی دۆڕاندە دەریاوانێك."

بەڵام لەسەر کاغەز بەشێوەیێیەکی واینووسی کە وەك ئەوەی فرۆشتبنی."

پشیەکی [3] تازەی هەڵکێشا. دوایی دەستپێ کردەوە: "بەڵام ئەمانە هەموویان بەبەراوردکردنیان لەگەڵ سانتاندر مرۆڤی باشن. برادەرانی لە یارمەتیە داراییەکانی بەریتانیایان دەدزیەوە و بەم پارە لە بازارشتومەکی دەوڵەتیان بەیەك لەسەر دەی نرخی خۆی دەکری و لە دواییدا دەوڵەت سەدا سەد پولی

---

١ دینۆ: شێت.

٢ تاسبازی : دیارە جۆرە قومارێکە

٣پشی : بین/ هەناسە ، وشەی پشی لەگەڵ پشو و جیاوازە.

بەواندەداوە."لێرەدا روونیکردەوە کە بەربەرەکانیکردنی قەرزی دەرەکی لەبەر بەرگرتن لەم خراپ بەکارهێنان و گەندەڵیە نەبوو، بەڵکە ئەو قەرزانەی بەترسێك لەسەر ئەو سەربەخۆییە دەزانی، کە ئەم هەموو خوێنەی لە پێناودا رژێنرا.

ژەنەراڵ گوتی: "نەفرەت لە قەرزاربوونمان بە ئیسپانیا دەکەم، هەر لەبەر ئەوەبوو کە ئاگاداری سانتاندرم کرد کە ئەگەر قەرز لە دەرەوە وەرگرین، ئەوا هەرچییەکی بۆ وڵاتەکە بکەین بێسوود دەبێ، چونکە دەبێ چەند سەدەیەك سوودەکەی بدەینەوە، هەنووکە ئەنجامی ئەوە بەڕوونی دەبینم، سەرەنجام ئەم قەرزانە ئێمە سەرەو نخوون دەکەن."

لە هەوەڵ هەوڵەوە، ژەنەراڵ لەگەڵ بڕیاری ئۆردانتا کە بناغەکەی لەسەر پاراستنی گیانی شکست خواردوەکان بوو، وەك بابەتێکی ئەخلاقی نوێی لە جەنگدا دەزانی و دەیگوت: "دوژمنانی ئێمە نابێ کارێك لەگەڵ ئێمەدا بکەن کە ئێمە لەگەڵ ئیسپانیەکانماندا کرد."مەخسەدی کوشتاری بێبەزەییانەبوو، بەڵام لەو شەوە نافرەجایانەی گوندی سولداد لە نامەیەکیدا بۆ ئۆردانتای نووسی کە لە تەواوی جەنگەکانی ناوەخۆدا تەنیا لایەنێکی کە ستەمگەرتر بووە توانیویەتی سەرکەوێ.

بە دکتۆری وت: "باوەڕبکەن دکتۆر، سەرکەوتن و ژیانمان دەکرێ تەنیا بەرێژیتنی خوێنی دوژمنانمان بپارێزین."

لە هیکرا تورەییەکەی بە هەمان خێرایی کە دەستپێکردبوو، قوتداوە و کەوتە بەرگریکردن لەو ئەفسەرانەی کە هەر ئێستا ریسوایکردن، پاکانەی بۆ هەموان کرد، ژەنەراڵ گوتی: "بەهەر حاڵ من بەهەڵەداچووم، ئەوان تەنیا دەیانویست سەربەخۆیی بێتە دەست کە مەسەلەیەکی بەپەلەو حەتمی بوو و لە راستیدا زۆرباش کاریانکردوە."دەستە ئێسقاویەکانی بۆلای دکتۆر درێژکرد تا دەستەبەری راستبوونەوەی بکا. ئاهێکی هەڵکێشاو گوتی:

"من لە ناو خەون و خەیاڵاتێك بەدوای شتێکەوە بووم کە هەر نەبووە."لەو رۆژانەدا باری ئایتوربیدە روونبۆوە، لە دوا دوای مانگی تشرینی یەکەمدا نامەیەکی لە دایکی ئاتۆربێدە، کە لە جۆرج تاون دەژیا، پێگەیشت، کە تێیدا نووسیبووی کە بەهۆی بەرەو پێشەوە چوونی هێزی لیبرالەکانەوە لە مەکسیك، هیوای گەڕانەوەی خێزانەکەی بۆ وڵات هەموو دەم کەمتر دەبێتەوە.

ئێستا ئەم نائارامی و دڵنیایی نەبوونە، هاودەم لەگەڵ نائارامی دەروونی و پاشماوەی دوو دڵیەکی سەردەمانی منداڵی، بارەکانی بۆ ئەو زۆر لە توانابەدەرکردبوو. لە خۆشبەختیدا، رۆژێکیان دوای نیوەڕۆ کە لەگەڵ ژەنەراڵدا لە سالۆنەکەی ماڵەوە پیاسەیان دەکرد، ژەنەراڵ باسێکی چاوەڕێنەکراوی هێناوە بیریان.

ژەنەراڵ وتی: "لە مەکسیك تەنیا یەك بیرەوەری خراپم هەیە، لەبەندەری براکروز، سەگە دەستەمۆکانی دەریاوانێك دوو سەگی منیان کوشت، کە دەمویست لەگەڵ خۆمدا بۆ ئیسپانیایان ببەم."

ئەوساکە وتی: "کە بەهەر حاڵ ئەو سەفەرە، یەکەم تاقیکردنەوەی بوو لە دنیادا و کارێکی قووڵی لەسەر ژیانی ئەودا هەبووە. لە شوباتی ١٧٩٩ لە یەکەمین سەفەری بۆ ئەوروپا، وادانرابوو کە بەرئەگروز یەکەم شوێنی وەستانی بێ، بەڵام بەهۆی گەمارۆی سەر لاهابانا لەلایەن ئینگلیزەکانەوە، کە ئێستگەیەکی دواتر بوو، ناچار ژەنەراڵ دوو مانگ لە پراکروز ماوە. ئەم دواکەوتنە دەرفەتێکی باشبوو تا بە گالیسکە بچێتە مەکسیکۆسیتی، لەبەر ئەم کارەی ناچار بوو لە نێوان کون و زارکی گڕکانی پڕ لە بەفرو بیابانی سەرسامکەردا تێپەڕێ و تا سێ هەزار مەتر بە بەرزاییاندا سەرکەوێ، ئەم دیمەنانە لەگەڵ دیمەنەکانی گەلی ئاراگوا[١]، شوێنێکی کە تا ئەو کاتە تێیدا ژیابوو هیچ رووداوێکی لێکچووی نەبوو، ژەنەراڵ وتی: "بیرم کردەوە کە لە راستیدا دەبێ مانگ بەم شێوەی هەبێ."

لە مەکسیکۆسیتی پاکی هەواکەی و بازارە گشتییەکانی زۆر سەری ئەویان سوڕماند. بازارەکان گەورەو پاك و خاوێن بوون کرمی درەختان و کرمی ئاوی هەرچی جرۆجانەوەرێکی وەك مێرووله و پێشوولە و مێرووی رەش، پشیلەی کێوی، سیسرکەی شین، مێشەنگوین، ماری رەنگاوڕەنگ، جۆرەها پەلەوەر، تولەسەگ بەردەوام هەڵدەدرانە ئاسمان و بۆ خواردن دەیانفرۆشتن.

ژەنەراڵ گوتی: "هەرچی بجوولێتەوە، دەیخۆن."ژەنەراڵ زۆری حەز لەو ئاوە ساف و بێگەردە دەکرد کە لە جۆگەکانی ناوەڕاستی شاردا تێدەپەڕین، هەروەها لەو قەیاغ و بەلەمانەی کە بەجۆرەها رەنگی دڵخۆشکەر رازێنرابوونەوە و زۆری و جوانی گوڵەکانی زۆر لەبەر دڵ بوو. بەڵام رۆژە کورتەکانی شوبات، هاوولاتیانی غەمزەدە، بارانی بەردەوام و هەموو ئەو شتانەی لە سانتافە لیما، لاپاز و بەدرێژی و پانی زنجیرە چیای ئاند دڵی ئەویان پڕ کوێن دەکرد، ئەوا هەموویانی بۆ یەکەمجار لەم شارە هەستپێکردو خەم دایگرت قەشەیەکی کە چاوەدێری ژەنەراڵی دەکرد، بردیە دیداری فەرماندار.

ئەم دیدارە زۆر رەسمیانە هاتەبەر چاوی ژەنەراڵ. فەرمانڕەوا بەو کوڕۆکە رەشتاڵە مردۆخ و لاوازەی کە جلوبەرگی مۆدەی لەبەردابوو، و خۆی بە پارێزگاری شۆڕشی فەرەنسا ناساندبوو، هێندەی بایەخ نەدا، ژەنەراڵ بە پێکەنینەوە وتی: "خەریك بوو سەری خۆم لەسەر ئەم قسانە دانێم، بەڵام وایدەزانی کە

[١] ئاراگوا: گەلیەکە لە ڤەنزویلا.

دەبێ لەگەڵ فەرمانڕەوایەکدا لەبارەی سیاسەتەوە قسەبکرێ. ئەو کاتە لە تەمەنی شازدە ساڵێدا هیچی دیکەم نەدەزانیێ."بەر لەوەی ڕێی سەفەرەکەی بگرێـتە بەر نامەیەکی بۆ مامی دۆن پیدرۆ پالاسیو ئای سۆخۆ نووسی. ئەمە یەکەم نامەیبوو کە لە دوای بەجێما، ژەنەراڵ کە لە قاقایەکی پێکەنینی دابوو وتی: دەستخەتم ئەوەندە ناخۆشبوو کە تەنیا خۆشم بۆم نەدەخوێندراوە بەڵام هەر چۆنێبێ بۆمامم روونکردەوە کە چۆن چۆنی شەکەتی سەفەرم لە خۆم دەردەکرد."

لەلاپەرەونیوێکدا چل هەڵەی نووسینی هەبوو. ئایتۆربیدە هیچی نەدەوت، چونکە بیرەوەری و یادگاری ورد وردی لە مەکسیك نەبوو. تەنیا بیرەوەریەکی کە هەیبوو خراپتربوونی باری خێزانەکەی بوو و ژەنەراڵ بە تەواوی بەمەی دەزانی.

ژەنەراڵ پێی وت: "هاوکاری لەگەڵ ئۆردانتا مەکەن. بە خاوو خێزانەکانیشتانەوە بۆ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا مەچون. کە لەوێ چیرۆکی ئازادیمان بۆ باسدەکەن و سەرەنجام دەمانهاوێنە ناو هەژاری و بێچارەییەوە."

ئەم قسە زریانێکی لە دەریایی نائارام و گوماناوی و دوو دڵی ئایتور بیدەدا هەڵکرد. ئایتۆر بیدە وتی: "ژەنەراڵ من دەترسم."

ژەنەراڵ بە دەنگێکی هێدی و لەسەر خۆوە ووتی: "ئێوە نابێ بترسن، هەتا ئەگەر بشتان کوژن یا بشمرن، برۆن بۆ مەکسیك تا گەنجی برۆ ئەگینا رۆژێك دادێ بۆ ئەم کارە درەنگ دەبێ و لەو وەختەدا ئیدی نە پەیوەندیت بێرەوە هەیە و نەبەوێوە خۆتان لە هەردوولادا بە نامۆ دەزانن و خۆتان بە بێگانە دەزانن و ئەمەش لە مردن ناخۆشترە: "ژەنەراڵ راستەوخۆ چاوی لە چاوەکانی ئایتۆر بیدەبڕی، دەستی لەسەر سینگی دانا و وتی: "هەرچیەك لەناو ئەم سنگەتدایە بۆم هەڵڕێژەو قسەی دڵی خۆتم بۆبکە"

بەمجۆرە ئایتۆربیدە لەسەرەتاکانی مانگی کانوونی یەکەمدا بەرەو سانتافە چوو، لە بارێکدا کە دوو نامەی لە ژەنەراڵ بۆ ئۆردانتا پێبوو، لە نامەی یەکەمدا نووسرابوو کە ئایتۆربیدە، ویلسۆن و فرناندۆ باوەڕپێکراوترین کەسانی ژەنەراڵن، ئایتۆر بیدە تا نیسانی ساڵی پاشترێ بەبێ ئامانج لە سانتافەدا ماوە و لەو رۆژگارەدا بوو کە ئۆردانتا بەهۆی کودەتایەکەوە کە لایەنگرانی سانتاندەرەوە بەرپاکرا، لەسەر کارەکەی لادرا، دایکی بە دانبەخۆداگری و موکوڕی و کۆششێکی زۆرەوە سەرکەوت کارێکی وا بکا کە وەك کارداری[1] سەفارەتی مەکسیك لە

---

١ کاردار: نازانم چ کارو فرمانێکە لەسەفارەتەکان رەنگە بالیۆز بێ.

واشنگتۆن دابمەزرێنن. ئایتۆربیدە بە هەموو ژیانی گوفاو ماوەی سی و دوو ساڵانیش دەنگ و باسی خێزانەکەی نەزانی. لەو کاتانەدا ماکسی میلبانود هابسبۆرگ، بەیارمەتی فەرەنسا، وەك ئیمپراتۆری مەکسیك دەسەڵاتی گرتەدەست و دوو کەسی لە وەچەی سێیەمی تۆخم و خانەوادەی ئایتوربیدە وەك جێنیشینی خۆی بۆ ئەم پادشایەتیە بێبنج و بنەوانە هەڵبژارد.

لە دووەمین نامەی کە ژەنەراڵ لە رێگای ئایتۆربیدەوە بۆ ئۆردانتای نارد، داوای لێ کرد بوو کە تەواوی نامەکانی پێشترو ئەوانەیش کە لە ئایندەدا دەیاننوسێ لەناو ببا تا هیچ شونەوارێکی قسەکانی ئەو بەجێنەمێنێ. ئۆردانتا ئەو خواستەی ئەوی نەهێنادی، دوو ساڵ پێشتر، هەمان داخوازی لە ژەنەراڵ سانتاندریش کردبوو: "لە ژیانداو لەدوای مەرگیشم ئەم نامەیە بە چاپ نەگەیەنێ، چونکە بە ئازادی تەواو و بەبێ هیچ پەروایەك نووسراوە."

سانتاندرەیش ئەم داخوازیەی رەتکردەوە. نامەکانی سانتاندەر، بە پێچەوانەی نامەکانی ژەنەراڵ، زۆر رێك و پوختە بوو روون و ئاشکرابوو کە بە ئاگایی تەواوی وەك ئەمەی کە مێژوو خاوەنی ئەم نامانەدەبێ، نووسیویەتی لە یەکەمین نامەی بەرئەکروزەوە تا دوانامەی شەش رۆژ پێش مردنی، ژەنەراڵ بەلانی کەم دەهەزار نامەی نووسی، هەندێکی بەدەست و خەتی خۆی دەنووسی و هەندێکی دیکەیشی بە نووسەرەکانی دەنووسی و هەندێکیش هەر خودی نووسەرەکان بەپێی دەستوری و فرمانی ژەنەراڵ خۆی دەیاننووسی. پتر لە سێ هەزار نامە و هەشت هەزار بەڵگەنامەی ئیمزاکراوی لە دوادا بەجێماوە، هەندێ کاتان هەموو کەم و کورپەکانی بەملی نووسەرەکانیدا دەهێناو هەندێجار بە پێچەوانەوە، هەر هەمووی بە بێگوناح دادەنان، جارێکیان نامەیەکی کە نووسیبووی نەگونجاو هاتەبەرچاوی و لە باتی نووسینی نامەیەکی دیکە، لە دامێنێدا نووسینی بۆ زیادکرد."هەر بەم شێوە کە خۆتان لە نامەکەدا هەستی پێدەکەن، مارتل[1] ئیمرۆ خۆشی لە دەستداوە."لە ساڵی ١٨١٧دا لە کاتی جێهێشتنی ئەنگوستورا بۆ تەواوکردنی ئازادی وڵات هەموو کارێکی کە لە کاتی دیارنەبوونی ئەودا بووبکرێ. ئەنجامدەدرا و هەموو مەسەلە لە گرنگەکانی چواردە نامەو بەنیودانە رۆژ بە نووسەرەکانی نووسیەوە. رەنگە ئەم ئەفسانەش هەر لێرەوە بڵاوبۆوە کە ژەنەراڵ لە توانایدایە لەیەك کاتدا چەندین نامەی جیاجیا بە نووسەرەکانی بنووسێ.

مانگی تشرینی یەکەم مانگی باران بوو، ژەنەراڵ لە ژوورەکەیدا نەچووە دەرێ و دکتۆر گاستل بەندۆ ناچاربوو کە باشترین فەندوفێڵەکانی بۆ وەرگرتنی مۆڵەت بۆ سەردانی و نان دەرخواردانی لەگەڵ ئەودا بەکاربێنێ. بە بۆچوونی خۆزەپالاسێوس ژەنەراڵ لە پشووی دوای

---

١ مارتل: ناوی یەکێك لە نووسەرەکانی.

نیوەڕۆیانیدا لە حاڵێك کە بێجووڵەو هەست و خوست لەناو جۆلانەکەیدا لێیڕادەکشاو تەماشای بارنی دەکرد بچووکترین شتە وردەکانی ژیانی رابردوی بە بیر دەهێناوە و تاوتوێدەکرد.

رۆژێکیان دوای نیوەڕۆ ناڵەیەك لە کرۆکی دڵیەوە دەرچوو وتی: "ئاه! خواکەی من! نازانم چی بەسەر مانوێلا هاتوە!"

خۆزەپالاسیۆس وتی: "تەنیا ئەوەندە دەزانین کە باش و بێ مزەرەتە: "ئەگینا هیچ هەواڵێکی نییە."

لەو وەختەوە کە ئۆردانتا گەیشتبووە دەسەڵات ئیدی هەواڵی مانوێلا نەبوو. ژەنەراڵ نامەیەکی بۆ نوسیبوو، بەڵام فەرمانی بە فەرناندۆ دابوو تا مانوێلا لە سەفەرەکەیان ئاگاداربکا. دوایین نامەی لە کۆتاییەکانی مانگی ئابدا هاتبوو کە تێیدا مەسەلەو هەواڵ و زانیاریەکانی پەیوەست بە کۆدەتا سەربازیەکە ئەوها تێکەڵ بە مەسەلە ئاساییەکانی رۆژانەوە کردبوو کە لێکجیاکردنەوەیان ماوەیەکی زۆر درێژەی کێشا.

مانوێلا پەندو رێنوماییەکانی ژەنەراڵی لەبیر خۆی بردبۆوە و لە نەخشەو پلانەکانی بانوی یەکەمی حیزبی بۆلێوارەکاندا، بەدڵ لە دژی دەوڵەت جەنگی دەست پێ کردبوو. سەرۆك موسکرا خۆی زاتی ئەوەی نەکرد کارێك لە دژی ئەودا بکا. بەڵام دەرفەتی دا تا وەزیرەکانی هەرکارێکی لە دەستپانبێ بیکەن. وەڵامی هێرشەکانی دەوڵەتی ناو رۆژنامە رەسمیەکانی بە بەیاننامەهایەك دەداوە کە بە سواری ئەسپەوەو بە پاسەوانی کارەکەرو کەنیزان، لە شەقامی ریئال دا بڵاویدەکردەوە. جاری وا دەبوو بە سواری ئەسپ و شمشێر بە کەمەرەوە، دەکەوتە دوای کەسانێکی کە لە شەقامە بەر درێژەکانی دەوروبەری شار بەیاننامە و بڵاوکراوەیان دژی ژەنەراڵ بڵاودەکردەوەو لەسەر نووسینی سەر دیوارەکان کە بۆ ریسوا کردنی ژەنەراڵ نووسرابوون، دروشمی ریسواکەرانەی دژی دەوڵەت دەنووسی سەرەنجام جەنگی رەسمی دەوڵەت لە دژی منوئلا خۆی دەستپێکرد. بەڵام ئەو گۆڕەپانەکەی چۆڵنەکرد، لە رۆژی ئاهەنگێکی گشتیدا دۆستانی نزیکی لەناو دەوڵەت ئاگاداریانکردەوە کە لە گۆڕەپانی شاردا پەیکەرێکی ژەنەراڵیان دروستکردوەو لەوەدان پەیکەرەکە ئاگرتێپەردەن و بیسووتێنن. مانوێلا و کارەکەرەکانی خۆیان لە چنگی پاسەوانان دەربازکرد و هەموو کەلوپەلەکانی ئاهەنگەیان لە ژێر سمی چوار پەلی ئەسپەکانیاندا تەفرو تونا کرد. دوای ئەم رووداوە کاربەدەستی شار لەگەڵ دەستەیەك سەرباز، هەوڵیاندا کە ناکاوێك ئەو لەناو نوێن و شیرینی خەودا دەستگیرکەن. بەڵام مانوێلا بە جووتێك

حەفتیری پڕو لە سەرپێ[1] چاوەڕێی کردن و تەنیا ناوبژیکەری دۆستانی هەردوو لابوون کە لە ئەنجامە ناخۆشەکانی ئەم رووداوە پێشتگیریانکرد.

گەیشتنە دەسەلاتی ئۆردانتابوو ئەوی هێورکردەوە. ئۆردانتای بەدۆستی راستەقینەی خۆیدەزانی. ئەو منو ئلایشی بەهاوکارێکی چاکی خۆیدەزانی. وەختێك کە ژەنەراڵ لە باشووردا لە جەنگدابوو و منوئلا لە سانتافە تەنیا ماوە، ئۆردانتا بە پاڵپشتی ژەنەراڵ چاوەدێری منوئلای دەکرد و پێداویستیەکانی جێبەجێدەکرد.

کاتێك کە ژەنەراڵ دەستکێشانەوەی خۆی راگەیاند، ئەمە منوئلا بوو کە ناچاریکرد تا لە نامەیەکدا بۆ ئۆردانتا بنووسێ: "من لە کانگای دڵمەوە بۆ ئێوەی دۆستی دێرینم پێشنیاری یەکێتی دەکەم."ئۆردانتا ئەم پێشنیارە پڕ لە شانازی و چارەنووسی سازەی قبوڵ کردو لە خزمەتی ژەنەراڵدا ماوە ، هەروەها منوئلاش دوای ئەو کودەتا سەربازیە پاداشتی ئەویکرد، بەلام منوئلا ئەوەندە بەخێرایی لەسەر شانۆی ژیانی رۆژانەو ژیانی گشتیدا ونبوو و لەسەرەتای تشیرینی یەکەمدا دەنگ وابلاوبۆوە کە چۆتە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. بەمجۆرە خۆزەپالاسیۆس مافی خۆیبوو بڵێ: "حاڵ و باری باشە، لەبەرئەوەیە هیچ سەرو سۆراغێکی نییە."لە یەکێك لە گەڕانەوەکانی بۆ ناو ژیانی رابردووی نوقمی ناو تەماشاکردنی باران و خەفەتبار لە چاوەڕوانییەکی بێئەنجام، بەبێئەوەی بزانێ چاوەڕێی چی و چ کەسێك دەکا، ئیدی لە توانایدا نەما، لەناو ئەو حاڵ و بارەیدا لە خەودا دەگریا، خۆزەپالاسیۆس بە بیستنی کزەی دەنگێك، وایزانی کە دەبێ قروسکەی سەگ بێ، بەلام دەنگەکە هی سەروەرەکە ببوو، زۆر حەپەسا، چونکە لەو سالانەی کە لەگەڵ ئەودا بوو، تەنیا جارێك دیتبووی ئەوبگری کە ئەویش لە حەژمەتی توڕەیی بوو نەك لە خەفەتان، کاپیتان ئیبارای بانگ کرد، کە لەم کاتەدا لە سالۆنەکە پیاسەی دەکردو هەردووکیان پێکەوە گوێیان بۆ نالە نالی ژنەرەڵ هەڵخست:

ئیبارا گوتی: "ئەم گریانە یارمەتیدەدا."

خۆزەپالاسیۆس گوتی: "یارمەتی هەر هەمووماندەدا."

ژنەرەڵ پێش کاتی هەمیشەیی خۆی نووست، نە مەلی ناو درەختە میوەکانی هاوسێ و نەدەنگی ناقوسی کلێسە هیچیان نەیانتوانی بە ئاگای بێنن، خۆزەپالاسیۆس چەند جاران بەسەر جۆڕنەکەی ژەنەراڵ داهاتەوە تا لەوە دڵنیابێ کە هەناسەدەدا، کاتێك کە چاوەکانی کردەوە، سعات لە هەشتی تێپەڕاندبوو گەرمای بەیانی دەستپێکردبوو.

---

[1] لەسەرپێ: ئامادە،یان چەکێك سوار بێ.

خۆزەپالاسیۆس وتی: "شەممە شانزەی تشرینی یەکەم، ڕۆژی قەدیسە سانتامار گریتا ماریا ئالاکوکەیە."

ژەنەرالّ هەلّساو لە پەنجەرەوە سەیری گۆڕەپانی چۆل و تۆزاوی و کلێسای شاری بەدیواری داڕوخاو وێرانەو جەنگی ڕەوە عەلەشیشی سەر لاشەی سەگێکی تۆپیو کرد.هەتاوی گزنگان مژدەی ڕۆژێکی زۆر گەرمی دەبەخشی.

ژەنەرالّ گوتی: "وەرە ئەوەندەی دەکرێ بە خێرایی لێرە بڕۆین، نامەوێ گوێم لە دەست ڕێژو شریخەی گوللە بارانکردنبێ."

خۆزەپالاسیۆس لەرزیگرت، ڕێك کاتێکی ئەوهای لە کات و شوێنی دیکە تاقیکردبۆوە و ژنەرەڵ ڕێك هەمان حالّەتی هەبوو بەپێی پەتی بەسەر خشتەکانی ناوژوور و بە دەرپێەکی درێژ و کلاّوە خەوێکی کە سەرە تاشراوەکەی دادەپۆشی. کۆنە خەون بوون کە بەراستی دووبارە دەبۆوە.

خۆزەپالاسیۆس وتی: "گوێمان لە دەست ڕێژی گوللە نابێ. ژنەرەڵ پیار لە ئەنگوستورا عیدام کرا. بەلاّم نەك ئیمڕۆ، بەلّکە سعات پێنجی دوای نیوەڕۆی سێزە سالّ پێشتر لە ڕۆژێکی ئەوهادا ئەم شتە ڕوویدا."

کاتێك کە لەشکری ئازادیخواز بە یەکێتی هەموو هێزەکان نیازی ڕووبەڕوو وەستانەوەی بەرانبەر مۆریجۆ هەبوو، ژنەرەڵ مانوێل پیاری دوو ڕەگەی تەمەن سی و پێنج سالّەو خەلّکی کروزائۆی بە شانازیەکی زۆرەوە بۆلای خۆی ڕاکێشا بوو، فەرماندەیی ژنەرەلّی خستە ژێر پرسیارەوە، پیار تێکڕای ڕەشەکان، دووڕەگەکان، خەلّکی ناوچەکە و نەخۆش و کەنەفتانی لە دژی سەرمایەداری سپی پێست، کە ژنەرەڵ نوێنەری ئەوانبوو، هاندەدا، ناوبانگی ئەو تەنیا لەگەڵ خۆزەئەنتۆنیۆ بەراورد دەکرا.

پیار تاوەکو پارێزگاری چەند ئەفسەرێکی سپی پێستی لەشکری ئازادیخوازیشی بەدەستهێنابوو، ژنەرەڵ هەموو تواناى بەکارهێنا تا بتوانێ باوەڕی پێبێنێ، بەلاّم سەرنەکەت. بە فەرمانی ژنەرەڵ، پیاریان گرت و بۆ ئەنگوستورای پایتەختی کاتیان برد، ژنەرەڵ لەوێدا لەگەڵ ئەفسەرە نزیکەکانی کە چەند کەسێکیان لە دوا سەفەری بەناو ڕووباری ماگدالنا لەگەلّیدا بوون، هێزێکی پێکەوە نابوو.

ژنەرەڵ لەو نیزامیانەی کە دۆستی پیابوون، دەستەیەکی ڕاست و بە ویژدانی دروستکرد تا دادگایی بکەن، خۆزە ماریا کارنیۆ وەك دادگەر هەلّبژێردا، پارێزەری بەرگریکەر ناچارنەبوو، لە پێدا هەلّگوتنی پیار، وەك کەسێك کە هەمیشە دژی دەسەلاّتی ئیسپانیەکان خەباتیکردبوو، زێدەڕۆیی بکا، بە تۆمەتی بەجێهێشتنی سوپا، ئاژاوە گێڕی و ناپاکی، بە لێسەندنەوەی نیشانە نیزامیەکانی و دوایی حوکمی مەرگی بەسەر دا سەپێندرا.

کاتێك کە پیار لە ئەنجامەکانی دادگاییکردنەکەی ئاگادارکراوە وای بۆ دەچوو کە ژنەرەڵ لەگەڵ حوکمەکەدانەبێ، بەتایبەتی لەو باروزوفەی کە ژنەرەڵ مۆریجۆ چەند شارێکی داگیرکردبوو و ورەی ئازادیخوازان زۆر بێهێز ببوو، ژنەرەڵ لە هەموو لاوە لە ژێر پاڵە پەستۆدابوو و بە ئارامیەوە بە بۆچوونی هەمووان لەوانەش گوێ بە بریستومندزدا، بەڵام خۆراگریەکەی بڕیاردەرانەبوو، حوکمی لێسەندنەوەی نیشانەکانی رەتکردەوە، بەڵام لەگەڵ حوکمی کوشتنەکەیدابوو و فرمانیدا کە حوکمەکەی لەبەرچاوی جەماوەر جێبەجێ بکەن. لە رۆژی شازدەمی تشرینی یەکەم، سعات پێنجی پاشنیوەرۆ لە گۆرەپانی سەرەکی شاری ئەنگوستورا، شارێکی کە شەش مانگ پێشتر، پیار خۆی لە چنگی ئیسپانیەکانی هێنابووە دەرێ، لە ژێر تیشکی هەتاوێکی بێهێز حوکمەکەی جێبەجێکرا. فەرماندەی جۆخەی ئیعدام فرمانیدا تا لاشەی ئەو سەگەی کە قەلەکان جەنگ و دەعوایانبوو لەسەری، هەڵگرن و چاویان لەو رێگایانەوە بێ کە دەهاتەوە ئەوێ تا ئاژەڵ نەتوانن لێیەوە بێنە ناوەوە و شکۆی عیدامکردنەکە تێکنەدەن. دوا خواستی پیاریش ئەوەبوو، کە خۆی فەرمانی گوللە بارانکردنەکە بدا، قبوڵ نەکراو چاوەکانیشیان بە زۆری شەتەك دا، بەڵام نەیانتوانی رێگا لە خوا حافیزیکردنی ئەو لەم دنیایەو لە ئالاّ بگرن.

ژنەرەڵ بۆ سەیرکردنی جێبەجێکردنی کوشتنەکەی نەچووبوو، تەنیا کەسێکی کە لە ماڵەوە لەگەڵ ژنەرەڵ دا مایەوە، خۆزەپالاسیۆس بوو، کاتێك کە دەنگی دەست ڕێژەکەیان بیست دیتی ژنەرەڵ هەوڵ دەدا بەر لە گریانی خۆی بگرێ.

ژنەرەڵ لە بەیاننامەیەکی کە بۆ سوپایدا وتی: "دوێنی رۆژێکی پڕ لە ئێش و ژان بوو بۆ دڵی من."بەدرێژایی ژیانی، هەر کاتێك کە باس دەهاتە سەر ئەمە دەیگوت ئەمە پێویستیەکی سیاسی بوو کە وولاّتی رزگارکردو رێگای لە جەنگی ناوەخۆ گرت، بەهەر حاڵ ئەمە گەورەترین نمایشی دەسەلاّت بوو لە سەرتاسەری ژیانیدا و گونجاوترینیانبوو، لەبەر ئەوەی بەم کارەی دەسەلاّت و سەرۆکایەتی خۆی چەسپاند و رێگای لەبەر سەرکەوتنی خۆیدا کردەوە.

سێزدەساڵ دواتر، لە گوندی سولداد نەیدەزانی کە بۆتە قوربانی سروشت، پیرەژنێکی داماو بارێکی نارگیل لەسەر تەژگێك دانابوو و بۆ فرۆشتنی شیری نارگیل بەمەیدانەکە تێپەڕی و تا ئەو کاتەی لە چاو ونبوو، ژنەرەڵ هەر چاوی لەمەیدانەکە بڕیبوو، دوایی گەڕاوە ناو جۆلانەکەی و بێ ئەوەی کەس شتێکی لێپرسێ، وەلاّمی پرسیارەکەی خۆزەپالاسیۆسی داوە، کە سێزدەساڵ بوو چاوەڕێی وەلاّمی دەکرد.

ژنەرەڵ وتی: "دووبارە ئەمکارە دەکەینەوە."

# (٨)

ژەنەراڵ بەشێوەیەکی وا لاواز ببوو کە ڕۆیشتنیشی بۆ زەحمەتبوو نەك لە ترسی کەوتن، بەڵکە لەبەر ژان و زەحمەتی ڕۆیشتن، بۆ سەرکەوتن و هاتنەخوارەوە لە پلیکانەکانی ماڵەوە جێگا هەبوو دەبوایە کەسێك یارمەتیبدا، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا کە کاتێك پێویستی بە کۆمەك دەبوو، نەدەچووە ژێر بارەوە، دەیگوت:

"زۆر سوپاس، بەتەنیا خۆم دەروەستی کارەکە دێم."

ڕۆژێك ئیدی نەیتوانی کاتێك کە بەتەنیا لە پلیکانەکانەوە دەهاتە خوارێ، سەری سوڕاو کەوتە خوارەوە، بۆدۆستێکی گێڕاوە: "بەبێی ئەوەی ئاگاداربم کەوتم و نیوە گیانبووم، وام هەست دەکرد کە قاچەکانم پێوە نەماون."لە ڕاستیدا بارەکە لەمەش خراپتربوو ڕزگاربوونی بەشتێکی سەیرو سەمەرە دەهاتە بەرچاوان، لەسەر لێواری پلیکانەکە وەستاو هەر لەبەر سووکی کێشی بوو کەوت و غلۆر نەبۆوە خوارێ و لەوێدا بەبێ جووڵە چوار پەلی لێڕاکێشا.

دکتۆر گاستل بەندۆ زۆر بەپەلە ئەوی بە گالیسکەی دۆن بارتولومە مولینارس، کەلە ەسەفەری پێشوودا لە ماڵی ژنەرەڵ مابۆوە، بەرەو بارانکادسن نیکۆلاس برد. لە ڕێگادا چاوی چەپی مادەیەکی لینجی دەرکرد کە نارەحەتی دەکرد. بەدرێژایی ڕێگاکە بێحاڵ بوو و وا دەهاتە بەرچاو کە خەریکی وێردو دوعا خوێندنە. لە کاتێکدا کە هەندێ پارچە شیعری کە ئەو حەزی لێدەکردن، دەخوێندەوە و دووبارەی دەکردنەوە. دکتۆر گاستل بەندۆ بە دەستە سڕێك چاوی پاکدەکردەوەو سەری لەوە سوڕمابوو کە ژەنەراڵ بەم هەموو هەستداریەی لە ئەنجامدانی کارەکانی خۆیدا خۆی ئەم کارە ناکا. ڕێك کاتی گەیشتنە ناو شارو کاتێکی کە گاڕانێك نزیکبوو گالیسکەکەی وەرگەڕێنن، ژنەرەڵ بەخۆی هاتەوە ، بەڵام گایەکان لەگەڵ عارەبانەی کەشیشێك پێکداهاتن. کەشیش فڕیە حەواو دوایی کەوتە ئەوساکە

گۆڕە[1] بەڵام خێرا لە جێگای خۆیدا راستبۆوە، سەرتاپای لم و زیخ بوو و خوێن لە دەست و نێو چەوانی دەهاتەخوار، کاتێك کە بارەکە ئاسایی بۆوە، سەربازان ناچاربوون بەنێو ڕەشە خەڵکە بێکارەکە و منداڵەکانی هاتبوونە سەیری رووداوەکە، رێگایەك بکەنەوە. ئەوان هیچیان ئاگایان لەو موسافیرە نەبوو کە وەك مردوو لەناو گالیسکەکە دانیشتبوو.

دکتۆر ئەم کەشیشەی وەك یەکێك لە لایەنگرە دیارەکانی ژنەرەڵ بەو ناساند، لەو سەرو بەندانەدا تەواوی قەشەکانی کلێساو کەشیشەکان لە دژی ژنەرەڵ دەجووڵانەوەو ئەم کەشیشەیان لەناو دەستەی خۆیاندا وەدەرنابوو.

ژنەرەڵ لەسەرەتادا هۆشی لای بابەت و قسەکانی دکتۆر نەبوو و تەنیا کاتێك لە رووداوەکە ئاگاداربوو کە چەند پەڵە خوێنێکی بەسەر کراسەکەی کەشیشەوە دیت. ئەو داوای لە ژنەرەڵ کرد کە دەسەڵاتی خۆی بەکاربێنێ و کارێك بکا کە چیدی گاگەل ئازادانە بەشەقامەکاندا نەگەڕێن، بەتایبەتی لە شارێکی وادا کە لەبەرهەبوونی گالیسکەیەکی زۆر تێیدا، تەنیا رۆیشتنیشی تێدا ترسناکە.

ژنەرالڵ پێی وت: "جەنابی بەرێز نارحەت مەبە، هەر هەموو وولات بەمجۆرەیە."خۆر سعات یازدە بەسەر شەقامە چەوڕێژو پان و بەرینەکانی شاردا بە بێجووڵە تیشکی دەداوەو شاری گەرم دادەینا. ژنەرەڵ خۆشحاڵ بوو کە تەنیا کاتی گونجاو بۆ قەیاخ ڕانی لە هەوایەکی خراپدا. کە ئەنجامەکەی چاکبوونەوەی ئەو بوو، لەو شارەدایە لە کتێبی پزیشکی و دەرمانسازی فەرەنسایی دا هاتبوو کە سەرەسوڕەی ناو دەریا بۆ پاککردنەوەی گەدەو زەرداو زۆر بە کەڵکە ، بەڵام دۆزینەوەی هەوای خراپ و بەلەمێك کارێکی سادە نەبوو.

ژنەرەڵ ئەو ماوەی لەوێدا ماوە لە ماڵی دۆن بارتولۆمە. لە شەقامی ئاخادا بەسەریبرد. ژنەراڵ لە باری خراپی تەندروستی خۆی، زۆر توڕەبوو. هیچ جۆرە چالاکییەکی سیاسی نەبوو و تەنیا کەسانێکی ئەوهای بۆ چاوپێکەوتنیان قبوڵ دەکرد، کە دۆستی خۆیبوون و بەو شارەدا تێدەپەڕین. ماڵێکی گەورەو فێنك بوو خاوەنماڵەکە بۆ ژەنەراڵی کردبوو بە نەخۆشخانەی خانەوادەیی. دۆن بارتولومە مولینارس یەکێك بوو لەو کەسە بێئەژمارانەی کە جەنگ هەموو شتێکی لەناوبردبوون و لە بنی هێنابوون. تەنیا کارێکی کە بۆی مابۆوە بەڕێوەبەرایەتی پۆست بوو و لە دەساڵ لەوەو بەرەوە بەبێ هیچ موچەو مانگانەیەك ئەو کارەی هەبوو. مرۆیەکی زۆر

---

[1] ساکە گۆر: سەر زەوی ئەو ناوە ، ئەو مەیدانە.

بەدەست و دڵ و بەزەیی بوو و لەبەرئەمە ژەنەراڵ لە سەفەری پێشوویدا ئەوی بە پاپا بانگ دەکرد. هاوسەری بارتلومە ژنێکی خەپەتۆڵە و دڵنەرم و زۆر پەیوەستی ژن و مێردایەتی بوو، کەلوپەلی بەدەستی دەدروی کە لە کەشتیە ئەوروپاییەکاندا بەنرخێکی باش دەفرۆشران. بەڵام لەو کاتەوەی کە ژنەرەڵ گەیشتە ئەویٚ، هەموو کاتی خۆی بۆ ئەو تەرخاندەکرد تا جارێکیشیان لەگەڵ فرناندا باریگا لێیانبوو بەدەمەقاڵە لەبەرئەوەی رۆنی زەیتوونی لەناو نیسکێنە دەکرد و دەیگوت زۆر باشە و ژەنەراڵیش بۆ رێزگرتنی هەرچەندە بەبیٚ مەیلی بوو ، بەڵام دەیخوارد.

شتێکی کە ئەم رۆژانە پتر لە هەموو شتێك ژنەرەڵی نارحەتکردبوو جیقنەی چاوی بوو و سەرەنجام رێگەیدا کە بە ئاوو بابونە[1] بۆی بشۆن، بۆ قووتاربوونی لە دەست نارحەتیەکانی خۆی و پاشنیوەرۆ خەماویەکان، بۆ بەشداریکردن لە یاری کاغەز خۆیگەیاندە ئەفسەرەکانی، لەیەکێك لە بارە ئاڵۆزە دەروونیەکانی. بەهەمان شێوەی کە بەسوعبەت و راستی لەگەڵ خانەخوێکان دەدوا، گوتی کە ئاشتەواییەکی باش و بنچینە پتەو لە بردنەوەی دوو هەزار جەنگی بچووك باشترە. ئەم قسە زۆر بەسەختی ئەوانی حەپەساند.

جەنابی مولینارس پرسی: "ئایا لە سیاسەتیشدا هەروایە؟"

ژەنەراڵ وەڵامیداوە: "ئەم پرسە لە سیاسەتدا زیاتر لە هەموو شتێکی دیکە باوەردەکریٚ،کەی دەکریٚ نەگەیشتنە رێککەوتنێك لەگەڵ سانتاندر خەریکە لەناوماندەبا."

مولینارس وتی: "تا ئەو کاتەی دۆستان هەن، ئومێدیش هەر هەیە."ژنەرەڵ وتی: "مەسەلەکە رێك بە پێچەوانەی ئەمەوەیە. ئەمە ناپاکی دوژمنەکانم نەبوو، بەڵکە پەلەپەلی دۆستەکانم بوو کە کۆتاییان بەسەر کەوتنەکانم هێنا. هەرئەوانبوون کە منیان بردە ناو کارەساتی پەیمانی ئۆکانیا. منیان خستە داوی پرسی دەسەڵات و بەهەمان بیانو دوایی منیان بە دەستکێشانەوە ناچارکرد، سەرەتا پێیان سەلماندم کە دەبیٚ هەڵبژاردنێکی تازە بکریٚ. ئێستاش لەم وولاتەدا زیندانیان کردووم و ئیدی شتێکم نەماوە لە دەستی بدەم."

دەتگوت بارانی ئەبەدی دەباریٚ. گەرماکەی بە شەوەکەیشیەوە هێندە گەرم بوو، کە ژنەراڵ ناچاربوو چەند جاران کراسە تەڕو ئارەقاویەکانی خۆی بگۆڕیٚ. بەنارحەتیەوە دەیوت: "وا هەست دەکەم کە منیان لە حەمام کردوە."رۆژێکیان دوای نیوەڕۆکەی پتر لە سیٚ سعات لە هەیوانی ماڵەوە دانیشتبوو و سەیری بارانی بە لێشاوی دەکرد کە تەواوی زبڵ و زاری گەڕەکە

---

[1] بابونە: دەبیٚ گیایەکی بۆنخۆشی وەك پونگ وابیٚ.

هەژار نشین و کەلوپەلی ناو ماڵەکانیان و لاشەی ئاژەڵانی لەگەڵ خۆیدا ڕادەماڵی و وا دەهاتە بەرچاو کە بەخێرایی خانوەکانیشی لە بنەوە هەڵتەکێنیَ.

کاپیتان خوان گلن. سەرۆکی ئاسایشی شار. لە نێو ئەو لافاوەدا پەیدابوو و هەواڵی هێنا کە ژنێکیان لە کارکەرەکانی جەنابی بیسبال گرتوە، لەبەرئەوەی قژی ژەنەراڵی لە سولداو تراشی بوو، وەك شتێکی پیرۆز و متفەرِك فرۆشتویەتی.

ژەنەراڵ جارێکی دیکەش بەو خەیاڵەی کە هەرچییەکی لەوە و هی ئەوە، بۆ فرۆشتن هەراج دەکریَ، زۆر دڵی شکا.

ژەنەراڵ وتی: "بەجۆرێك رەفتارم لەگەڵدا دەکەن وەك مردبم وایە."

خانمی مولینارس کورسیەکەی لە مێزی ئەوان نزیك کردبۆوە، تا گوێی لە هەموو قسەکانیانبیَ.

ئەو وتی: "وەك چۆنی هەروا رەفتارت لەگەڵدا دەکەن، هەروەك قەدیسێك."ژەنەراڵ وتی: "زۆر باشە، ئەگەر وایە ئەم ژنە کلۆڵ و داماوە ئازاد کەن."

شتێکی دیکەی داوانەکرد. ئەگەر ناچاردەبوو نامەیەك بنووسیَ، ئەویشی بە فرناندۆ دەنووسی و کە دەبوایە نامەیەکیش مۆربکا. نەیدەخوێندەوە، بە درێژایی سەر لە بەیانیەکە لە هەیوانیَ دادەنیشت و لەوێوە تەماشای شەقامە چەورێژی دەکرد ، دیتی کەرێکی ئاوی لێبارکرابوو کچۆلەیەکی رەشکۆکەی ماسیفرۆش لەو ناوە بوو و ئەو منداڵانەی کە سەر لە سعات یازدە لە قوتابخانە دەهاتنەوە لەناوەبوون ، هەروەها دەیڕوانیە ئەو کەشیشەی کە لە تەنیشت دەرگای کلیساوە وەستابوو.

سەر لە سعات یەکی دوای نیوەڕۆ کاتێك کە هەرهەموو لێی دەنووستن. ژەنەراڵ دەچووە دەریَ، بۆ سەر شەقام دەچوو، بەرۆخ چاڵاوە پەنگخواردوەکاندا دەڕۆیشت. سێبەرەکەی قەلەکانی زارەترەك دەکرد، بۆ هەر لایەکی دەچوو و سەلامی لە ژمارەیەك کەسی وا دەکرد کە هێشتاش ئەویان بەم حاڵە نیو گیانی و بەجلوبەرگی مەدەنیەوە دەناسیەوە. ئەو کاتە سەری لەسەربازگەو گەورە ساختومانی بەرانبەر بەندەر دەدا. زۆر نیگەرانی ورەی سوپابوو. ناسازی و نالەباری زۆر ورەی بەرزی ئەوانی دابەزاندبوو و ئەم مەسەلە لە بیَ سەروبەری سەربازگەکان، کە زۆر لە توانابەدەرببوو، بە تەواوی روون و دیاربوو، بەڵام گروبانێکی [1] کە بەرواڵەت لە گەمان بێحاڵ

١ گروبان: عریف ، یان کەسێك دوو خەتی هەبی و یەك خەت (نائب عەریف) ە

ببوو،؟ راستیەکەی بۆ ژەنەراڵ گێڕاوە. گروبانەکە وتی: "ئەوەی سەری ئێمەی لە رەشێ بابمان ناوە، ورەی نزمی ئێمە نییە، بەڵکە سۆزەنەکە."

تەنیا ئەو کاتە بوو کە ژنەرەڵ پەی بە راستی برد. پزیشکانی ناوەخۆ هەموو هەوڵێکیان بەکارهێنا، لە گیراوەی پۆرمەنگەناتەوە تاشییر هەموویان بەکارهێنا و لەبەرئەوەی سەرنەکەوتن، بابەتەکەیان بەسەر ئۆرگانە سەربازیەکان داداوە، ئەوانیش رێگەچارەیەکیان نەدۆزیەوە، هەموو خەڵکی شار بەم ترسە یاندەزانی و خڕ پاکیان لەشکرو سوپایان بە چاوی ئەوەوە تەماشادەکرد کە نەخۆشی و بەدبەختی دەگوێزنەوەو بڵاودەکەنە. ژنەرەڵ لەوەی کەمتر کەوێنادەکرا، ئاگای لە بابەتەکەبوو و بە خەیاڵی خۆی مەسەلەکەی بە گەرنتینەکردنی[١] سەربازان چارەکردبوو.

لەو وەختەدا کە نەگەیشتینی هیچ هەواڵێك چ بە باش و چ بە خراپ ژنەرەڵی وەتەنگ هێنابوو سوارەیەکی نەناسراو، لە سانتاماریاوە هەواڵێکی تەمومژاوی لە ژنەرەڵ مۆنتیجاوە بۆ هێنا کە ناوەرۆکەکەی ئەوها بوو: "ئەو پیاوەی کە مەبەستە وا لە دەستی ئێمەدایە و کارەکان بە جوانی دەچنە پێشەوە."بە بۆچوونی ژنەرەڵ ئەو نامە بەجۆرێك سەیرو هێمادار هاتە بەرچاو کە بەبابەتێکی زۆر گرنگی وولاتی زانی و وای بیرلێکردەوە کە پەیوەستە بە لەشکرکێشی بەرەو رێو ئاچا چونکە ژنەرەڵ بایەخی مێژوویی تایبەتی پێدەدا.

لەو کاتەوەی دەوڵەتان، سیستەمی هێمایی پەیامەکانیان کە لەسەردەمی سیخوڕی لە دژی ئیسپانیادا بەکاردەهات و زۆر بە کەڵك بوو، لەنێو برد، زۆر ئاسایی بوو کە نامەو پەیامەکان لە پێناو پاراستنی نهێنی دا، زۆر پێچەڵ پێچەڵ بن و سەر لێتێکەدەرانەبن.

ژنەرەڵ بەبیانوی میوەکڕین و هێنانی سەوزەی تەڕو تازە و چەند شووشەیەك شەراب و بیرە، کە لە بازاڕی ناوخۆدا دەستنەدەکەوتن، خۆزەپالاسیۆسی ڕەوانەی سانتاماریاکرد، بەڵام کارە راستەقینەکەی ئەو پەیبردن بوو بەراستی ئەو پەیامەو ئامانجەکە زۆر روونبوو، مەبەستی مۆنتیجا ئەوەبوو کە مێردی میراندا لینرسی لە زیندانی ئاوندا بۆ کارتاخناد گوێزراوەتەوە. و چەند رۆژێك زۆرتر درێژە ناکێشێ، تا ئازاد دەکرێ . ژەنەراڵ لەم مەتەڵە سادەو ساکارە ئەوها لە خشتەچوو بوو کە ئەو تا بۆ ئازادی قورتاربووەکەیشی لە جامایکا، هیچ خۆشحاڵ نەبوو.

---

١ گەرەنتینە: قەرەنتینە جێگایەك بۆ دڵنیانەبوونی کەسان لە نەخۆشی درم و یان بەرگرتن لەو جۆرە نەخۆشیانە .تەئمین.

لەسەرەتاکانی مانگی تشرینی دووەمدا قەشە سانتامارتا لە نامایەکیدا کە بە خەتی خۆی نووسیبوی ئاگاداری ژنەرەڵی کردەوە کە ئەو بۆتە هۆی ئەوەی ئەو ئاژاوە دامرکێنێتەوە. کەوا حەفتەی پێشوو لە گوندێکی هاوسێیان کە ناوی لاسیەناکا بووەوە و لەبۆ پاراستنی ئاژاوەکانی خەڵکی لە رێو ئاچادا بەرپابووە ژنەرەڵیش نامەیەکی بەدەستی خۆی بۆ نووسی و سوپاسیکرد و فرمانیدا بە مۆنتیجا کە بە جوانی رێزی لێبگرێ.

بەڵام ژنەرەڵ ئەم خۆنواندنەی ئەسقەف و پەلەکردنی لە دانەوەی قەرزەکەی بەهیچ جۆرێك پەسندنەکرد.

پەیوەندیەکانی نێوان ئەسقەف ئاستوز قەت ئاسایی و باش نەبوو. ئەو لە ژێر جلوبەرگی ئایینیەوە سیاسەتمەداربوو، بەڵام لە راستیدا هێندەی لە سیاسەت نەدەزانی و لە دڵەوە لەگەڵ کۆماری، لەگەڵ یەکێتی سەرانسەری ئەو وولاتە و لەگەڵ بیروبۆچونەکانی دیکەی ژنەرەڵدا دژبوو، یاریدەدەری کۆنگرەی ئادمیرابلە بوو لەوێدا کاروفرمانی سەرەکی خۆی، کە تێکدانی نەخشەو پلانی سوکرەبوو، بە باشی ئەنجامدا، هەردووکیان لە دیتنەوەی رێگە چارەیەك بۆ مەسەلەی ڤەنزویلا بەشداربوون، بەڵام ئەسقەف بەردەوام لەبەر کارەکانی سوکرەدا بوو بە کۆسپ. خاتو مۆلینارس و جەنابی مۆلینارس کە لەو بیروباوەڕە جیاوازەی ئاگاداربوون. لە قسەکانی ژنەرەڵ، لە کاتی عەسرەچاییدا هیچ سەریان نەسوڕما ژنەرەڵ وتی: "لە وولاتێکی کە قەشەیەك رێبەری کۆدەتابکا، دیارنییە کە چارەنووسی رۆڵەکانمان بەچیدەگا."

خاتو مۆلینارس بە دەنگێکی هێمن و میهرەبانانەوە وەڵامێکی توندی ژنەرەڵی داوە: "هەتا ئەگەر مافی جەنابی پایەبەرزیشتان بێ، نامەوێ، گوێم لێی بێ، ئێمە پشتاو پشت هەر کاتۆلیك بووبن."

ژنەرەڵ بەتوندی وەڵامیداوە:

"بەبێ هیچ گومانێك ئێمە لە جەنابی قەشە کاتۆلیك ترین ، ئەو لەبەر خاتری خوا نەبوو لە لاسیەناگا میانچیەتی نەکرد، ئەم کارەی تەنیا لەبەرپاراستنی یەکێتی دۆستەکانی خۆیبوو، لەبەرئەوەی بۆ جەنگ دژی کارتاخناد تەمای پێیانبوو.

جەنابی مۆلینارس وتی: "ئێمەش لێرەدا دژی خۆسەپاندنی کارتاخنادین."ژنەرەڵ گوتی: "ئەمە دەزانم هەردانە کەسێکی کۆلۆمبیایی هێندەی وولاتێك دوژمنە."کاتێك کە ژنەرەڵ لە سولداد بوو، داوای لە مۆنتیجا کردبوو کە کەشتییەکی بچووکی بۆ بنێرێتە بەندەری سابانیجا تا بتوانی سەفەری پێبکاو لەگەڵ بە گێژەوە هاتنی زەرداوەکەی خۆی دەربداتە دەرێ و مۆنتیجا

ئەم کارەی وەخراندبوو لەبەر ئەمە دۆن (خواکین دمی یری) کە ئیسپانیەکی کۆماری خوازبوو و شەریکی ئەلبرسی دەریاوان بوو، گفتی پێدابوو کە کەشتییەکی هەڵمی بۆ دەنێرێ، لەبەرئەمەی ئەو قسە جێبەجێ نەکرا، ئەوا مۆنتیجا لە ناوەڕاستەکانی مانگی تشرینی دووەمدا کەشتییەکی ئینگلیزی رەوانکرد کە بەبێ ئاگاداری پێشوەخت گەیشتە سانتاماریا.

هەر لەگەڵ ئەوەی ژنەرەڵ بەمەیزانی وای بڵاوکردەوە کە سوود لەم دەرفەتە دەبینێ. لە وڵات وەردەکەوێ، ژنەرەڵ وتی: "وام بڕیارداوە بۆ هەر کوێیەك بێ بچم، تەنیا لێرە نەمرم."لەو کاتەدا بەبیریهاتەوە کە کامیل لە هەیوانێکی خۆڵاویدا بەرانبەری دەریا چاوەڕێی ئەوە ئاهێکی هەڵکێشاو گوتی: "لە جامایکامنیان خۆش گەرەکە."

فرمانیدا خۆزەپالاسیۆس کە بنەو بارگەی کۆبکاتەوە و خۆیشی هەمان شەو تا درەنگ وەختانێ بەدوای هەندێ کاغەزو بەڵگەنامەوە بوو کە مەبەستی بوو هەر چۆنێ بووبێ بیاندۆزێتەوەو لەگەڵ خۆیدا بیانبا، لە دواییدا هێندە ماندووبوو سێ سعات نووست. هەر کە بێدار بۆوە نەیزانی لە کوێیە تا ئەو کاتەی کە خۆزەپالاسیۆس پێی وت کە ئەو لە کوێیە.

ژنەرەڵ گوتی: "خەونم بینی کە لە سانتاماریام، شارێکی گەورەو پاك و خاوێن بوو. خانووی سپی و یەك شێوەی هەبوو، بەڵام چیایەك بەری دیتنی دەریای گرتبوو.

خۆزەپالاسیۆس وتی: "کەواتە ئەم شارە سانتاماریا نەبووە بەڵکە کاراکاس بوو."بەمجۆرە خەونەکەی ژنەرەڵ وای نیشاندا کە بۆجامایکا ناچن. فرناندۆ لە گەردیبەیانیەوە لە بەندەر خەریکی ئامادەکردن و رێکخستنی سەفەربوو لە رێگای گەڕانەوەیدا بەرەو ماڵ دیتی مامی نامەیەك بە ویلسۆن دەنووسێ، نامەکە بۆ ئۆردانتابوو و ژنەرەڵ داوایلێکردبوو کە گوزەر نامەیەکی نوێی بۆ بنێرێ، لەبەرئەوەی کە گوزەرنامەی دەوڵەتی پێشوو نرخێکی نەبوو، ئەمە تەنیا شتێك بوو کە ژنەرەڵ بۆ هەڵوەشاندنەوەی سەفەرەکەی هێنایە پێشێ.

بەڵام هەر هەمووی تێکڕای دەیانزانی کە هۆی سەرەکی دەنگ و هەواڵێك بوون کە ئەو رۆژە سەر لە بەیانیەکەی لە رێو ئاچاوە گەیشتبوون و راستی دەنگوباسە ناخۆشەکانی پێشتریێ دەردەخست، هەر کەرتێکی ئەم دنیایە لە ئۆقیانووسێ نوقم دەبوو و زەنگی جەنگی ناوەخۆ بە توندی هەڕەشەی لەو دەکرد، ژنەرەڵ وتی: هەر قوربانیەکی کە بۆ رزگاربوونی رێو ئاچا پێویستبێ دەیدەین."دکتۆر گاستل بەندۆ کە لەبەر نارحەتیە سیاسیەکانی ژنەرەڵ زیاتر لە نەخۆشیەکەی دڵی پێی دەسووتا تەنیا کەسێکبوو کە دەیتوانی و دەیزانی کە چۆن راستی بەو بڵێ.

دکتۆر بە ژنەرەڵی وت: دنیا لافاو دەیبرد پیرەژن لە گۆلکە سۆرێی دەپێچاوە ئەوە ئێوەن کوڕینە ئەوا دنیا بە ئاخیر دەبێ و ئێوە هێشتا بۆ رێو ئاچا نیگەرانن."

وەڵامی ژنەرەڵ خێراو بێچەندو چۆن بوو:

"چارەنووسی جیهان بەرێو ئاچاوە بەستراوە."

بەڕاستی باوەڕیشی بە قسەکەی خۆیبوو و لەوەی کە کاتی بەرنامەو پلان بۆ دارێژراوی هێرش بردنە سەر ماراکائیب هاتبوو، زۆر نیگەرانبوو. نەیدەتوانی نیگەرانیەکەی بشارێتەوەو دەیزانی کە بۆ سەرکەوتن مەودایەکی زۆریان ماوە. هەروەکو کە مانگی کانوونی یەکەم، بە خۆو پاشنیوەڕۆ زەردەکانیەوە نزیك دەبۆوە ژنەرەڵ دەترسا کە رێو ئاچا یان تەواوی ئەو دەڤەرە لە دەستیدا و تا نیگەرانی ئەوەشبوو کە لەسەرانسەری ڤەنزویلادا ئاژاوەیەکی زۆر بتەنێتەوەو بەم جۆرە دوا خەونەکانیشی ببن بە نەخشی سەرئاو.

هەوا لە هەفتەی پێشوەوە رووی لە گۆڕان بوو. بارانی بە لێزمەو وەرزکەر ئاسمانیان بۆ شەوی سامال و مشتاو مشت لە ئەستێرە چوڵکردبوو. ژنەرەڵ جارێك لە ناو جۆلانەکەی و جارێکی دیکە لە کاغەزبازی نقوم دەبوو و لەم گۆڕانکاریانەی سروشت بێئاگابوو چەند رۆژێك دواتر، لە کاتی یاریدا بایەك لەسەر دەریاوە هەڵیکرد کاغەزەکان لە دەستی ژنەرەڵ فڕین و لەناو پەنجەرەکەدا پێکاهاتن. خاتو مۆلینارس، بە هەڵچوونێکەوە لە هاتنی پێشوەختی ئەم وەرزە چریکاندی: "کانوون هاتەوە."

ویلسۆن و خۆزەلارنسیوسیلبا پەنجەرەکانیان گاڵەدا تا با ناو ماڵەکە بە سەریەکدا نەپڕژێنێ. ژنەرەڵ تەنیا کەسێك بوو لە ناو بیرو داڵغەی خۆیدا نقوم ببوو.

ووتی: "کانوون هات و هێشتا هەر لەو جێیەین کە لێیبووین راستە کە دەڵێن هەبوونی گروبانی بەد باشترە لە ژنەرەڵی بێکەڵك."

درێژەی بە یاریەکەدا: "بەڵام لە کاتی یاریدا فرمانی بە خۆرەلارنسیۆ سیلبادا تا بارگەونبەی سەفەر ئامادەکەن. سەرهەنگ ویلسۆن کە رۆژی پێشوو بۆ دووەمجار کەلوپەلەکانی لە کەشتی داگرتبۆوە سەرسامان گوتی: "دوێنێ کەشتی بەرێکەوت."

ژنەرەڵ کە ئەمەی دەزانی وتی: "ئەو کەشتیەیان باش نەبوو. دەبێ بەرەو رێو ئاچا بکەوینە رێگا ببینین کە ئایا دەکرێ ئەم ژنەرەڵە شایستانە ناچاری سەرکەوتن بکەین یان نا."بەرلەوەی مێزی یاریەکە بەجێبهێڵێ. هەستیکرد ناچارە بۆ خانەخوێکان روونبکاتەوە. و پێی وتن: "ئیدی هەتا بۆ جەنگیش نییە، بەڵکە تەنیا ئابورمان لە نێوانایە."جەنابی خواکین دمی یر

کەشتییەکی چارۆگەداری کەنای مانوێل بوو لە خزمەت ژنەڕاڵ دانا تا ئەو بەرهەر جۆرێکی کە دەیەوێ بەکاریبێنێ چ بۆ هێنانەوەی زەرداو یان بۆ چوونە کێڵگەکەی کە سان پیدرۆ ئەلخاندرینوی ناوبوو، چ رۆیشتن بەرەو رێو ئاچا و رزگارکردنی ئەو وولاّتە فراوانەبێ ژنەرەڵ ماریانو مۆنتیجا لەگەڵ ژنەرەڵ خۆزە ماریا کارنیۆ یا مانویل گەیشتنە بەندەر.

مۆنتیجا شتێکی وای رێکخست تا کەشتی ئەمریکایی گرامپوس پێشوازی مانوێل بکا. ئەم کەشتیە جگە لەوەی بە تۆپ تەیارکرابوو. دکتۆرێکی نەشتەرگەریشی کەناوی دکتۆر نایت بوو، لەناو بوو.

کاتێك کە مۆنتیجا باری ترسناکی ژەنەراڵی دیت، تەنیا قسەکانی دکتۆر نایتی بەبەس نەزانی و لەگەڵ دکتۆر گاستل بەندۆش وتووێژی کرد.

دکتۆر گاستل بەندۆ وتی: "من لەو باوەڕەدانیم، تەمەنی ئەوەندەمابێ سەفەرەکەی بە کۆتایی بگەیەنێ، بەلاّم دەبێ بڕوا، هەموو کارێکی دیکە لەمجۆرە ژیانە باشترە."

رۆیینی ئاوی کەنداوۆکەکان زۆر لەسەرخۆبوو، لەوێوە هەڵمێکی وا هەڵدەستا بە مەرگێك هەبوو، لەم بارەوە بڕیاریاندا تا یەکەمین بایەکانی باکوور، کە ئەوساڵە زووتر لە وەختی خۆی هەڵیکردبوو، سوود وەرگرن و رێگای دەریا بگرنە بەرێ، بەلەمەکە چارۆگەی چوارگۆشەیی هەبوو، پاك و تەیارو ئامادەبوو ژوورێکی تایبەتیان تێیدا بۆ ژەنەراڵ ئامادەکردبوو.

ژەنەراڵ بە ورەیەکی بەرزو شادمانانە پێی خستە سەر عەرەشەی بەلەمەکە و بۆ دیتنی رێژگەی رووباری ماگدالنا، کە لێڵی ئەو تامەودای چەند لگوایەك رەنگی ئاوی دەریاشی لێخن کردبوو لەسەر عەرەسەکەدا ماوە.

کۆنە پانتۆلێکی مەخمەڵی لەبەردابوو کلاّوێکی لەسەر کردبوو و چاکەتێکی هێزی دەریایی ئینگلیزی لەبەردابوو ئەویش فەرماندەی کەشتیەکە پێشکێشی کردبوو.

مەلەوانەکانی گرامپوس لەسەر شەرەفی ژەنەراڵ ماسیەکی کۆسەی زەبەلاحیان راوکرد، لە ناو سکی ماسیەکدا بێجگە لە شمەکی بێنرخ، چەند چاوێلکەیەکی پیاوانەشیان دەرهێنا، ژەنەراڵ لەم چرکە ساتانە زۆری چێژ وەردەگرت:

بەلاّم سەرەنجام شەکەتی ئەوی لە بنهێنا و کەوتە بیرکردنەوە. دوایی خۆزە پالاسێوسی بانگکردو بە گوێیدا چرپاند:

"گومانت نەبێ ئێستا پاپامۆلینارس تەژگەکانی من دەسووتێنێ و کەوچك و کەلوپەلەکانی دیکەم دەخاتە ژێر خاکەوە."

بەرەبەری نیوەڕۆ بە تەنیشتی کەنداوێکی گەورەدا ڕەتبوون، کەنداوێکی گەورەبوو ئاوەکەی قوڕاو بوو. باڵدارەکان لەسەر ماسی ئەو ناوە کێشمەکێشیان بوو، لە دەشتێکی راستی شۆرەك و گەرمی نێوان ئاوەزێ و دەریادا جێگایەکی کە هەوا پاکتر و دنیا رووناکتر بوو، گوندی ماسیگران لەوێ بوو و نەختێ وێوەتر شاری خنجیلانە و نهێنی ئامێزی لاسیەناگا دەدیترا، لەبەرێکی دیکەی ئەم کەندە ئاوە گەورە دوندە بەبەفر داپۆشراوەکانی زنجیرە چیای سییرانوادا سەریان لە کەشکەلانی فەلەکدا بوو.

بەلەمەکە نەرم و هێمن دەکشا ناو دەریا و جووڵەی ئەوەندە راست و رێك بوو کە بچووکترین گۆڕانکاری لە حاڵی ژەنەراڵ رووینەدەدا تا بتوانێ زەرداوەکەی بهێنێتەوە. بەڵام دوای ماوەیەك زریانێك لەبەری چیاوە هەڵیکردو دەریای ورووژاندو خستیە شەپۆلان. مەلە دەریاییەکان و هەروەها هەموو دنیا کە بەدەوری سەری ژەنەراڵدا کەوتنە سووڕ خواردن و ئارەقەیەکی ساردی لەسەراپای گیانی دەرکرد و چاوەکانی پڕ بوون لە فرمێسك. هێندە سوکەڵە ببوو کە لەگەڵ هەڵکردنی بایەك دەفڕیە ناو دەریاکەو لەم ترسە بوو مۆنتیجا و ویلسۆن گرتبوویان. پاشنیوەڕۆ، کاتێك کە بەلەمەکە گەیشتە ناو ئاوەکانی کەنداوی سانتامار لەناو لەشی ژەنەراڵدا شتێك نەمابۆوە دەریبدا و ماندوو داماو و لە ژوورەکەی خۆیدا رووەو مەرگ لینگی راکێشا. ژەنەراڵ مۆنتیجا لەگەڵ چاوی بەم بارەکەوت و بەسەختی دەست و پێی ئالۆزکا، بەر لەوەی لە بەلەم دابەزێ دووبارە دکتۆر (نایت) ی بردەوە سەر ژەنەراڵ و دکتۆر فەرمانیدا کە بەسەر کورسێکەوە بیگەیەننە رۆخی دەریا.

جگە لە بێمەیلی، دانیشتوانی سانتاماریا بە هەر شتێکی کە پەیوەندی بە دەوڵەتەوە هەبوو، هەروەها هۆی دیکەشی بۆ ئامادەنەبوونی خەڵکی بۆ بەندەر هەبوو، سانتامارتا، کۆسپێکی گەورەی سەر رێگای دروستبوونی کۆمار بوو. هەتا دوای جەنگی بوجاکاو وەرگرتنی سەربەخۆیی، وەکیلی پاشا سامانۆ پەنای بۆ ئەوێبرد و چاوەڕێی گەیشتنی هێزەکانی ئیسپانیای کرد، ژەنەراڵ خۆی زۆر جاران هەوڵیدابوو تا ئەو شارە ئازادبکا، بەڵام مۆنتیجا، ئەویش لە دوای جێگیربوونی کۆمار لەم کارەدا سەرکەوت. سەرەڕای ئەمەی کینەی ئەوان بەرانبەر کارتاختاش کاریگەری خراپی لەسەر ئەواندا جێهێشتبوو و ژەنەراڵیش بەبێ ئەوەی کە بیەوێ یان بەخۆی بزانێ، ئەم بارەی خراپتر دەکرد، بەڵام گرنگترین هۆ، عیدامکردنی دەریا سالار خۆزەپردونسیاپادیچا بوو کە هەروەکو ژەنەراڵ دووڕەگە بوو، ئەم کینەو نەفرەتە لەگەڵ گەیشتنە دەسەڵای ئۆردانتا، کە سەرۆکی دادگای سەربازیبوو و فرمانی ئیعدامی خۆزەی دەرکرد، تاو و

گوڕی سەند، ئەوهابوو زەنگی کلێسەکان دەنگیان لێوە نەهات و بەبێ ئەوەی کەس هۆی ئەوە بزانێ، هەر هەموو باروتەکەی کە لە قەڵای مۆرو بوو شێدارو لەکارکەوتبوو، چونکە بڕیار بوو لەوێدا وەك سڵاوی نیزامی چەند دانە تۆپێك بتەقێنێ. سەربازان تا چەند چرکەیەك پێشی گەیشتنی ژەنەراڵ خەریکی پاککردنەوەی دروشمی سەر رووی دیواری کلێسا بوون کە نووسرابوو: "هەر بژی خۆزەپرۆدنسیا."هەواڵی گەیشتنی ژەنەراڵ بۆ کەسانێکی لەبەندەرەکە بوون، هیچ کاریگەریەکی نەبوو. لە هەموو گرنگتر، دیارنەبوونی قەشە ئاستوز بوو، کەسێکی کە بەر لە هەموو کەسێکی دیکە ئاگاداری هەواڵ و دەنگ و باسی رەسمی دەبۆوە.

دۆن خواکین می یر، ئەو گیانلەبەرە خەیاڵیەی کە لە ناو پەتوویەکەوە بوو، دوو کڵاوی لەسەر بوو و بێگیان لەسەر کورسیەك دانیشتبوو تا لەناو بەلەمەکە، بیهێنە خوارێ، تا دوا هەناسەی ژیانی لەبیری نەکرد، بەڵام ئەوەی لە هەموو شتێکی پتری لەبیرمابوو، دەستەگەرمەکەی و بە دژواری هەناسەدان و جێهیلانی کورسیەکەی بوو، ئەو لەگەڵ یەکەیەکەی ئەوانەی لەوێبوون بەهێنانی ناوی تەواو و پلەکانیانەوەسڵاوی لێکردن و تۆقەی لەگەڵدا کردن، بەڵام خۆی بە زەحمەت راگرتبوو و یاریدە دەرەکانیشی یارمەتیاندەدا، ئەو ساکە سواری گالیسکەیەك بوو لە بارێکدا کە سەری بە کورسیەکە کردبوو، بەدوو چاوی شێواوەوە لە کونی پەنجەرەوە بۆ دواجار دەیڕوانیە ئەو دیمەنانەی لەبەرانبەریان تێدەپەڕین.

تەنیا دوای بڕینی یەك شەقام بە کۆنە ساختومانی گومرگەکە گەیشت کە وەك خانووێك بۆ حەوانەوەی ئامادەیانکردوو. سعات هەشتی رۆژی چوارشەممە بوو لە شەقامەکەی رۆخ کەنداوەوە یەکەمین شتەکانی مانگی کانوونی یەکەم هەستیان پێدەکرا. شەقامەکەیان و پیس و پەلۆخ بوو و خانووە لەبەرد هەڵنراوەکانیان لە خانووەکانی دیکەی شار باشتر بە پێوە مابوون. زۆر لە خانەوادەکان کە کورسیان لەسەر رێگادانابوو و لێی دانیشتبوون و هەندێك لەوان تا ناوەڕاستی شەقام پێشوازی میوانەکانیان دەکرد، بریسکەی کرم و پەپوولەکانی لەشەودا دەسووتان و بەسەر درەختەکانی ئەم لاو ئەو لای شەقام و کەناری کەنداوەوە بوون رووناکییان لە رووناکی چراکانی سەر شەقام زیاتر بوو، ئەم خانووە کۆنترین خانووبەرەی وڵاتبوو کە دووسەدو نەوەدو نۆ ساڵ پێشتر دروستکرابوو تازە سەر لە نوێ دەستیێوەردرابۆوە مشتوماڵ درابۆوە، لە قاتی دووەم ژوورێکی روو لە کەنداوەکەیان بۆ ژەنەراڵ ئامادەکرد، بەڵام ئەو بە باشتری زانی کە کاتەکانی زۆرتر لە سالۆنی سەرەکی ماڵەکە بەسەر ببا، چونکە ئەو سالۆنە تەنیا شوێنێك بوو

که دوو قولابی بۆ هەڵخستنی جۆلانە تێدابوو، شەپکە دارێکی گەورەی (کاری هەڵکەندنیش)[1] لە سالۆنەکەدا بوو کە شازدە رۆژەکەی دوای ئەو رۆژە لاشەکەی لەسەر ئەو شەپکە دارە دادەنرا، بەبەرگێکی شینی رەسمیەوە داپۆشرابوو، بەڵام هەشت دوگمە زێڕینەکەی پێوە نەبوو و کەسێك ئەوانی لەسەرە مەرگدا دزیبوو.

تەنیا ژەنەراڵ خۆی بوو نەیدەزانی کە تا ئەم رادەیە لە سەرەنجامی کاری خۆی نزیکبۆتەوە. مۆنتیجا سەر لە سعات نۆی هەمان شەو پزیشکێکی فەرەنسایی بەناوی ئەلکساندەر پەروسپررورانی بۆ سەر ژەنەراڵ برد ئەو بەبێ ئەوەی ترپەی دڵی ژەنەراڵ بگرێ، بۆی دەرکەوت کە ژەنەراڵ لە سالانێك بەر لە ئێستادا لە گیانەلادایە، لە ملی باریك و دەرپەڕیوی قەفەسەی سینەی و هەناسە تەنگی و جیقزەردی پێشبینی ئەوەیکرد کە سیەکانی نارحەتن، دوای چەند رۆژێك ئەم پێشبینیە بەراست دەرچوو، دکتۆر لە سەرەتای قسەکانی، بە ئیسپانی و فەرەنسی پەی بەوە برد کەوا ژەنەراڵ توانایەکی زۆری لە گۆڕین و شاردنەوەی نیشانەکانی نەخۆشیدا هەیەو زۆر هەوڵدەدا تا لەم سەردان و چاوپێکەوتنەشدا نەبکۆخێ و نە بەڵغەم دەردا، دەستنیشانکردنەکەی یەکەمجاری دوای تاقیکردنەوەیەك بەراست دەرچوو، بەڵام ئەو شەوە لە یەکەمین ئاگاداری پزیشکی لە سی و سێ ئاگادارکردنەوەکە کە لە پانزە رۆژی داهاتوودا بڵاویکردەوە بایەخی بە گرفتە دەروونییەکانی ژەنەراڵ دابوو هەروەك چۆن بایەخی بە کێشەکانی لەشی دابوو.

دکتۆر روڕان سی و چوار ساڵی تەمەنبوو باوەڕ بە خۆیی و هێمنی و خۆڕاگریەکی تایبەتی هەبوو و رێکپۆشبوو، شەش ساڵ پێشتر، لەبەر ناڕازی بوون لە دەوڵەت و باری فەرەنسا سەری بۆ ئەو ناوە هەڵگرتبوو، ئیسپانی بە باشی دەزانی ، بەڵام ژەنەراڵ ئەو هەڵەی بەکارهێناو زەبەردەستی خۆی لە زمانی فەرەنسیدا بەو نیشاندا دکتۆر گوتی: "جەنابی پایەبەرز زارەوەکەت پاریسیانەیە."

ژەنەراڵ بە زەردەخەنەوە وتی: "زاراوەی گەرەکی (رووی وین)ە ئێوە چۆن هەستتان پێکرد؟"

دکتۆر لە وەڵام دا وتی: "لەگەڵ ئەوەدا کە لە گوندێکی نورماندیەکان لە دایك بووم و هەر لەوێش گەورەبووم، بەڵام زارەوەی تێکڕای گەڕەکەکانی پاریس دەناسمەوە."

ژەنەراڵ وتی: "ئێوە پەنیری باش و شەرابی خراپتان هەیە."

دکتۆر گوتی: "رەنگە ئەمە نیشانەی سەلامەتی ئێمە بێ."

---

١ مەبەست هەڵکەندن لەسەر دار یان کانزایە نەك نەحت

دکتۆر بەدەست خستنە سەر خاڵێکی هەستدار باوەڕی ژەنەراڵی بۆ خۆی ڕاکێشا و ئەم باوەڕەش کاتێك زیادی کرد کە هیچ داو دەرمانێکی بۆ نەنووسی، بەدەستی خۆی شەربەتێکی کە دکتۆر گاستل بەندۆ گرتبوویەوە، بە دەمیداکردو تەنیا حەبێکی ئارامکەرەوەشی دایە. ژەنەراڵ هێشتاکە بە حەسرەتی خەوەوە بوو، بەو پەڕی حەزەوە حەبەکەی گرت و قوتیدا، ئەو کاتە ماوەیەکی کەم باسی جۆرەها شتیان کرد تا ئەمەی کە سەرەنجام حەبەکە کاری خۆی کردو ژەنەراڵ خەوی لێکەوت. دکتۆر بەسەری پەنجەی پێیەکانی و بێهەست و خوست لە ژوورەکە هاتەدەرێ، ژەنەراڵ مۆنتیجا و چەند ئەفسەرێکی دیکە تا ماڵەوەیان بردەوەو وەختێك کە دکتۆر گوتی دەیەوێ بە جلوبەرگەوە بنوێ تا لە هەر کاتێکی شەودا کە داوای بکەن ئامادەبێ، مۆنتیجا بەم قسە زۆر نیگەرانبوو.

بەدرێژی ماوەی هەفتەیەك دکتۆر ڕوران و دکتۆر نایت لەسەر شتێك پێکنەهاتن، دکتۆر ڕوران دیاریکردبوو کە دەردەکەی هی کۆنەسەرمایەو بەهۆی گوێ پێنەدانەوە بە تەواوی دەرمان نەکراوە لێی پیرکردوە، زیانی بەسیەکانی گەیاندوە، بەڵام بەهۆی گۆڕانی ڕەنگی پێست و تای بەردەوامەوە، دکتۆر نایت باوەڕی وابوو کە مەلاریایە، لەگەڵ ئەمانەشدا هەردووکیان لەسەر ئەمە کۆکبوون، لە حاڵی نەخۆشەکە ترسناکە، داوایان لە پزیشکانی دیکە کرد کە ئەم جیاوازیە بەهۆی دەستنیشانکردنەکانیانەوە چارەبکەن، بەڵام دوو پزیشك لە سانتامارتاو چەند پزیشکێکی دیکە لە هەندێ ناوچەی دیکە بەبێ هیچ ڕوونکردنەوەیەك خۆیان لە هاتنەکە دزیەوە، بەمجۆرە بڕیاریاندا کە دەرمانێکی هاوبەش، بەهۆی شەربەتی سنگەوە بۆ چارەکردنی کۆخەو لرخە لرخ بۆ چارەسەرکردنی مەلاریا، بەکاربێنن.

لەدوا حەفتەدا، ژەنەراڵ بەبێ ئەوەی پرس بە پزیشکانی بکا یان مۆڵەتیان لێوەرگرێ، پەرداخێك شیری کەری خواردەوەو ئەمەش حاڵ و باری زیاتر تێکدا.

دایکی شیری کەری گەرم دەکردو لەگەڵ هەنگوین دەیخواردەوەو دەیدا ئەویش و بەردەوام دەیگوت کۆخە دەپەڕێنێ، بەڵام لەو کاتەدابە تامی شیرو یادەوەری بیرەوەریەکانی سەردەمی منداڵی، حاڵی ژەنەراڵ ترسناکتر بوو و بەردەوام هێڵنجی دەداو دەرژاوە، تا ئەوەی کە دکتۆر نایت سەفەرەکەی بۆ جامایکا پێشخست تا لەوێ دوو کەسی تایبەتمەند بنێرن، دکتۆر نایب لەم کارەیدا ئەوەندە خێرا بوو کە لەو سەردەمەدا هی باوەڕکردن نەبوو، بەڵام تازە درەنگ داهاتبوو. سەرەڕای ئەم حاڵەش نیشانەی خراپی باری لەش و نارحەتی بە ژەنەراڵەوە نەدەدیترا و ورەی دانەبەزیبوو، ژەنەراڵ وای نیشاندەدا کە وەك بڵێی زۆر گوێ، بەم دەردە کوشندانە نادان

شەوان بە بێداری دەماوە و بەدەم ددان بە خۆداگرتنی ژانەکانیەوە، دەیڕوانیە فانۆسەکانی قەڵای مورو و چاوی لە کەنداوەکەی بەرانبەری کە لەبەرچاوی ئەو جوانترین کەنداوی جیهانبوو، هەڵنەدەگرت.

ناو ناوە دەیگوت: "لە زۆری ڕامانم لە کەنداوەکە چاوەکانم ژانیان تێزاوە."بەدرێژایی رۆژ هەوڵیدەدا تا ورەی جارانی بداتەوە بەرخۆی، ئیبارا، ویلسۆن و فرناندۆی دەنگدەدا و لەگەڵیاندا لەمەڕ ئەو نامانەوە کە ئیدی سەرو سەلیقەی نووسینیانی نەمابوو، فرمانی دەردەکرد. خۆزەپالاسیۆس ئەوەی بۆ دەرکەوت کە هۆی ئەم هەموو ئارەزووی بۆ گەڕانەوە بۆ سەردەمی رابردوو، گەیشتنە ئەنجامی کارەکانە. ئێستا نامەو چارەنووسی دۆستان و هاوڕێکانی دەنووسیەوە، کینەو بوغزی بەرانبەر نووسەرە کۆنەکەی ژەنەراڵ خۆزە سانتانا فەرامۆشکردو لە وەزارەتی کاروباری دەرەوە پۆستێکی بۆ دیتەوە تا ئەو کەتازە ژنی هێنابوو چێژ لە ژیانی خۆی وەرگرێ.

ژەنەراڵ خۆزەماریا کارنیۆی کە زۆر جاران بە دڵباشی ئەوی هەڵدابوو کێشایە سەر رێگایەك کە دوای ساڵانێك گەیشتە تەختی سەرۆك کۆماری ڤەنزویلا، داوای لە ئۆردانتاکرد تا پۆست بداتە ئەندرس ئیبارا و خۆزەلارنسیوسیلبا تا بەلانی کەمەوە کەڵك لە مووچەیەکی دایمی وەرگرن، سیلبا بوو بە وەزیری جەنگ و هێزی دەریایی وولاتەکەی لە تەمەنی هەشتا ساڵیدا بە کاریگەری تانەی سەرچاوانەوە کە زۆری لێدەترسا گیانی سپارد، ژەنەراڵ حەوڵیدا تا پیدرۆ بریسنیۆ مندزیش ناچاربکا کە بگەڕێتەوە نوئباگرانادا و پایەی وەزارەتی جەنگ قبوڵ بکا، بەڵام کات ئەو دەرفەتەی نەدایە، وەسیەتنامەیەکی بۆ فرناندۆی برازای بەجێهێشت کە رێگای لەبەر وەدەستهێنانی کارێکی باش لە دەوڵەت خۆشدەکرد، بۆ ژەنەراڵ دیەکو ئیبارا، کە لەیەکەمین یاریدەدەرەکانی و یەکێك لەو کەم کەسانە بوو کە لەگەڵ یەکدا زۆر لە ڕوو و خۆییانە پێکەوەقسەیان دەکرد و یەکدیان بە (تۆ)[1] بانگ دەکرد، ئامۆژگاری کرد تا سەریخۆی بۆ شوێنێك هەڵگرێ کە بۆی لە ڤەنزویلا باشترە، هەتا لە سەرەمەرگیشدا بۆ ژەنەراڵ خوستۆ بریسنیۆ،کە لە دوای مەسەلەی (ڕێو ئاچا) وە لێی زوویر بوو، چەند فرمانێکی دا.

ڕەنگبێ هیچ کاتێك ئەفسەرانی نەیاندەتوانی ئەوە بێننە بەرچاوی خۆیان کە ئەم بۆچوونانەی چارەنووسی ئەوان پێکەوە شەتەك دەدا، ئەوان هەموویان تا کۆتایی ژیانێکی هاوبەشیان هەبوو،

---

١ تۆ: ئەتۆ، ئەتو : کەسی دووەمی تاکە،لە هەندی زمانی ئەوروپی نابێ مرۆڤ ئەوها سادە بانگی کەسێکی دیکە بکا ئەگەر دز یان هەرشتێك بێ بەڵکە دەبێ پێی بڵێی بەرێزتان، ئەمەش بەپێی یاسا قەدەغەیە

چارەنووسی وای خواستبوو کە پێنج ساڵ دواتر شان بە شانی یەکدی و لەگەڵ فەرماندە پیدرۆ کاروخو، لە ڤەنزویلا بۆ یەکێتی ئەو وولاتەو پشتیوانی لە بولیواریسم بکەونە شەڕو تێکۆشانەوە.

ئیدی نیگەرانی سیاسەت نەبوو، بەڵکە لە بیری ئەو هەتیوو بێباوکانەدا بووە لە دوای خۆیدا بە جێیی دەهێشتن و ویلسۆن لەو نامەی کە ژەنەراڵ بۆ ئۆردانتای نووسیبوو، بەجوانی ئەمەی بۆ دەرکەوت، لە نامەکەداهاتبوو: "مەسەلەی ڕیو ئاچا بایەخێکی نییەو ئیدی ئێمە هیچمان لە دەست نایە."

هەمان پاشنیوەڕۆ نامەیەکی چاوەڕێنەکراوی لە ئەسقەف ئەستۆزەوە پێگەیشت، لەم نامەدا داوا لە ژەنەراڵ کرابوو کە کار بۆ دەسەڵاتگرتنە سەر دەوڵەتی ناوەندی بکا، تا سانتامارتاو ڕیو ئاچا وەك دو پارێزگا بە ڕەسمیەت بناسی و بەم جۆرە کێشەی مێژوویی کارتاخنا کۆتایی بێ.

هەرکە خۆزە لارنسیوسیلبا لە خوێندنەوەی نامەکە بۆوە. ژەنەراڵ وەك نیشانەی ناڕازیبوون سەری باداو وتی: "هەموو ئەو هزرانەی کە بەمێشکی ئەو کۆلۆمبیاییانە تێدەپەڕێ، بە جیاخوازی کۆتایی دێ."پاشدا هەرکە لەگەڵ فرناندۆ نامەگەیشتووەکانی تاووتوێ دەکرد بە نارحەتیەکی زۆرترەوە پێی وت: "تا وەڵامیشی نەدەیەوە، دەبێ سەبربگرن تا دوای ئەوەی کە منیان ناشت ئەوا هەر جۆرێکی کەویستیان ئەوها مەسەلەکە چارەسەربکەن."

حەزو نیگەرانی ئەو بۆ گۆڕینی ئاووهەوا خەریك بوو شێتی بکا، هەر کاتێك هەواکەی شێداردەبوو، هەوای وشك، ئەگەر سەرمابا، هەوای گەرم و ئەگەر ناوچیابا، داوای هەوای دەم ئاوانی دەکرد. لەم رووەوە بەردەوام بێقەراربوو، جارێك داوای دەکرد کە پەنجەرەکان بکەنەوە تا هەوای تازە بێتە ناو ماڵەوە و جارێکی دیکە داوای دەکرد پەنجەرەکان داخەنەوە، جارێکیان دەیویست کە پشتی کورسیەکەی لەرووناکی کەن و دووبارە شوێنی کورسیەکەی دەگۆڕیەوە، وا پێدەچوو تەنیا وەختێك کە لەشی پڕو بێگیانی لەناو جۆلانەکە رادەکێشا، ئارامی دەهاتەوە بەرێ.

ژیان لە سانتاماریا ئەوەندە خەماوی ببوو کە کاتێك ژەنەراڵ نەختێك هەستی بە ئارامی دەکردو بڕیاریدا بۆ هەوارگەکەی جەنابی (می یر) ی بگوێزنەوە، دکتۆر روران یەکەم کەسێك بوو حەزی ئەوەی لەلاو رووژاند، چونکە دەیزانی کە ئەمە نیشانەی بێتوانایی و مەرگی بێچەندو چۆنیەتی، بەر لە سەفەرەکەی بۆ دۆستێکی نووسی: "ئەوپەڕی تا یەك دوو مانگی دیکە لە ژیاندا بمێنم."

ئەم قسە هەر هەموویانی حەپەساند، چونکە لە ژیانیدا کەمجار لە باری مەرگەوە قسەی کردبوو.

سان پیدرۆ ئەلخاندرنیۆ لە دووری یەك لگوا لە سانتامارتاو لە داوێنی چیاکانی سییرانوادا هەڵکەوتبوو و لە کێڵگەیەکی قامیشی شەکر و کارخانایەکی شیرنەمەنی پێکدەهات.

ژەنەراڵ لەناو گالیسکەی جەنابی می یر ڕێگا خۆڵاویەکەی کێڵگەی بڕی و ئەوە هەر ئەم ڕێگایە بوو کە دە ڕۆژ دواتر، لاشەی لە کۆنە پەتوێك پێچراوی، پێدا گەڕاوە، ژەنەراڵ پێش ئەوەی کە خانووەکە ببینێ، هەوای دەمکردوی بە گەرمایی شەربەتی شەکری هەستپێکرد و لە داڵغەدا ڕاچوو.

ئاهێکی هەڵکێشا و وتی: "بۆنی سان ماتئۆی لێدێ."کێڵگەی سان ماتئۆکە بیست و چوار لە گۆ لە سانتامارياوە دووربوو، یادەوەری دڵتەنگیەکانی زیندوو دەکردەوە، ئالێرەدا بوو کە لە تەمەنی دوو ساڵیدا باوکی و لە تەمەنی نۆساڵیدا دایکی و لە بیست ساڵیدا هاوسەرەکەی لە دەستدا، لە ئیسپانیا کچێکی شۆخ و شەنگی لە خزم و خۆێش دەوڵەمەندەکانی خۆی هێنا. لەو سەردەمەدا، کە بەرپرسی کاروباری دارایی کێڵگەبوو، تاکە ئارەزووی ئەوەبوو لە ڕۆخ ژنەکەیدا بە خۆشی بژی. هیچ کاتێك ئەوە نەزانرا کە مەرگی ژنەکەی، دوای تێپەڕینی هەشت مانگ بەسەر زەماوەندیان، لە ئەنجامی تایەکی توندو ترساناکدا ڕوویدا یان لەبەر ڕووداوێکی ناوماڵ! تا ئەو حەلە ژەنەراڵ لاوێکی خۆش گوزەران و دوور لە سیاسەت بوو، بەڵام بە مردنی ژنەکەی جارێکی دیکە لە دایك بۆوە و لەوەوە بە دواوە بوو کە بۆ پیاوێك گۆڕا کە دەبوو لە ڕاستیدا ئەو پیاوە بێ، ئیدی هەرگیز لە بارەی ئەو و هۆی مەرگیەوە نەدوا هەرگیز ئەوی بە بیری خۆی نەهێناوە و هەوڵینەدا کەسێکی بهێنێتە جێگای. بگرە لە هەموو شەوانی ژیانیدا خەونی بە ماڵەکەی سان ماتۆراوەی دەدیت و باوك و دایك و خوشك و براکانیشی زۆر دەهاتنە خەونی. بەڵام قەت هاوسەرەکەی لە خەونێدا نەدەدیت لەبەرئەوەی ئەوی لە قووڵایی کەنداوی فەرامۆشیدا ناشتبوو ئەمەش تەنیا چارەی ئەو بوو بۆ ئەوەی بەبێی ژنەکەی لە ژیان بەردەوامبێ هەرچەندە شتێکی بێبەزەییانەش بوو، بەڵام چاریدیکەی نەبوو، تەنیا شتێکی کە بۆ چرکەساتێك یادی هاوسەرەکی لەودا زیندووکردبۆوە، بۆنی شەربەتی شەکر و بێپەڕوایی کۆیلەکانی کێلگەی پیدرۆ ئەلخاندرۆ بوو کە هەتا بۆ بەزەیی پێدا هاتنەوەش تەماشایەکی ئەویان نەکرد، لە دەوروبەری ماڵێدا درەختی بڵندهەبوو و دیوارەکانیشیان لەبەرهاتنەوەی ئەو سپیکاریکردبوو، ئەمەشیان کێڵگەیەکی دیکەبوو لە ژیانیدا کێڵگەیەك بوو کە چارەنووسی ئەوی بۆ مردن لەوێ پەلکێش کردبوو.

ژەنەراڵ لە پڕتاوێك گوتی: "ناوی ماریا تریزا رودریگز دل ترۆای ئالایزابوو."جەنابی می یر کە واقی وڕمابوو پرسی: "ناوی کێ بوو؟"

ژەنەراڵ لە وەڵامدا گوتی: "ناوی ئەو کەسەی کە هاوسەری من بوو"دوایی بە خێرایی وتی: "تکا دەکەم لە بیری کە، تەنیا یادەوەریەکی سەردەمی لاوی بوو."ئیدی قسەی نەکرد.

ئەو ژوورەی کە بەتایبەتی کردبوویانە ژووری نووستنی ئەو، یادو یادگاریەکی دیکەی لەودا زیندووکردەوە، لەبەرئەوە بوو کە بەوردی سەرنجی دایە، دەتگوت هەر شتێك لەو ژوورە ڕازو

نیازێکی بۆ ئەو دەگێڕاوە. تەختێکی گەورە کۆمێدێك تەختە خەوێکی لە دار دروستکراو بە دۆشەگ داخراو و کورسیەکی بە مەخمەڵی سوور داپۆشراو لە ناو ژوورەکەدا هەبوون. لەبەر دوایی کەنار پەنجەرەکە، سعاتێك هەڵواسرابوو کە سعات یەك و حەوت دەقیقەی نیشاندەدا.

ژەنەراڵ وتی: "پێشتر لێرە بووین."

دوای ئەوەی کە خۆزەپالاسیۆس سعاتەکەی میقات و قورمیشکرد، ژەنەراڵ لەناو جۆلانەکەیدا راکشا و هەوڵیدا ئەگەر بۆ یەك تاکە دەقەشبێ بنوێ، تەنیا لەو کاتەدا بوو کەسییدا نوادای لە پەنجەرەوە دیت. وەك ئەوە وابوو کە تابلۆیەکیان بە دیوارەوە هەڵواسیبێ، بۆ چەند چرکەساتێك بیرکردنەوەکانی لەناو ژوورە جۆراو جۆرەکانی نێو بیرەوەری سەردەمی ژیانی رابردوویدا ونبوو.

گوتی: "هیچ کات و ساتێك ئەوەندە هەستم بە خۆم نەدەکردبوو کە لە ماڵەکەم نزیکم."شەوی هەوەڵ لە ماڵی سان پیدرۆ ئەلخاندرینو باشی خەو لێکەوت، تاقی بەیانیەکەی ورەو باری تەندروستی ئەوەندە باشبوو هەڵسا چووە دیدەنی کێڵگەو کارخانە، وەسپی نەژادی گا رەسەنەکانی ئەوێی کرد، کەمێك هەنگوینی خوارد و هەموو ئامادەبووانی ئەوێی لە زانیاری و ئاگاداریەکانی خۆی لەمەڕ بەڕێوەبردنی کێڵگەیەکەوە حەپەساند. ژەنەراڵ مۆنتیجا کە لەم گۆڕانکاریە لە پڕەی باری ژەنەراڵ سەری سوڕمابوو داوای لە دکتۆر روران کرد کە بەراستی پێبڵێ، دکتۆر روونیکردەوە کە ئەم چاکبوونەوە تەنیا شتێکی خەیاڵیەو زۆری خەڵك لە سەرمەرگدا دیوە و مەسەلەی مەرگی ژەنەراڵیش تەنیا لەسەر ئان و ساتە. مۆنتیجا بەم قسە بە جۆرێك راچەنی لە تاوا مستێکی بە دیواردا کێشا و دەستی خۆی بریندار کرد. مۆنتیجا ئیدی لەم چرکە ساتەوە بە دواوە ئەو مرۆڤەی جاران نەبوو و تا دوا هەناسەیشی نەهاتەوە سەر حاڵ و باری پێشووی خۆی. تا پێشی ئەمەش هەمیشە لەبەرهۆی سیاسی لەبەر بەرژەوەندی هەردرۆی بە ژەنەراڵ گوتبوو، بەڵام لەو رۆژەوە پاشترێ لەبەر بەزەیی پێدا هاتنەو درۆی لەگەڵدا دەکرد فرمانیشیدا بوو کە هەر کەسێکی بە جۆرێك پەیوەندی بە ژەنەراڵەوە هەبوو، ئەوا هەر ئەوها بکا.

لە هەمان حەفتەدا هەشت ئەفسەری پلە بەرز کە بەهۆی چالاکی دژی دەوڵەت لە ڤەنزویلاوە دەرنرابوون، گەیشتنە ئەوێ. لە نێوان ئەواندا کەسانێکی ناسراوی وەك نیکۆلاس سیلبا، ترینیداد پرتو کاررۆ، خولیان ئینفانتە هەبوون کە بەسەرکردەکانی جەنگی ئازادی دەژمێردران، مۆنتیجا تکای لێکردن کە تەنیا دەنگو باسی ناخۆشی لەو بشارنەوەو لە گێڕانەوەو باسکردنی هەواڵی خۆشیش زیادی بەسەرەوە نێن. ئەوان زۆر بەباشی دەروەستی

ئەمکارەهاتن و هەواڵ و دەنگ و باسی ئەوەندە دڵخۆشکەر لەمەڕ باریووڵاتەوە بۆ ژەنەراڵ بگێڕنەوە کە توانیان ترووسکایی و رووناکایی سەردەمی رابردوو لەبەرچاوەکانی ژەنەراڵدا بگەشێننەوە، ژەنەراڵ کە باس و خواسی ڤەنزویلاو رێوئاچای لە هەفتەیەك لەمەوپێشەوە باس نەکردبوو، دووبارە هێنایەوە نێوان و وتی:

"بۆ تێهەڵچنینەوەمان قەت هەلێکی لەوە باشترمان چنگ نەکەوتووە."سەرەنجام ئەوها کۆتایی بە باوەڕ و بۆ چوونە پتەوەکانی هێنا: "ئەو رۆژەی کە من دووبارە پێ لە دەربەندی ئاراگوا بنێمەوە، سەرپاکی میللەتی ڤەنزویلا بۆ پارێزگاریکرنم رادەپەڕن."

پاشنیوەڕۆیەك بە ئامادەبوون و یارمەتی ئەو ئەفسەرانەی کە هاتبوونە سەردانی، پلانی نەخشەیەکی نوێی داڕژت، سەرانسەری ئەو شەوە ئەفسەرەکانی ناچاربوون کە گوێ بۆ قسەکانی ژەنەراڵ لەمەڕ دروستکردنەوەی ئیمپراتۆریەتی مەزنی خەونەکانی رادێرن. هەر هەموویان لەو بیرەدابوون کە گوێیان لە شتێك راگرتووە تەنیا مۆنتیجا غیرەتی دا بەرخۆی تا ئەو بۆچوونەی ئەوان بخاتە ژێر پرسیارەوە.

مۆنتیجا پێی گوتن: "لە بیرتابنێ کە لە کاساکو ئیماش هەموو هەر ئەوهایان بیردەکردەوە."هیچ کەسێك رۆژی چوارشەممەی مایسی ساڵی ١٨١٧ی لەبیر نەکردبوو، رۆژێکی کەوا ژەنەراڵ لەگەڵ کەمێك لە ئەفسەرەکانیدا ناچاربوون شەو لە دەریاچەی کاساکو ئیما بگوزەرێنن، بۆ ئەوەی لە چنگی سوپای ئیسپانیا، کە نزیك بوو لە ساکە گۆڕێك غافلگیریان بکەنەوە، لە ئاماندا بن.

ژەنەراڵ نیوە ڕووتبوو لەتاو گەرمی تایەکەی هەڵدەلەرزی و هەر بەم حاڵ و بارەیەوە لە پڕێکدا بەدەم هاوارەوە، هەنگاو بە هەنگاوی ئەو کارانەی کە بڕیاربوو لە ئایندەدا بیانکا، راگەیاند، داگیرکردنی یەکسەرو یەکڕاستی ئەنگوستورا، بڕینی چیاکانی ئاند بۆ ئازادکردنی نوئباگرانادا و ڤەنزویلا بەسەر رێگاوە دامەزراندنەوەی کۆلۆمبیا و لە کۆتاییدا داگیرکردنی سەر زەمین و خاکی بەرگوشادی باشوور تاپیرۆ، لە کۆتاییدا وتی: دوایی لە چیای چیم یورازۆ[1] دا سەردەکەوین و لە تۆقەڵەی سەری لووتکە بەبەفردا پۆشراوەکانی ئەم ئاڵا سێ ڕەنگەی ئەمریکای گەورەو سەربەخۆ دەچەقێنین."لەو کاتەدا هاوڕێکانی وایاندەزانی کە بیرو هۆشی لە دەستداوە، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا هەر هەموو پێشبینیەکانی لە ماوەی کەمتر لە پێنج ساڵ بەراست دەرچو.

---

١ چیم یان شیمیورازۆ: قوللەیەك کە بەرزاییەکەی ٦٢٦٧ مەترە لە ئەکوادۆر.

بەڵام مەخابن پێشتگۆییەکانی سان پیدرۆ ئەلخاندرنیۆی لە خەونی رووت بەو لاوە شتێکی دیکە نەبوو. بەدەرکەوتنی چەند بارێکی کە لە ژەنەراڵدا هەفتەیەك وەدواکەوتبوو. لە پڕ بەشێوەی لێشاوی لافاوێکی وێرانکەر پەیدابوو ژەنەراڵ هێندە بچووك ببۆوە، هەر هێندەی چەنگێکی لێهاتبوو کە ناچاربوون سەردەستی کراسەکەی جارێکی دیکەش هەڵکەنەوەو پانتۆڵە مەخمەریەکەی چەند سانتیمەترێك کورتکەنەوە، سەر لە ئێوارە شەویش نەیدەتوانی دەوروبەری سێ سعاتێك زیاتر بنوێ و هەر هەموو وەختەکەی دیکە هەر لە بەرخۆیەوە قسەی دەکردو دەکۆخی و سیخە سیخی لە سنگەوە دەهات، ئەو سیخە سیخەی لە سانتامارياوە دەستپێکردبوو و دەم لە دەمێ لێ ی توندتر دەبوو. پاشنیوەڕۆکان، کاتێك کە ئەوانیدیکە دەنووستن، ژەنەراڵ بەسەیرکردنی دوندە بە بەفر داپۆشراوەکانی کە لە پەنجەرەوە دیاربوون دەردو ژانی خۆی ئارامدەکردەوە، چوار جاران لە ئۆقیانووسی ئەتلەسی پەڕیبۆوە و تەواوی خاکە ئازادکراوەکانی بەر لە هەموو کەسێك. بە سواری ئەسپەوە تەیکردبوو، بەڵام هەرگیز وەسیەتنامەی نەنووسیبوو، ژەنەراڵ دەیگوت: "هیچم نییە لە دوای خۆم بۆ کەسێکی بەجێهێڵم."ژەنەراڵ پیدرۆ ئەلکانتارا هەران، لە سانتافە کاتێك کە نیازی سەفەری هەبوو، بۆ ژەنەراڵی پێشنیازکرد کە وەسیەتنامەیەك بنووسێ، بەڵام ئەو زۆر بەڕاستی بە هەرانی وتبوو کە هێشتا سەروەختی مردنی دانەهاتوەو کاری زۆر پێویستی هەیە کە دەبێ جارێ ئەوان ئەنجام بدا. لەگەڵ ئەمانەشدا لە سان پیدرۆ ئەلخاندرنیۆ، خۆی یەکەم کەس بوو پێشنیاری نووسینی دوا ئارەزوو قسەکانی خۆیکرد. هەرگیز سەرەداوێك لەوە پەیدانەبوو کە ئایا ئەم پێشنیازانە بە ئاگایی و سەرحاڵیەوە بوو، یا تەنیا ئاورێنگێك بوو کە لە دڵی کارەساتبارو پڕ لە خەمیەوە هەڵدەستا.

لەبەرئەوەی فرناندۆ نەخۆشبوو قسەکانی بە خۆزەلارنسیو سیلبا دەخستە سەر کاغەز قسەهایەکی کە لە سەرەتا زۆر بێسەرو بەرو پتر لە بارەی نائومێدیەکانی و شکستەکانیەوە بوو، ناتوانرێ فەرمانڕەوایی ئەمریکا بکرێ، هەر کەسێکی شۆڕشکبا بۆ ناو دەریای تورِ هەڵدەدەن، ئەم وولاتە سەرئەنجام دەکەوێتە دەستی خەڵکێکی نەژادو رەنگ جیاجیاوە، هەزارویەك بیرکردنەوەی خەم ئەنگێز و نائومێدکەری دیکەی کە زۆر جاران لە ناماکانیدا بۆ دۆستە جیاجیاکانی نووسیبووی.

چەند سعاتێك بەبێ هیچ پشوودانێك تەنانەت بەدەم کۆخە کۆخەکەیشیەوە بەردەوام هزرەکانی دەنووسیەوە. خۆزەلارنسیۆ سیلبا نەیتوانی پێبەپێی ژەنەراڵ بڕواتە پێشێ و ئەندرس ئیباراش دوای ماوەیەك لە نووسینی بەدەستی چەپ ماندوبوو، کاتێك کە هەر هەموو نووسەرو یاریدەرەکانی ماندووبوون، تەنیا گروبانێکی سوارەی نیزامی کە ناوی نیکۆلاس ماریانودپازبوو

ماندوونەبوو کە تا ئەو کاتە هەرچیەکی ژەنەراڵ دەیفەرموو. بە خەتی خۆی دەینووسیەوە، کاغەزی تەواوبوو داوای کاغەزی زێتری دەکرد، بەڵام هاتنی کاغەز هێندەی درێژدەکێشا کە ناچاربوو لەسەر دیوارەکاندا بنووسیّ، ژەنەراڵ زۆری ریزلێناو دوو دەمانچەی حەفت تیری کە لە موبارەزەیەکی عاشقیدا بەکارهێنرابوون و دیاری ژەنەراڵ لوزنزو کارکامۆ بوو،بەدیاری دا ئەو.

دوا وەسیەتی ژەنەراڵ ئەمەبوو کە تەرمەکەی ببەنەوە ڤەنزویلا و ئەو کتێبانەی کە پەیوەندیان بە ناپلیۆنەوە بوو، بە دیاری دانیە زانکۆی کاراکاس، هەروەها هەشت هەزار پزو لە بری خزمەتی بەردەوامی بە خۆزەپالاسیۆس بدەن، ئەو کتێبانەی کە لە کارتاخنا بە ئامانەت لە کن پاپاخئوی داناوە بسوتێنن، مەدالیایەکی کە ئەنجوومەنی بولیڤیا بۆ ریزلێنان پێیان داوە، بۆ جێگاکەی خۆی بگەڕێننەوە شمشێرە زەڕینەکەی کە بەبەردی بە قیمەت رازێنرابۆوە و دەریاسالار سوکرە پێشکێشی کردبوو، بدنەوە بە بێوەژنەکەی سوکرەو هەرشتێکی کە لە سامانەکەی دەمێنێتەوە بە کانزاکانی ئارو ئاوە لەنێوان دوو خوشکەزاو برازاکانیدا بەشکرێن. لەمە زێتر شتێکی دیکە نەبوو، لەبەرئەوە دەبوایە لە پاشماوەی هەمان ماڵ و سامان چەند قەرزێکی گەورەو بچوك لەوانەش بیست هەزار پزوی پرۆفیسۆر لانکاسترای لێبدەنەوە.

لەنێوان ئەم هەموو حسابانەدا رێزێکی گەورەو تایبەتی لە سێرڕابەرت ویلسۆن ، هەروەها کوڕەکەی نرا، بۆ ئەم کارە جێگای سەرسوڕمان نەبوو، بەڵام ژەنەراڵ ئالری کە بەفرمانی ژەنەراڵ خۆی بۆ کۆمەکی ئۆردانتا لە کارتاخناد مابۆوە و نەیتوانی شایەدحاڵی مەرگی ژەنەراڵ بیّ سوپاسێك نەکراو ئەمە زۆر جێگای واقوڕمانبوو. ناوی ئەوانە هەردووکیان بەناوی ژەنەراڵەوە نووسا، لە دواتریّ ویلسۆن بووە بەرپرسی ژووری بازرگانی بەریتانیا لە لیماو کاراکاس و هەمیشە لە رێزی بەرایی مەسەلە سیاسی و سەربازیەکانی ئەم دوو وولاتەدابوو، ئالری یەکەمجار لە کینگستۆن دادەنیشت و دوای سەردەمێکی دوورو درێژ بوو بە کونسوڵی وولاتەکەی لە سانتافە و لە تەمەنی پەنجاو یەك ساڵیدا هەر لەویّ مرد. لەم ماوەدا سی و چوار بەرگی لە بارەی ژیانی خۆی لەگەڵ ژەنەراڵەوە نووسی، ژیانێکی ئارام و پڕ لە ئەرك ژیا کە لە رستەیەکدا کورتی کردبۆوە "کاتێك ئازادیخواز مرد و تەواو خەباتەکەی بەرباچوو، من لە جامایکا دانیشتم و بە نووسینی یادەوەریەکانمەوە خەریك بووم. لەو رۆژەوە کە ژەنەراڵ وەسیەتەکەی خۆی نووسی. دکتۆر هەموو کردەو کۆشی خۆی خستنەکار، هەویرو دەرمانی لە قاچەکان نا، بڕبڕەی پشتی چەوردەکردو دەیشێلاو سەراپای لەشی بەرۆنێك چەوردەکرد کە بۆ هێمنکردنەوەی باشبوو. کەم ئیشتیایی و دڵگیرانەکەی بە دەرمانی ڕەوانی زۆر بەهێز بۆ ماوەیەکی کاتی

چارەکرد، هەروەك دکتۆر هەوڵیدەدا ژانەسەرو تایەکیشی دەرمانکا، بۆ ئەم دەرمانە جۆرە مێشوولەیەك کە ناوی کانتاریدا بوو بەکاردەهێنرا، کاتێك کە نەرمیان دەکردەوە لەسەر پێستیاندا دەنا پفکەیەکی وایاندەکرد کە دەیتوانی هەموو جۆرە دەرمانێك بۆ خۆی راکێشێ، دکتۆر روران پێنج پفکەی لەسەر لامل و یەکێکیش بەسەر ماهیچەی پێی ژەنەرالەوە دروستکرد. ئەم دەرمانە بووە هۆی چۆڕە میزکەو زیاد میزکردنی ژەنەراڵ، لە کۆتاییدا بووە هۆی دەردەداری میزڵدان و خوێن دانیشتن.

بەمجۆرە کە دکتۆر روران لە کاتی توێکاریدا پەی پێبردبوو، ئەمانە ببوونە هۆی ئەوەی کە میزڵدانی بە تەواوی وشکبێتەوە بەدیواری حەوزیەوە بچەسپێ، سەدەونیوێك دوای ئەوە زۆری لە پزیشکان هاتنەسەر ئەو ڕایەی کە هۆی سەرەکی مەرگی ژەنەراڵ لە دەرمانکردنی بەم مێشوولە بووە، ژەنەراڵ لە بۆنکردندا زۆر هەستدار ببوو، بەجۆرێکی ئەوتۆ کە دکتۆر و دەرمانسازەکەی (ئاگوستۆ توماسین) ی ناچاردەکرد بۆ رزگاربوون لەدەست بۆنی دەرمان لەو دوور بوەستێ. لەو کاتانەدا زیاتر لە هەر کاتێکی دیکە هەوای ژوورەکەی بە بۆنی قۆڵۆنیا بۆندار دەکرد، بە دەستی خۆی خۆی رێکدەخست، ریشی خۆی دەتاشی و هەموو ئەو کارانەی بە توانایەکی ناسروشتی و بۆ رووبەروو وەستانەوەی مەرگ دەکرد، لە هەفتەی دووەمی کانوونی یەکەم سەرهەنگ لویس پرۆ دلاکرویکس لە سانتاماریا پەرپەوە. ئەو پێشتر لە سوپای ناپلیۆنو ماوەیەکیش یاریدەدەری ژەنەراڵ بوو، دوای پەیوەندیکردن بە ژەنەراڵەوە یەکسەر نامەیەکی بۆمنوئلا نووسی و ئەوی لە باری خراپ و ناخۆشی ژەنەراڵ ئاگادارکردەوە. هەر لەگەڵ منوئلا نامەکەی پێگەیشت بەرەو سانتاماریا جولا، بەڵام لە گوادواس زانی کە ژەنەراڵ ئەمری خوای بەجێگەیاندوە، ئەم هەواڵە ئەوی لەسەر شانۆی ژیان هەڵدادەرێ. بە مەرگی رۆژانەو کارەکانی خۆیەوە خەریك بوو، تەنیا شتێکی کە بۆی ماوە، دوو سەندوق بەڵگەنامەی ژەنەراڵ بوو کە توانی لە شوێنێکی ئەمین لە سانتافە حەشارییدا، دوای چەند ساڵان ژەنەراڵ دانێل ئۆلری بە فرمانی مانوێلا ئەم بەڵگەنامانەی دەرهێنا، لەسەردەمی ژەنەراڵ سانتاندر مانو ێلا سەرەتا بە جامایکاو دوایی بۆ بەندەرێکی دوورولاچەپی ئۆقیانووسی ئارام کە ناوی پائیتابوو، دوورخراوە، لەوێ ڕاکە ڕاکەی بوو بەدوای ژیانداو تا ئەو شوێنەی کە مۆڵەتی پێدەدرا، حەڵواوشیرینی لەسەر شێوەی ئاژەڵ و گیانداران دروست دەکردو دەیفرۆشت. دکتۆر تورنی هاوسەریان لە کێڵگە بە چەقۆ کوشت تا ئەو برە پارەی کە پێی ببوو، لێی زەفت بکەن، لە وەسیەتی خۆی داوایکردبوو ئەو برە پارەی کەمانوێلا بۆ زەماوەندەکەیان خەرجی کردبوو، بدەنەوە، بەڵام ئێستا و ئێستاش ئەم پارە بە مانوێلا نەگەیشت. لەسەردەمی تەنیاییدا سێ کەس چوونە سەردانی منوئلا و ئەم سەردانانە مانوێلایان هانداو پشت

ئەستوریان کرد. کەسی یەکەم، مامۆستا سیمۆن رودریگز بوو کە لەگەڵ مانوێلا لەبارەی یادو یادەوەریە بەشکۆکانی ژەنەراڵ زۆریان قسەکرد و یادی رابردوویان کردەوەو زۆرشتیان وەبیر خۆیان هێناوە، ئەویدی ئازادیخوازی ئیتاڵی ژۆزێف گاریبالدی بوو لە جەنگی دژ بە ئەرژەنتین دەگەڕاوە و سێیەمین کەس، نووسەری ناسراو هیرمان ملۆیل بوو کەوا بۆ دەستکەوتنی زانیاری و بەڵگەی پەیوەندار بە مۆبی دیک[1] بەناو دەریاو ئۆقیانووسەکاندا گەشتی دەکرد. منوئلا لە کۆتایی ژیانیدا بەهۆی شکستی کەمەری عەمەل مەندەببوو، ئەو لەناو جۆلانەدا دەنووست و فالی بۆ خەڵکی دەگرتەوەو عاشقانی گەنج و لاوی رێنومایی دەکرد و ئامۆژگاری دەکردن، لە تەمەنی پەنجاو نۆ ساڵیدا لە ئەنجامی بڵاوەبوونی نەخۆشیەکی درم سەری نایەوەو دارەمەیتەکەی کە کاغەزەکانی ژەنەراڵیشی لەناودابوو، لەلایەن فەرمانبەرانی تەندروستیەوە ئاگری تێبەردرا، لەنێوان ئەو نامانەدا گەلێك نامەی بەنرخی تێدابوو کە ژەنەراڵ بۆ مانوێلای نووسیبوون، بەپێی ئەو قسانەی بە پرودلاکرویکسی وتبوو، تەنیا سەرو سامانێکی کە لە ژەنەراڵ بۆی بەجێمابوو، تۆپەلێك موی قژی ئەو و یەك لینگەدەستەوانە بوو، ئەو پارەی کە پرو دلاکرویکس لە ماڵی سان پیدرۆ ئەلخاندرنیۆ دیتی، نیشانەی بێسەروبەریەکی تەواوبوو، هەموو شتێك پێکداپرژابوون. هەر کاتێکی ئەفسەران خەویان دەهات، لێی دەنووستن و هێندە دڵناسك و هەستدار ببوون کە ئارامترینیان کە خۆزەلارنسیۆ سیلبا بوو، جارێکیان کە دکتۆر روران داوای بێدەنگ بوونی لێکردبوو، شمشێری لە روویدا هەڵکێشا. فرناندا باریگا چیدی نەیدەتوانی وەڵامی تکا سەروەخت و بێوەختەکانی ئەفسەران بۆ نانخواردن بداتەوە هەندێکیشیان لەبەرئەوەی هێندە بێ هیوابوون، شەو و رۆژ سەریان لەسەر یاری هەڵنەدەگرت و هیچ تێبینی ئەوەیان نەدەکرد کەی بەبەرگوێی ئەو نەخۆشەی لەسەرەمەرگدایە دەکەوێ و کەلە ژوورەکەی تەنیشتیانەوە کەوتبوو رۆژێك دوای نیوەڕۆ، کاتێك ژەنەراڵ لە تاو گەرمی (تا) وەبگرە بێهۆش بوو، کەسێك لە هەیوانەکەوە بەدەنگێکی بەرز لەوەی کە تەنیا دوازدە پزو و بیستو سێ سەنتی بۆ فرۆشتنی نیو دەرزن تەختە و دوو سەد و بیست و پێنج بزمار، شەش سەد بزماری سەر پانی ئاسایی و پەنجا مێخی رەنگ زێرین و دە نەواری کەتانی و دە داوی ئاوریشمی و شەش نەواری قوماشی داهاتە سکاڵایدەکرد ئەم هاوارە سکاڵاکانی دیکەی کپ کردەوەو سەرانسەری ماڵەکەی داگرتەوە.

دکتۆر روران لە ژووری نووستن باندپێچی دەستە شکاوەکەی ژەنەراڵی مۆنتیجای دەگۆڕی و هەردووکیان بۆیان دەرکەوت کە ژەنەراڵ بەو بارە ترسناکەیەوە گوێ بۆ ئەو دەنگە دەنگە

---

١ مۆبی دیك: یان نەهەنگی سپی ناوی کتێبێکە هێرمان ملۆیل نووسیەتی

ڕادەیرێ و ئاگای لەو سکالاّو حساب و کتابەیە. مۆنتیجا سەری لە پەنجەرە بردەدەرەوە و بەدەنگێکی بەرز نەڕاندی: "هەی سەگێ لە بابێ سەگ، بێدەنگبە."

ژەنەراڵ بێ ئەوەی پێڵووەکانی هەڵبڕێ هاتە ناوەوەو ووتی: "وازی لێبێنن، هەر حساب و کیتابێك بێ، دەتوانم گوێی بۆ ڕاگرم."

تەنیا خۆزەپالاسیۆس دەیزانی کە ژەنەراڵ تێگەیشتووە ئەم هەموو دادو هاوارە بۆ دووسەدو پەنجا و سێ پزو [1]، حەوت ریال [2] و سی کوارتیجا [3] یە کە شارەوانی بۆ ڕێوڕەسمی بەرێکردنی تەرمی ژەنەراڵ کۆیکردبۆوە و خشتەی مێخ و قوماش شتێك نەبوو جگە لە پێداویستی کفن و دفنی کە بۆ ناشتنی ژەنەراڵ پێویست بوو، بە فرمانی مۆنتیجا خۆزەپالاسیۆس راسپێردرا کە نەهێڵێ. با پلەو پایەی هەرچی بێ، بێتە ژوورەوە ئەو خۆی هێندەی چارەسەری و سەرپەرشتی نەخۆشەکە کردبوو، زۆران گومانیانکرد کە ژەنەراڵ تەواوبووبێ.

مۆنتیجا وتی: "ئەگەر لە سەرەتاوە دەسەلاّتێکی وایان بە من دەسپارد، ئەم پیاوە تا سەد ساڵی دیکەش دەژیا."

فرناندا باریگا دەیویست بچێتە ژوورێ. گوتی: "ئەوەندەی ئەو مردو مراوە حەز لە ژنان دەکا، ناتوانێ بەبێ ئەوەی ژنێکی لە پشت سەربێ، گیانبدا ئەوە هەر چەندە ژنەکە وەك من پیرو ناشیرین و لە کەڵك کەوتوشبێ."

بەلاّم ڕێگای چوونە ژوورەوەیان نەدایە. لە کەنار پەنجەرە دانیشت تا دوعا بۆ ژەنەراڵ بکا. دوای ئەوەش هەر لە هەمان ماڵدا تا دوایی تەمەنی بە پرسەداری ماوەو تا لە تەمەنی سەدو یەك ساڵیدا ماڵئاوایی کرد.

کاتێك کە کەشیشێك لە دێیەکی نزیکیانەوە کە ناوی ماما تۆکۆ بوو و شەوی چوارشەممە هاتە ئەوێ، ئەوە فرناندا بوو کە ڕێگاکەی بۆ کەشیش و هاوڕێکانی گوڵبارانکرد. لە پێشی کەشیشەوە دەستەیەك لە کچانی ناوچەکە دەهاتن و کراسی فش و فۆڕی کە تانیان لەبەردابوو، ئەوان لالە بەدەست بوون و جادەیان ڕووناك دەکردەوەو بە زمانی خۆیان ئەو شیعرانەیان دەخوێندەوە کە بۆ

---

١ جۆری پارەن یان بەشێکی پارەن.

٢ جۆری پارەن یان بەشێکی پارەن

٣ جۆری پارەن یان بەشێکی پارەن

ڕێوڕەسمی ناشتنی مردوو دەگونجا، فرناندا سەرانسەری ڕێگاکەی گوڵباران کرد، ساتێکی ئەوەندە خەماوی بوو کە هیچ کەسێك نەیدەوێرا دەستیان پێ لەو کارە هەڵگرێ.

کاتێك کە ژەنەراڵ هەستی کرد دێنە ژووری، هەڵساو لەسەر تەختەکەی دانیشت ئەو کاتە بازووەکانی بەبەرچاوەکانیەوە گرت تا ڕووناکی فانۆسەکان ئازاری نەدەن، لە دوایی فرمانیدا بچنە دەرەوە و هاواری کرد: "ئەم چرایانە لێرە ببەنە دەرەوە دەڵێی شەبەنگە."

فرناندۆ نەیدەویست کە باری بێسەروبەری ماڵ و خەڵکەکەی ژەنەراڵ لەپەل و پۆبخا. لەبەرئەمە لە ماماتوکو پارەی بە دەستەی گۆرانیبێژاندا، تا ڕۆژێکی تەواو لە ژێر درەختەکانی حەوشەی ماڵێ، هەر گۆرانی بلێین و مۆسیقابژەنن. ژەنەراڵ لەو ئارامیەی کە لەو مۆسیقایە دیتبووی و هەست پێ کردبوو، ئەوەندە شادمان بوو کە فرمانیدا لاترینتاریا چەند جارێك دووبارە بکەنەوە، ئەم ئاوازەی بە دڵ بوو و لەسەرتانسەری وڵاتیش ناوبانگی هەبوو، لەبەرئەوە ژەنەراڵ بۆ هەر جێگایەك دەچوو، خۆی چەند دانەیەکی لەم شیعرە بڵاودەکردەوە.

کچۆلەکان چراو لالەکانیان لەسەر زەوی دانا و تا دەمێکی دوورودرێژ لەنێوان پەنجەرەکەوە تەماشای ژەنەراڵیان کرد، چەرچەفێکی سپی لە خۆی وەرپێچابوو، لەوە لاوازتر و ڕەنگ پەڕیوتر بوو کە دوای مەرگی دەدیترا،گەندەمووی و بەسەریەوە دەدیترا، دوای هەر بڕگەیەکی دەژەنرا، هانیدەدان و چەپڵەی بۆ لێدەدان.

سەر لە نیوەڕۆ، شادمان و سەرحاڵ بەو مۆسیقایە. فنجانێك سوپ و کەمێك گۆشتی مریشکی خوارد، دوایی داوای ئاوێنەیەکی کرد تا خۆی تێدا تەماشابکاو وتی: "بەم چاوانە هێشتاش نامرم."ئومێدە تازەکەی کە گوایە دکتۆر روران بتوانێ موعجیزەیەك بنوێنێ، دووبارە لەناو دڵی هەمووواندا زیندوو بۆوە، بەڵام ژەنەراڵ ڕێك کاتێك کە هەموو ئومێدەواربوون، ژەنەراڵ سارادیان لەگەل ئەفسەری ئیسپانیایی کەسانتاندر ڕۆژێك دوای شەڕی بوجاکا بەبێ دادگایی کردن عیدامکردبوون، بە هەڵەزانی لەوە بە دواوە حاڵی زۆر خراپ تێکچوو ئیدی لێی ڕاستنەبۆوە و بەوکەمە هێزەی کە لەبەریدابوو، فرمانیدا کە گۆرانیبێژ و مۆسیقا ژەنەکان ئەوەندە لێرە دوورخەنەوە و تا دەنگیان باری ئارامی ئەو نەزرێنێ، کاتێك تووڕەییەکەی نیشتنەوە، فرمانی بە ویلسۆن دا تا نامەیەك بۆ بریسنیۆ مندز بنووسێ و داوای لێبکا کە لە پێناو ڕزگارکردنی وڵات لەو بێسەرو بەری و ترسەی تێیدایە هاوکاری لەگەڵ ئۆردانتا بکا.

تەنیا لەسەرەتای نامەکە خۆی دێڕێکی بۆ ولسۆن نووسی: "لە دوا هەناسەکانی ژیانمدا ئەم نامەیەتان بۆ دەنووسم؟"

ئەو شەوە تا درەنگانێك لەگەڵ فرناندۆ قسەی دەکرد بۆ یەکەم جاری بوو کە لە بارەی ئایندەوە ئامۆژگاری و ڕێنومایی دەکرد. هێشتاش بیری نووسینەوەی یادەوەریەکانی لەسەردابوو فرناندۆ نەك هەر تەنیا بە یادەوەریەکانی ژەنەراڵ بەڵکە لەبەرخاتری منداڵەکانیشی تا بتوانن ئەو هەورازو نشێویانەی شکۆ و هێزو دەسەڵات هەستپێبکەن، لەگەڵ ئەوەدابوو کە ئەم یادەوەریانە بنووسێتەوە.

ژەنەراڵ گوتی: "هەروەها ئالریش ئەگەر بەراستی بیەوێ، دەتوانێ شتهایەك بنووسێ، بەڵام یادەوەریەکانی تۆ جیاوازیان هەیە."فرناندۆ لەو کاتانەدا بیست و سێ ساڵی بوو و هەشتاو هەشت ساڵ ژیا، بەڵام جگە لە چەند لاپەڕەیەك کە هیچ پەیوەندیان پێکەوە نەبوو، شتێکی دیکەی نەنووسی، لەبەر ئەوە چارەنووسی بیرەوەرمێشکی لێوەرگرتەوە.

خۆزەپالاسیۆس لە کاتی نووسینەوەی وەسیەتنامەکە لە ژووری نووستندا بوو، بەڵام ڕێو ڕەسمەکە ئەوەندە پیرۆز دەهاتە بەرچاو کە هیچ کەسێك نەیوێرا کارێکی وابکا، بەم حاڵەشەوە ئەو شەوە وەختێ کە ژەنەراڵ حەمامی دەکرد، داوی لێکرد وەسیەتنامەکەی بگۆڕێ.

خۆزەپالاسیۆس گوتی: "هەمیشە هەر هەژاربووین، بەڵام قەت لە هیچ شتێکمان کەم نەبووە."

ژەنەراڵ وتی: "بە تەواوی پێچەوانەی ئەم قسە راستە، هەمیشە دەوڵەمەندبووین ، بەڵام هیچ شتێکی زیادمان نەبوو."

هەردوو بۆچوون راستبوو خۆزەپالاسیۆس بەلاوی لەسەر داوای دایکی ژەنەراڵ، هاتبووە خزمەتی. لە دەوروبەرێکی ناسەربازی خەریکی کارەکانی بوو هیچ کاتێك مووچەیەکی بۆ نەبڕاوە هیچ پلەو پایەکیشی بۆ دیارنەکر، پێداویستیەکانی خۆی بەشێك بوو لە پێداویستیە تایبەتیەکانی ژەنەراڵ، هەتا لە جلو بەرگ پۆشیندا، نانخواردن و بیرکردنەوەیشی لە هی ژەنەراڵ دەچوو، ژەنەراڵ بە هیچ جۆرێك ئامادە نەبوو کە خۆزەپالاسیۆس بەبێ هیچ پلەیەکی سەربازی و مووچەیەکی خانەنشینی بەڕەلابکا، بەتایبەتی لەو تەمەنەیدا کە ئیدی نەیدەتوانی ژیانێکی سەر لە نوێ دەستپێبکاتەوە. ئێستا کە ڕێگا چارەیەکی دیکەی لەبەردا نامێنێتەوە هەشت هەزار پەزوەکەی کە لە وەسیەتنامەکەدا هاتبوو دەبووایە هەر بیدرێنێ بڕیارێك بوو لێ پاشگەزبوونەوەی نەبوو.

ژەنەراڵ دوای ئەوە گوتی: "بەمجۆرە زۆر دادپەروەرانەترە."خۆزەپالاسیۆس وەڵامیداوە: "لە هەموو شتێك دادپەروەرانەتر ئەوەیە کە هەموومان پێکەوە بمرین."

هەر ئەوهاش دەرچوو، لەبەرئەوەی هەروەك ژەنەراڵ پارەکانی بەخێرایی و بەبێ هودە خەرج کرد، دوای مردنی ژەنەراڵ ئینیدیاس لە کارتاخناد ماوەو بۆ فەرامۆشی هاتن و دنیا لەبیرکردن پەنای بۆ مەی و خۆشگوزەرانی برد. ئەو لە تەمەنی حەفتاو شەش ساڵیدا لەبەر زێدەڕۆیی لە خواردنەوەو بەد مەستی لەیەکێك لە بنکە تایبەتیەکانی خەڵکانێکی خانەنشینکراو و بێکاری سوپای ئازادیخواز گیانی سپارد. بەپەلە قەشە ئەستوزیان بانگکرد، قەشە دەم دەست لەوێ ئامادەبوو، ئەو بایەخێکی تایبەتی بەو سەردانەدا و بەرگی تایبەتیشی پۆشیبوو. دیدەنیەکەیان، لەسەر خواستی ژەنەراڵ، بەتەنیایی و بەبێ هیچ شایەدێك بەڕێوەچوو و تەنیا چوارده دەقەیشی کێشا. هەرگیزاو هەرگیز تەنانەت وشەیەکیش لەبارەی ئەم چاوپێکەوتنەوە نەبیسترا، قەشە بەپەلە و نارحەتیەکی زۆرەوە لە ماڵ چووە دەرێ، سواری گالیسکەکەی بۆوە و بەبێ ماڵئاواییکردن ئەویی بەجێهێشت، لەگەڵ ئەوەی کە چەند جاران داوایان لێکرد، نەرێ ورەسمی تەرمەکەی رێبەریکرد، نە هەتا لە رێورەسمی ناشتنەکەشی بەشداریکرد. دوای رۆیشتنی قەشە حاڵی ژەنەراڵ ئەوەندە تێکچوو ، کە نەیدەتوانی لەناو نوێنەکەی قیت بێتەوە و دکتۆر وەك کۆرپەیەکی تازە لە دایك بوو بڵندی دەکرد و لەسەر تەختی دادەناو بۆ ئەوەی لەبەر کۆخە کۆخ نەخنکێ، بە چەند پشتیەك[1] پاڵی دەخست، کاتێك کە نەختێ هاتەوە سەرەخۆ، فرمانیدا ئەوەی لە ژوورەکەیە بچێتە دەرێ تا بتوانێ بەتەنیا و بەتایبەتی لەگەڵ دکتۆر قسەبکا.

ژەنەراڵ گوتی: "منێکی کە باوەڕم بە جیهانێکی دیکە نییە، هەرگیز لەو باوەڕە نەبووم حاڵم ئەوەندە خراپ ببێ کە ناچارېم لەگەڵ قەشەیەکدا قسە بکەم."

دکتۆر روران وتی: "لە ڕاستیدا ئەمە بایەخێکی نییە. مەسەلەی گرنگ ئەمەیە کە ویژدانی نەخۆش لەگەڵ بارێکی کە بەسەریدا دێ، کاری دکتۆر ئاسانتر دەکا."

ژەنەراڵ هیچ سەرنجی جوانی ئەو وەڵامدانەوەی نەدا، لەبەرئەوە لە پڕێك زانی کە پێشبڕکێیەك کە لە نێوان راستیەکانی ژیان و خەونەکانیدا هەیە، کۆتاییان پێهاتووە ئاهێکی هەڵکێشا و وتی: "لەعنەتی، چۆن چۆنی لەم سەر لێشێواویە بچمە دەرێ."

---

١ پشتی سەرین: یان هەر شتێکی بخرێتە بەریشت بۆ پاڵدانەوەو ئیسراحەتکردن

زۆر بە وردی بە ژوورەکەیدا هەڵڕوانی و بۆ یەکەمجار راستی بۆ دەرکەوت، دوا تەختێکی کە بەقەرز دابوویانیٚ، ئاوێنەیەکی کە چیدی خۆی لەناودا نەدەدیت.پەشتەماڵ و سابوونێکی کە لە دوای ئەو بۆ شۆرینی دەستی دیکە سوودی لێدەدیترا لە دەقە و چرکە ژمێرێکی کە بەپەلە بەرەو دوا کاتی دیدەنی سەردانەکانی لە سعات یەك و حەوت دەقەی دوای نیوەڕۆی رۆژی حەڤدەمی کانوونی یەکەم دەچوو، بۆ دواجار لە پەنجەرەوە پرشنگی ئەستێرەی زوهرە، کە لەبەرچاویدا وندەبوو، بەفرە ئەزەلیەکانی چیاکان و گوڵە لاو لاوەکانی کە دووشەممەی داهاتوو لەو ماڵە پرسەدارەدا دەپشکوتن و ئەو خونچەکانی نەدەدیت و دوا پرتەوەکانی ژیانی تەماشادەکرد.